


# کورد لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ

ئامادەکردنی

محەمەد مەلا مەحمود تاوگۆزی



# کورد
# لە سەردەمی
# پێغەمبەردا ﷺ

ئامادەکردنی
**محەمەد مەلا مەحمود تاوگۆزی**



ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# کورد لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ

ئامادەکردنی: محەمەد مەلا مەحمود تاوگوزی
پێشەکیی و پێداچوونەوە:
عەبدولڕەحمان سدیق
ئازاد عەباس گڵێجاڵیی
ئیکرام کەریم
هەڵەگر: ڕێبەر بەختیار
بەرگ و ناوەڕۆک: ئیبراهیم ساڵح
بڵاوکار: ناوەندی ڕەها
بابەت: مێژوویی
نۆبەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٢٢

ژمارەی سپاردن ١٠٢٦ ی ساڵی ٢٠١٤
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

## پێشکەشە بە:

♣ بە پێشەوای مرۆڤایەتیی حەزرەتی (موحەممەدی نازدار -درووود و سەلامی خودای لەسەربێت).

♣ بە سەرجەم یارانی حەزرەت، بە تایبەت (جابانی کوردیی -خودا لێی ڕازیبێت).

♣ بە دایك و باوکی خۆشەویستم و، هاوسەری بەڕێزم و، هەر سێ جگەرگۆشەکەم (نامی) و (نمە) و (نامە)، خودای گەورە پارێزراو و تەندروستیان بکات.

♣ بە پێشەوایانی پێشینی ئیسلام، کەڵەزانایانی کورد بە تایبەتیی.

♣ بە هەموو ئەو نووسەرانەی بابەتییانە و زانستییانە، وە بە ویژدانەوە ناوی کورد و کوردستانیان لە مێژوودا نەخشاندووە.

♣ بە سەرجەم مسوڵمانانی کوردزمان.

ئەم بەرهەمە پێشکەشە...

# تابلۆی یەکەم

## خستنەڕووی هەستی نیشتیمانپەروەریی و نەتەوەدۆستیی لە لایەن (ئەحمەد موختار بەگی جاف)ـەوە[1]

مـن کـه کوردم حەز بـه خاکی پاکی کوردستان ئەکەم

ئارەزووی دەوری تەرەققـیی حاکمـی بـابـان ئەکەم

ناوەجاخ ئەو کەسەی خزمـەت بـکا بـه غەیری خـۆی

تـا بە مردن شەرتە مـن هەر بەندەیی خۆمـان ئەکەم

میلـلەتی مـن هەروەکو شێری ژیانن بـۆ نەبەرد

ئێستەکە مـن چـۆن ئیتاعەی (دوژمنی غەدار)[2] ئەکەم

گەر لـە غەیری میللەتـی خـۆم بێ و ئـومێدی چاکە کەم

شێت و بـێ عەقڵم لـە شـەیتان ئیددیعای ئیمان ئەکەم

گەر لـە موژگان و بـرۆی دولبەر تەمای لوتفـم ببـێ

مـن لـە نوکـی شـیر و خەنجەر ئارەزووی دەرمان ئەکەم

لابە تخـوا نـامـەوێ دیـجلـە و فـورات و نیلـی تـۆ

مـن بـە فرمێسك ئێستەکە تەشکـیلـی سەد سیروان ئەکەم

جەژنـی قوربان ساڵـی جارێ خەڵکی قـوربانی ئەکەن

بـۆ وەتەن مـن ڕۆژی سـەد جار ڕۆحی خۆم قوربان ئەکەم.

---

١ـ دیوانی ئەحمەد موختار جاف، لێکدانەوە و پێشەکیی: د. عیزەدین مستەفا ڕەسول: ٩٥.

٢ـ وشەی (دوژمنی غەدار) لە دەقەکەدا نییە، بەڵکوو لە بریدا تەنها بۆشاییەك دانراوە، ئێمە لە بری ئەوەی بە بەتاڵیی بیهێڵینەوە ئەم وشەیەمان (دوژمنی غەدار) بە گونجاوزانی، هەندێکیش (دوژمنی شەیتان)یان داناوە.

## تابلۆی دووەم

## خستنەڕووی دۆخ و گوزەرانی کورد بە دەست نەیارانی بێگانە و، ململانێی هێزە ناوخۆییەکانەوە لە لایەن (شێخ مارفی نۆدی[٣])ـییەوە

ولم يبق من روح و صفو و راحة … بأوطان كـــرد أو سرور و بهجة

مرابع لا يحلو بـــها عيش قاطن … و لو أنه يأوي إلـــى رأس قُلَّة

بلاد بـــها قـــرن الشياطين طالع … و كم فتية فيها مُـــساعر فتنة

و كـــم بدع فيها فشت ومحارم … قد انتهكت من أهل بغي و شرطة

و ليس بأرض الله مـــثل بلادنا … فسادا وضيما ، فهـي أفظع بقعة

فيا ليتها أضحت بلاقع، لوم يبت … بهـــا أحد مـــن أهل بدو و بلدة

و قد وجبت عينا علـــى علمائها … و ساداتها أهـــل النهى و الرعية

مهاجرة عـــنـــها، فإن جلاءهم … فرار بدين مـــــن غوائل فتنة

و لـــي برهة أزمعت غير مناكث … رحيلا ولو حبوا بأهلي و حبيبتي[٤].

---

٣- (شێخ مارفی نۆدێیی) لە دۆخی ئاڵۆز و بێ دەرەتانی کوردستانی ئەوکات، بێ هیوا و نائومێد دەبێت! چون ئەوکاتیش کوردستان لەنێوان بەرداشی (عوسمانی) و (ئێرانییەکان)دا قوربانی و داردەست و چەوساوە بووە. هەربۆیە پەیامێکی (٨١) دێڕی دەهۆنێتەوە و، دەینێرێت بۆ (سەلیم پاشای عوسمانی). کە تێیدا داد و بێدادی خۆی لە دەست بڕیار بەدەستە خراپ و خۆسەپێن و خۆپەرستەکانی سلێمانی دەخاتە ڕوو، کە چۆن ستەمیان لێ دەکەن و دەیانچەوسێننەوە.

بێگومان دۆخی کورد لە مێژوودا و بە ئێستاشەوە بەدەست گشت دەسەڵاتدار و زلهێزەکانەوە هەر بەم چەشنەبووە، جا لە هەر ڕەگەز و ئایدیایەك بوبێت.

٤- بڕوانە/ الروضة الفنا في الدعاء بأسماء الحسنى: الشيخ معروف النودهي، تحقيق: أوميد عمر الباومردي: ٢٣.

## تابلۆی سێیەم

## دۆخی کورد لە ڕۆژگاری (مەلای گەورەی کۆیە)دا

((کوردی قوڕ بەسەر، ئیختیلافی دین و مەزهەبی کەمە، لاکین ئیستیلای دووەلی، هەم دین و هەم جیواری پارچە پارچە کردییە، بە نەوعێ قابیلی ئیلتیام نییە. پێشی ئینقیلاب "دوو" لەت بوو، یەکی لەبەردەستی "عوسمانی"، یەکی لەبەردەست "ئێرانی"، بەعدەلحەرب کرایە "چوار" لەت، مەعەلئەسەف سیاسیشیان کەمە[5]. نازانم چ بڵێم! حاڵی کوردان پەرێشانە، بێ حیسسن، دەرکی ئەلەمی زیللەت ناکەن[6]. حەتا من کە تەماشای حاڵی کوردیان دەکەم، ئەوەندەیان بۆ عاجز دەبم، وەختە دڵم تەق کا، ئەما چ سوود؟ ئەوان بە حاڵی خۆیان نازانن، موتەئەللیم نین))[7].

---

٥- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ٥٦٤.

٦- هەمان سەرچاوە: ٣/ ٦٠٣.

٧- هەمان سەرچاوە: ٢/ ٤٠٣.

## پێشەکیی بەڕێز مامۆستا (عەبدولڕەحمان سدیق)

## کورد و ئیسلام

## ناسنامەی نەتەوەیی و ناسنامەی ئایینیی

✍ دیارە لە قورئاندا، هەموو مرۆڤێك بەتاقی تەنها وەك چەقی چەند بازنەیەکە، واتە خۆی وەك تاك داوای لێکراوە کە باوەڕ بە خودای بەدیهێنەری بهێنێت و کردەوەی چاك ئەنجامبدات و بانگەوازی خودایی بە دەوروبەری بگەیەنێت، لە ئەم پێناوەشدا ئارامگر و خۆڕاگربێت، ئەگەرنا بەدەر لە ئەم هەنگاوانە، مرۆڤ هەر مرۆڤێك، خەسارەتمەندی دونیا و قیامەت دەبێت.

ئەمەش کە گوتمان، لێکدانەوەی دەقاودەقی سورەتی (العصر)ە، کە خودای گەورە تیایدا فەرموویەتی: ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾.

لەبەرئەوە مرۆڤی موسڵمان لە ئەم پێناوەدا دەبێت چاو لە ئەو میکانیزمە بکات کە پێغەمبەران (درودی خودایان لەسەربێت) گرتوویانەتەبەر. هەر لە ئەم بوارەشدا دەبینین تەواوی پێغەمبەران، سەرەتا ڕووی دەمی داوایان لە نەتەوە و گەلانی خۆیان کردووە و خێر و خۆشیی بانگەوازە خوداییەکەشیان بۆ نەتەوەی خۆیان بەخەڵات پێشکەشکردووە، لەبەرئەوە لـــە قورئاندا پێغەمبەران (درودی خودایان لەسەربێت) وەك چەقی کاری بانگەواز، یەکەم بازنەی برایەتییان لەگەڵ نەتەوەی خۆیاندا بووە و بە ئەم پێیەش بازنەیەکی برایەتیی نەتەوەییان لەگەڵ بەستووە. لەبەرئەوە خودای گەورە پێغەمبەرانی کردووە بە (برا)ی نەتەوەکەی خۆیان وەك لە ئەم ئایەتانەی قورئاندا دەردەکەوێت:

﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا﴾. الأعراف: ٦٥. هود: ٥٠.

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا﴾. الأعراف: ٨٥. هود: ٨٤.

﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾. الأعراف: ٨٥. هود: ٨٤.

ئەم پەیوەندییە برایەتییە نەتەوایەتییەش لەگەڵ تەواوی نەتەوەکەدا بووە، تەنانەت لەگەڵ ئەوانەشدا کە پێغەمبەران بەدرۆدەخەنەوە خودای گەورە هێشتا پێغەمبەران بە (برا) بۆ ئەوان دادەنێت:

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾. الشعراء: ١٠٥ ـ ١٠٦.

﴿كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾. الشعراء: ١٢٣ ـ ١٢٤.

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾. الشعراء: ١٤١ـ ١٤٢.

هەر لەبەر ئەمەشە خودای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێت) دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾. الزخرف: ٤٣ ـ ٤٤.

کەواتە ئەم کامەرانیی و خێر و خۆشییەی کە دەرئەنجامی پیادەکردنی بەرنامەی ئیسلامە، سەرەتا لە هەر مرۆڤێکی موسڵمانەوە، ڕوودەکاتە ئەو بازنەیەی کە نەتەوەکەی خۆی لە چێوەیدا کۆدەبێتەوە.

پاشان تەواوی نەتەوە و گەلانی موسڵمان لە بازنەیەکی فراوانتردا کە بازنەی (برایەتیی ـ ئیمانی)ـیە کۆدەبنەوە و ئەم بازنەیەش کۆکەرەوەی نەتەوە موسڵمانەکانە و بازنە بچووکەکانی پێشوو کۆدەکاتەوە. بەبێ ئەوەی بیانبڕێت، یان بیانسڕێتەوە. ئەمەشە واتای ئایەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾. الحجرات: ١٠.

لەدواییدا بازنەیەکی فراوانتر تەواوی مرۆڤەکان لە بازنەی (برایەتیی ـ ئینسانیی)دا کۆدەکاتەوە بەدەقی ئایەتی: ﴿الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾.

النساء: ١.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾. الحجرات: ١٣.

هەر لە بازنەی (برایەتی _ ئیمانیی)شەوە، بانگەوازی ئیسلامیی ڕوودەکاتە ئەم بازنە فراوانەی (برایەتیی _ ئینسانیی) هەتا بە هۆی ئیسلامەوە بیانخاتە بازنەی (برایەتیی _ ئیمانی)یەوە: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾. الفرقان: ١.

لەبەرئەوە بە پشتبەستن بەم لێکدانەوەیە دەگەینە ئەم ڕاستییانەی لای خوارەوە:

یەکەم/ مرۆڤ وەك تاك، لە دنیادا سێ بازنەی برایەتیی سەرەکیی دەورەیداوە کە بازنەی (برایەتیی نەتەوایەتیی) و بازنەی (برایەتیی ئیمانیی) و بازنەی (برایەتیی ئینسانیی)ن.

دووەم/ هەوڵ و خەبات و تێکۆشانی مرۆڤ لە گەیاندنی پەیامی ئیسلامدا سەرەتا بۆ بازنەی نزیکی خۆی دەبێت و هەر کاتێکیش بەئامانج گەیشت، ڕوو لە گەلان و نەتەوەکانی تر دەکات. واتە ڕووی خێری لە نەتەوەکەی خۆی دەبێت ئەگەر لێی زیادبوو دەیبەخشێت بە گەلانی موسڵمان، ئەگەر لە ئەوانیش زیادبوو، دەیبەخشێت بە گەلانی بازنەی سێیەم.

سێیەم/ (نەتەوە) و (ئیسلام) دوو چەمکی بەرانبەر بەیەکتر نین هەتا بەراورد لە نێوانیاندا بێتەئاراوە، بەڵکوو پەیوەندییەکی ئۆرگانیی بەهێز بەیەکیانەوەدەبەستێت، لەبەرئەوە پەیوەندیی نێوان (نەتەوە) و (ئیسلام) پەیوەندییەکی (تکاملی)یە نەك (تفاضلی)، هەر لێرەشەوە ئەگەر (نەتەوە) لاشە و جەستە بێت، ئەوا (ئیسلام) بریتییە لە ڕۆح وگیان.

چوارەم/ لێرەوە دەبێت لە خەمی دەستەبەرکردنی مافەڕەواکانی نەتەوەکەماندا بین بە بەرنامەی ئیسلام و پاشان ئەو قەوارە کوردستانییە ئیسلامییە سەربەخۆیە لەگەڵ تەواوی قەوارە نەتەوایەتییە ئیسلامییەکانی تردا پێکەوە لە یەکێتییەکی کۆنفیدراڵیی ئیسلامییدا کۆدەبنەوە و بازنەی (برایەتیی ئیمانیی) پێکدەهێنن و بازنەی (برایەتیی ئینسانیی) دەرەوەی خۆیان دەدوێنن بۆ هیدایەتدانیان و هێنانیان بۆ بازنەی (برایەتیی ئیمانیی) بە هێشتنەوەی ناسنامەی نەتەوایەتییان.

پێنجەم/ کە هەر نەتەوەیەك بەزمانەکەی خۆیەوە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی خۆیان بوون، ناسنامەی (عەقائیدی)یان گۆڕانی بەسەرداهاتووە، بۆ ئەو ئاستە بالآیەی کە شایانی بالآترین دروستکراوی خودایە، بەلاّم ئەم گۆڕانە نەبووەتە مایەی گۆڕانی ناسنامەی (نەتەوایەتی)یان.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو نەتەوەیەکی موسڵمان دوو ناسنامەی هەیە، ناسنامەیەکی (نەتەوایەتیی) و ناسنامەیەکی (عەقائیدی).

ئێمەش وەك نەتەوەی کوردی موسڵمان، (کورد)بوونمان ناسنامەی (نەتەوەیی)مانە:

﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾. الحجرات: ١٣.

(ئیسلام)بوونیشمان ناسنامەی (ئایینیی)مانە:

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الْإِسْلَامُ﴾. آل عمـران: ١٩.

ئەم پێشەکییەمان بۆ ئەوە بوو، کە بڵێین ساڵانێکی زۆر جۆرێك لە ناتەبایی خرابووە نێوان نیشتیمان و ئایینەوە، هەتا ئەو کاتەی ئایینی خودا ڕێنمایی زۆربەمانی کرد بۆ کۆکردنەوەی نەتەوە و ئایین لە هزر و بیری تاکی کوردی موسڵماندا.

ئەم کتێبەی بەڕێز مامۆستا (محەمەد مەلا مەحموود تاوگۆزی)یش هەوڵێکی باش و دڵسۆزانەیە بۆ هەمان مەبەست لە گۆشەنیگای دەروازەیەك و (نۆ) بەشەوە، خودای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە و بیخاتە تەرازووی کارە چاکەکانی.

## پێشەکیی بەڕێز مامۆستا (مەلا ئازاد گڵێجاڵیی)

## بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان

✍ خوێندنەوەی مێژووی دروستکراوی کورد، ئاژاشکەیەك بە سەرتاپای مرۆڤی بەویژدان دەهێنێت، هەموو گیانی دەتەزێنێت و ئاوی لە چاوان دەتەزێنێت، پەکو! ئەوانەی نووسەرن و خۆیان لە ڕاستیی دەبوێرن و هەست و ویژدان لە لانەی دڵیاندا نییە. ئامادەنین تەنانەت کوردی بێچارە، بە مرۆڤی بەر بێگارە و کۆیلە و قولەش لە قەڵەم بدەن.

(شێخی سەعدی) خودا لێی خۆشبێت لە (بوستان)ەکەیدا دەڵێت:

– شەوێك پیاوێك لە خەونیدا بە شەیتان دەگات، باڵایەکی جوان و لەبار، دەموچاوی ناسك و نازدار، زۆری لە لا ئاڵۆزدەبێت! چونکە ئەم پیاوە هەزارە وێنەی ئەم ناسك و نازدارەی بە جۆرێکی دیکە دیوە، سێ چوار گەز کلك، چاوێکی کوێر، لوتێکی زل، دو گوێی درێژی نالەبار، پشتی کووڕ و دانی درێژ. پێیدەڵێت تۆ کەی ئاوا کرێت و ناحەزی کەوا من بینیومە؟

– ئەویش دەڵێت: کاکی بەڕێز، ئەو کەسانەی وێنەی منیان بە ئەو جۆرە بۆ تۆ کێشاوە، دوژمن و نەیاری منن! بە ویستی خۆ وێنەی منیان نماکرگە، نەك بە ئەو جۆرەی خودای مەزن نەخشاندوومی، قەڵەم ئێستە لای ئەوانە و منیش هیچم پێناکرێت، دەبا هەواڵەی خودا بن.

ئەو کەسانەی مێژووی کوردیان بە ئاوەژوو نیشانداوە، هێندەی بکێشی شەیتانیش ویژدانیان لە لا نەبووە. ئەوان دەڵێن: ((کورد تەنانەت مرۆڤ نییە، نەوەی شەیتانی لەعین و تۆرەمەی خێوی ناحەزە.

وابزانم بیستووتانە: لەناو دیوانی مەزنی، پڕ میوانی (سولەیمان)ی پێغەمبەری خودای گەورە، دوو خێوە کاری پیس و خراپ ئەنجامدەدەن. ڕۆڵەی زۆڵ و بێژو

دەخەن، (سولەیمان)یش فەرموویەتی: (أكردوهن فى الجبال). واتە: زووبن ئەو دێوانە تووڕیانبدەنە ئەو کێوانە, با ببنە کورد. ئیتر ئەوانە باب و باپیرانی کوردە!

جا توخودا من پێتاندەڵێم: کابرای شەیتانکێش باشترە، یان ئەوانەی کوردیان کردە نەوەی زۆڵی ئەو شەیتانەی وێنەکەی ئاوا ناحەزە؟

هەرچۆنێك بێت ئەو عەیامە تێپەڕیوە، قەڵەم لە دەستی ئەوانە دەرپەڕیوە، هاتە نێوان لەپی زێڕیینی کوردان و خاوەنویژدان. یەك لە ئەوانە جەنابی مامۆستا (مەلا محەمەدی تاوەگۆزیی)، گەنجی ئازا و نووسەر و لێهاتوو، زۆر بە ویژدان، بە هەستی جوان، بە دەست و پێنووسی ڕەنگین، مێژووی ڕاستەقیینەی کوردی لەسەر پەڕە نەخشاندوە. داوام لە خودای مەزنە هاوکاری ببێت، هێز و تاقەتی پێبدات. هەر کەسێکیش وەك ئەوە سەریبخات، هەتا وێنەی ڕاست و دروستی کوردەکان دەربخەن و ئیتر هاوشانی شەیتان و خێو و دێومان نەنوسێنن.

ئەم پەرتووکەی لەبەردەستتە، شاکارێك بێت لە وێنەی مامۆستا (مەلا محەمەد)ە. سەردەمێکی زێڕیینی کوردی لە مێژوودا نەخشاندووە. بە خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە وردەوردە تەزووی لاشەی سڕبووی ئێمە دەردەچێت و ڕاستەقیینە سەر دەردەهێنێت.

لە ئەمەوبەریش کتێبی چاك لەسەر مێژووی دێرینەمان لە لایەن کوردان نووسراوە، بەڵام ئەمە زۆر جیاوازە، تەنها باسی قۆناغێکی دیارییکراو، زوڵملێکراو، بە داخەوە لە ناو کوردیش هی وا هەیە شەیتانکێشە، کە دێتە سەر مێژوونووسین بە تایبەتیی کوردی سەردەمی ئیسلام. دینی ئیسلام بە ویستی خۆی بە کرێت و نالەبار و ستەمکار لە قەڵەم دەدات. ڕەواندنەوەی ئەو گومانە لە ئەم پەرتووکەی مامۆستایە. کوردیش وەك هەموو گەلان کری کردگاری مەزنە، بەندەی ئەوە، لە ناو هەموو هۆز و تۆرەمە و نەژادێك، زۆربێت، یان کەم، هەم چاك، هەم خراپی تێدایە.

کەی ڕەوایە خراپێك وێنابکەیت و بیکەیتە نمونەی سەد باش. ڕاستە و پەندی پێشینانە نمونەی خەروار مشتێکە، لە دیواریشدا خشتێکە. بەڵام دەبێت هەم مشتەکە و هەم خشتەکە، مشت و خشتی ڕاستەقینە و بەبێ گزیی بن، جا لە ئەمبەر بێت، یان لە ئەوبەر.

ماوە سەرنجێکی بچووك:

لە ئەم پەرتووکە لە هەندێك شوێندا، باسی کورد لای زانایان دەرخراوە. یەکێکی وەك پێشەوا (غەزالی) لە (ئیحیا)دا خوسپی کوردی نیشانداوە. بە ڕای بەندە پێشەوا (غەزالی) و هەرکەسێکیش وەك ئەو بێت، کەسێکی خاوەنئیمان و تەقوادار و لە خواترسن، کە باسی (ئەکراد)یش دەکەن، مەبەست لە ئەم وشەی (ئەکراد)ە، ئەو کوردانەن کە خراپن، نەك هەموو کورد. وەك چۆن بە عەرەبیی بەدفەڕ دەڵێن (ئەعراب)، ئاوا بە کوردی خراپیش دەڵێن (ئەکراد).[8] ئیتر ناپۆڕێت

---

٨ـ مامۆستا (مەلا ئازاد)، مەبەستی ئەوەیە (کورد) و (عەرەب) و (تورك)، لەگەڵ (ئەکراد) و (ئەعراب) و (ئەتراك) کە لەسەر وەزنی (ئەفعال)ن، لێك جودان، کە ئەمەیان بۆ خراپ و بەدەکانی نێو ئەو نەتەوانە بەکار دەبرێت، بەڵام گەر بگوترێت (کورد)، (عەرەب)، (تورك)، ئەوا هیچ نەنگییەکی تێدا نابینرێت و، دوور دەبێت لە ناوهێنانی زەمهەلگر.

بەڵام لە ڕاستیدا هێشتا ئەم لێکدانەوەیە نەپێکانی زانایانی وەك (غەزالی) و هاوشێوەکانی ناشارێتەوە! چونکە ئەگەر (ئەکراد و، ئەعراب و، ئەتراك) ناوبن بۆ خراپەکانیان، ئەوا خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا (مِن)ی (تبعیض)ی وەك پێشگر بۆ بەکارهێناون، تاکو هەموو ئەوانەی لە بازنەی (ئەعراب)دان، نەخرێنە تای تەرازوویەکەوە و بە خراپە نەگشتێنرێن.

کەواتە دەبوو زانایانیش لە قورئانی پیرۆزەوە ئەو میتۆدەیان وەرگرتبا. ئەوەتە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُمْ مِنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ﴾. ﴿سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ﴾. ﴿قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ﴾. ﴿وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾. ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِقِنْطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ﴾. ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾. چەندین ئایەتی تری هاوچەشن، کە خودای گەورە لە کاتی باسکردنی تیرە و ڕەگەز و، ئایینە جیاوازەکاندا، دوور لە گشتاندن باسیانی فەرمووە. (نووسەر: موحەممەد مەلا مەحمود).

و ناگونجێت مەزنێکی وەك (غەزالی)، هەروا بە خوتوخۆڕایی خۆی بچووکبکاتەوە و لە ناحەق زەمی گەلێك بکات. خوداش زانایە.

خوێنەری بەڕێز و هێژا، هیوادارم زۆر بە وردیی ئەم پەرتووکە بخوێنیتەوە و چاوی لێبکەیت، هەتا بزانیت کوردی هێژا بە هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زیاتر هێژا و مەزن بووە. هەتا بزانیت خودای مەزن ئێمەیشی وەك گەلانی تر خولقاندووە و خۆشیدەوێین. بڕواش بە ناوناتۆرەی ناحەزانی کوردستان و ئایینی پاکی ئیسلام و زانایانی مەزن نەکەیت.

براتان:

ئازاد عەباس گلێجالێی

قەرەگۆل.

# به ناوی خودای میهرەبان و مەزن

## پێشەکیی چاپی دووەم

✍ سوپاس و ستاییشی شایستە و شایان بۆ خودای پەروەردگاری بالاّ. درووود و سلاّوی هەمیشەیی بۆ گیانی پاك و پیرۆزی سەروەرمان و، خێزان و خانەوادە و، سەرجەم یاران و شوێنکەوتووانی...

لە پاشان:

خۆشەویستانم! وەك ئاشکرایە نەتەوەی کورد یەکێکە لە دێرینترین نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی. نیشتیمانەکەشی دووەم لانکەی نوێبوونەوەی ژین و ژیانەوەی بەرەی ئادەمیزادە.

بەلاّم جێگەی نیگەرانییە، مێژووی ئەم نەتەوەیە وەك پێویست زانراو و بەردەست نییە. ئەوەیشی هەیە یان درۆ و نادرووستە، یاخود بەسندە و بڕی پێویست نییە؛ چونکە بەشێکی زۆری لە لایەن نەیارانەوە نووسراوە، کە ڕووی ڕاستییان نیشان نەداوە، یاخود لەلایەن کەسانی بیانیی نەشارەزا و ناپسپۆڕەوە تۆمارکراوە، کە ئەوانیش مافی تەواویان پێنەداوە. هاوکات ئەوانەشی بە ویژدانەوە دوواون، لە ئاست تەما و داخوازیی نزمترە و هاوتای بەها و قەبارەی ڕاستەقینەمان نییە. ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاواز دەگەڕێتەوە، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیمان نییە.

دیارە ئەمەش گرفتی گەورەی بۆمان خولقاندووە، هەر وەك (مەلای گەورەی کۆیە) بەڕەحمەت بێت، فەرموویەتی: ((یەکێ لە عەیبی عەزیمی کوردان، بێ تەئریخییە، تازە ئەوا ڕێکی دەخەن، أمین هذه الأمة "زەکی بەگ" زۆر خەریکە، وە کەزا "سەید حوزنی" -خوا کەیف خۆشیان کا-، لەبەر بێ تەئریخی هەر

قەومە بەلای خۆی دا دەکێشیّ. ئەما بۆ ئیستیخدام عەرەب ئەڵێن: لە مەن، ئێرانی ئەڵێن: لەمەن، لەو ئەواخیرە ئەڵمانی ئەڵێن: ئێمە و کورد خزمین. ئەسڵی ئەوان "کرمان" بووین، لە شەرقی ئێمە هیجرەتیان کردییە بۆ غەرب، تەحریف کراوون، بووینە "جەرمان"، ئاخری بوونە "ئەڵمان"، ئەمما ئێمە بە "کرمانج"ی ماینەوە))[٩].

هەر لە ئەو سۆنگەیەوە، منیش بە پێویستم زانی ئاوڕێکی خێرا لە لایەنێکی مێژوویی پڕسەروەریی ئەم نەتەوە مەزنە بدەمەوە و، لەسەر یەکێك لە ئەو قۆناغانە هەڵوێستەبکەم، کە پێیدا تێپەڕیوین، ئەویش سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامە (درورد و سەلامی خودای لەسەربێت). کە بێگومان مێژووی کورد بۆ هەزاران ساڵ پێش ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە و، مێژووی بوونی کورد زۆر لە مێژووی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام دێرییینترە.

بەڵام نابێت ئەوەش لەیادبکەین، لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری ئیسلامدا، کورد باوەڕی هێنا و مسوڵمانێتییان هەڵبژارد، ئیدی لەوە بەدواوە کورد پێینایە قۆناغێکی دیکەوە و، هەستانەوەیەکی باشی بە خۆوە بینی و، هێدی هێدی نێوی کەوتە نێو ناوان. وە هەر لە ئەو ڕۆژەشەوە هەمیشە کورد ئەندامێکی کارا و چالاکی جەستەی ئیسلام و مسوڵمانان بووە، هەتا هەنووکەش دووانەیەکی لێکدانەبڕاوی ئاوێتە بەیەکن.

جیهادی گەورە سەرکردەمان (صەلاحەدینی ئەیوبیی) و سوپا و سەربازە کوردەکانی و، بڵاوبوونەوەی سەدان زانای هەڵکەوتوومان بە جیهانی ئیسلامیدا و بوونیان بە چرای زانستی زۆرێك لە وڵاتانی عەرەبیی و ئیسلامیی، گەورەترین گەواهیدەری ئەم ڕاستییەن. لەگەڵ ئەمانەشدا ڕابەرایەتییکردن و سەرمەشقبوونی

---

٩ـ تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ٦٠٢.

کەسایەتییە ئایینییەکان لە بزاڤە نەتەوەیی و ئەدەبیی و زانستیی و فەرهەنگییەکاندا، بەڵگەی ئەوەن کە ڕێبەران و خەمخۆرانی ئەم نەتەوەیە، هەمیشە مسوڵمان و بڕوادارەکان بوون و، ئایین پاڵپشت و جوڵێنەری هزری نیشتمانی و نەتەوەییان بووە.

خوێنەری خۆشەویست! ئەوەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە هەوڵێکی سەرەتایی و سنووردارە بۆ ئاشنابوون بە جوانیی و سەروەرییەکانی کورد و ناسنامە نەتەوەییەکەی، لەسەردەمی زێڕینی ئیسلام و ڕۆژگاری پێغەمبەری ئازیزدا (دروودی خوای لەسەربێت).

هەڵبەتە کارێکی لە ئەم چەشنە هەروا ئاسان نییە، بەڵکوو هەنگاوی گەورەتر و هەوڵی زیاتری پێویستە. بەندەش لە ئەم پێناوەدا شەونخونی زۆر و ماندوبوونی ئێجگار فرەم چەشت؛ چونکە کۆکردنەوە و چنگخستنی زانیارییەکان هێندە سانا و سەرپێیی نەبوون. ئەو ڕێکخستن و ڕیزبەندییەی کە لەبەردەستتدایە هێنان و بردنی زۆرم پێکردووە، کە دەتوانم بڵێم بەشی زۆرینەی بەرهەمی ئەندێشەی خودی نووسەرن، بەبێ هەبوونی سەرچاوەی پێشینەی دیکەی هاوچەشن و پۆلێنکراوی و تایبەت بە ئەم بوارە.

نووسەریش بۆ ئێستە و لە ئەم دۆخەدا هەر ئەوەندەی پێ کرا و زیاترمان لە دەست نەهات. هیوادارم کەسانێکی بە ئەزموون و خاوەن توانا و ئاستی باڵا، سۆراغی زیاتری ئەم باسە بکەن؛ چونکە زانیارییە تۆمارکراوەکانی پەیوەست بە کورد، لە ناو سەرچاوەکاندا زۆر پەرش و بڵاون و، کۆکردنەوەی هەمووشیان بە تەنها کەسێك ناکرێت و، بگرە ئەستەمە، بەڵکو کاری هەرەوەزی و پرۆژەیەکی دەستەجەمعی دەوێت.

لەبەرئەوە من لێرەوە داوا لە هەموو لایەك دەكەم، ئەوەی هەر شتێكی لایە با كەمتەرخەمیی نەكات و بیخاتە بەردەست؛ چونكە مێژووی دێریینی نەتەوەكەمان پێویستی بە ساغكردنەوە و كۆكردنەوە و ڕێكخستن هەیە.

بۆ ئەو مەبەستەش دەرگامان والآیە بۆ هەر كەسێك بیەوێت مەلۆیەك بخاتەسەر ئەم خەرمانە و باسەكەمان دەوڵەمەندبكات، بە زانیارییبەخشین، یان بە تێبینیی دروست و ڕەخنەی بەجێ و سەرنجی ورد. بۆ هەر كام لە ئەمانە ئێمە پێزان و سوپاسگوزارین.

بێگومان بۆ هاتنەدنیای ئەم بەرهەمە سەرەڕای ماندووبوونی زۆر و چەندین جار خوێندنەوە و پێداچونەوە، هێشتا پێم وایە بابەتەكە هەڵگری سەرنجی پسپۆڕان و توێژەرانە؛ چونكە ئەمە كاری مرۆڤە و كاری مرۆڤیش هەرگیز تەواو نابێت. هەڵەیش كاتێك دەكرێت كە كاربكرێت. لە ئەم ڕوانگەیەشەوە ئەگەر هەڵەمان هەبێت هیوادارم بە ئەو چاوەوە بڕوانرێتە كارەكەمان و هەڵەكانمان بە ڕەخنەی بنیاتنەر بۆ ڕاستبكرێتەوە؛ چون هەروەك (ئیبراهیمی صولی) گوتوویەتی: ((المتصفح للكتاب أبصر بمواقع الخلل فيه من منشئه))[1]. واتە: ئەو كەسەی كنە و پشكنین بۆ پەرتوكێك دەكات، لە نوسەرەكەی زیاتر كەلێن و نەنگییەكانی دەبینێت.

دیارە ئەمە دووەم چاپی پەرتووكەكەیە، هەڵبەت ئەم نۆبەتە لە چاپی یەكەمی چڕ و پڕترە، بەڵكوو بەرفروانتر و پوختتریشە. بابەتی نوێ و سەرچاوەی زیاتریشم خستووەتە سەری و، باسەكانی پێشویشم دەوڵەمەندتر كردووە.

ئەمەش وەك ڕوونە، حاڵی هەموو نووسەرێكە لەگەڵ نووسین و بەرهەمەكانیدا. هەروەك پێشەوا (سەعالیبی) دەفەرموێت: ((لا يكتب أحداً كتاباً، فيبيت عنده

---

١- الإعجاز والإيجاز: أبو منصور عبد الملك عبد الملك بن محمد بن إسماعيل الثعالبي: ١١٣. الأعلام: خير الدين بن محمود بن محمد بن علي بن فارس الزركلي الدمشقي: ١/ ٢٢.

ليلة، إلا أحب في غدّها، أن يزيد فيه أو ينقص منه))[11]. واتە: کاتێك کەسێك کتێبێك دەنوسێت و، شەوێکی بەسەردا تێدەپەڕێت، بە دڵنیاییەوە لە سبەینێیدا پێیخۆشە زیاد و کەمی لێ بکا. ئەمە تەنها شەوێك، چما چەندین مانگ و ساڵی بەسەردا گوزەر بکات؟!!

هەر لە ئەم بارەیەوە (قازی بەیسانی) جوانی فەرمووە: ((إني رأيت أنه لا يكتب إنسان كتابا في يومه إلا قال في غده لو غُير هذا لكان أحسن، ولو زيد لكان يُستحسن، ولو قدم هذا لكان أفضل، ولو ترك هذا لكان أجمل. وهذا من أعظم العبر، وهو دليل على استيلاء النقص على جملة البشر، فأرجو مسامحة ناظريه فهم أهلوها، وأؤمل جميلهم فهم أحسن الناس وجوها))[12]. واتە: هەر نووسەرێکم دیبێت، لە ئەمڕۆدا شتێکی نووسیبێت، بۆ سبەینێ گوتوویەتی: ئەگەر ئەوەم گۆڕیبایە باشتر دەبوو، ئەگەر ئەوەم زیادکردبایە باشدەبوو، ئەگەر ئەوەم پێشخستبایە چاکتر دەبوو، ئەگەر ئەوەی تێدا نەبایە جوانتر دەبوو. ئەمەش گەورەترین پەندە و، بەڵگەشە لەسەر ناکامڵێتیی کۆی مرۆڤ، لەبەرئەوە دەخوازم تەماشاکەرانی چاوی لێبپۆشن؛ چونکە ئەوان ئەهلی چاوپۆشییکردنن. هیوای جوانیشم پێیانە؛ چونکە ئەوان باشترین کەسن کە بۆ بەخشین ڕوویان لێبنێین.

ئەوەی ماوەتەوە لێرەدا بیڵێم ئەوەیە کە: لە هەندێك شوێنی ئەم پەرتووکەدا و لە میانەی چەند پرس و باسێکدا بۆچوونی نوێ، یان نامۆ و دەگمەن دەبیستیت و دەبینیت. مەرج نییە ئەوانە ڕاستییەکی ڕەها و چەسپاوبن، بەڵکوو

---

١١ـ الإبحار في جمع الأسفار، جماز بن عبد الرحمن الجماز: ٤.

١٢ـ إتحاف سادة المتقين بشرح إحياء علوم الدين، للزبيدي: ١/ ٣. أبجد العلوم الوشي المرقوم في بيان أحوال العلوم، صديق بن حسن القنوجي: ١/ ٧٠.

ئەو بۆچوونانە خراونەتەڕوو وەك دەروازەیەك بۆ بابەتی توێژینەوە و سۆراخکردن و بەدواداچوون، ئەگەرنا هەموو بۆچوونێك گریمانەی ڕاست و هەڵەیی تێدایە و هەڵگری خوێندنەوەی جیاوازە و، دەبێت ساغکردنەوەی بابەتیی و زانستییانەی بۆ بکرێت.

نووسینەکەشم بە ئەم چەشنەی خوارەوە دابەشکردووە:

**دەروازەیەك/** سەبارەت بە خۆشەویستیی نیشتیمان و نەتەوەدۆستیی.

**بەشی یەکەم/** شێواندن و خراپوێناکردنی کورد.

**بەشی دووەم/** کوردستان و نیشتیمانی کوردان، لە ئاراستە و ئاماژەکانی قورئاندا.

**بەشی سێهەم/** (جابانی کوردی)، ژیان و ڕۆڵ و کەسایەتیی و، نەوە و مۆزەکەی.

**بەشی چوارەم/** (مەیمونی کوڕی جابان)، کەسایەتیی و ڕۆڵی لە گێڕانەوەی فەرموودە.

**بەشی پێنجەم/** جلوبەرگی کوردی، ڕەسەنایەتیی و شەرعیبوون.

**بەشی شەشەم/** ئازایی و جوامێریی کورد، لە ئاماژەی ئایەتێکی قورئان و فەرموودەیەکی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەربێت).

**بەشی حەوتەم/** مسوڵمانبوونی کورد لە نێوان ئاشتیی و شەڕدا.

**بەشی هەشتەم/** قورئانی پیرۆز و زمانی کوردی.

**بەشی نۆهەم/** زمانی شیرینی کوردی، لە زاری پیرۆزی حەزرەت و یارانەوە.

لە کۆتاییشدا ئاماژەم بە گرنگترین ئەو دەرئەنجامانە کردووە، کە لە توێژینەوەکەدا پێیگەیشتووم.

لێرەدا بە ئەرکی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم، پێشکەش و ئاراستە بکەم بۆ هەریەك لە:

- توێژەر و نووسەر و ڕووناکبیر، مامۆستا (عەبدولرەحمان سدیق).
- هاوڕێی خۆشەویست و شیرینم، مامۆستا (مەلا ئازاد گڵێجاڵیی).

- مامۆستا (ئیکرام کەریم)ی سەنگین و ئازیزمان.

کە لە کاتی زێڕیینی خۆیان تەرخانکرد بۆ پێداچوونەوەی ئەم بەرهەمە و هەڵسەنگاندن و پەسەندکردنی. خودای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە و بەرەکەت بخاتە تەمەن و زانست و بیریانەوە و سەرکەوتوو و سەرفرازی دنیا و دواڕۆژیان بکات.

وە داوا دەکەم هەر کەسێك زانیاریی و سودێك لە ئەم پەرتووکە وەردەگرێت، ڕێز لە ماندوبوون و شەونخوونییمان بگرێت و، ئەمانەتی زانستیی بپارێزێت و ئاماژە بە ئەم تەرتووکە بدات؛ چونکە بە ڕاستیی زۆر توێژینەوە و نووسراو و تەنانەت پەیج و ئەکاونتی جۆراوجۆر، زانیاییەکانیان بڵاوکردووینەتەوە بەبێ ئاماژەدان بە ئەم سەرچاوەیە.

لە خودای مەزن داواکارم ڕێنیشاندەر و دەستگیرمان بێت بۆ حەق و ڕاستیی، وە بەرهەمەکەشمان جێگەی ڕەزامەندیی خۆی و، سوودی بەندە چاکەکانی بێت. (واللە المستعان، وعلیە التُکلان، وهو السمیع المجیب).

موحەممەد مەلا مەحمود مەلا موحەممەد تاوگۆزیی
٢٥ / ١ / ٢٠٢٠ ـ زەڕایەن.

## دەروازەیەک
## دەربارەی خۆشەویستیی نیشتیمان و نەتەوەدۆستیی

وەك هەموو مرۆڤێکی سەر ئەم زەمینە، مافی سروشتیی و خواپێداویی خۆمانە، کە خاك و نیشتیمان و زێدی باوباپیرانی خۆمانمان خۆشبوێت. بە تایبەت کوردستانی ئێمە، کە وێڕای ئەوەی جگە لە خۆمان، خەڵکان و گەڕیدە و پسپۆڕ و مێژوونووسانێکی زۆر، شایەتیی ئەوەی بۆ دەدەن، کە خاوەنی زۆر پەسن و تایبەتمەندێتیی جۆراوجۆر و کەموێنەیە.

بەدەر لە ئەم هەموو ئەو تایبەتمەندییە کەموێنەیەی کە نیشتیمانی ئێمە هەیەتی، نیشتیمان و زێدی باب و باپیران لە لای هاوڵاتییانی هەمیشە خۆشەویستە و، مرۆڤ هیوای هەموو خێر و خۆشییەك بۆ نیشتیمانی خۆی دەخوازێت، ناچاریش نەبێت، یان نەکرێت، زەحمەتە نیشتیمانی خۆی بەجێبهێڵێت، هەر کاتێکیش لە نیشتیمانی خۆی دەربکرێت، ئەوا هەموو ساتێك گەڕانەوە بۆ وڵات بە ئاوات دەخوازێت[13].

لەبەرئەوە کاتێك دەستەڵاتدارانی (قورەیش)، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) و، هاوەڵانیان لە (مەککە) وەدەرنا. پێغەمبەر لە دوا خاڵی سەر سنووری (مەککە)دا ڕوویکردە شارەکەی خۆی و فەرمووی: «وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ»[14]. واتە: سوێند بە خودا، ئەی (مەککە) تۆ باشترین و خۆشەویستترین خاکی خودایت.

---

١٣ـ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولرەحمان سدیق، لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.

١٤ـ رواه الإمام أحمد في مسنده، برقم: ١٨٧١٥. وابن حبان وصححه، برقم: ٣٧٠٨. والترمذي في سننه، برقم: ٣٩٢٥.

خۆ ئەگەر بە زۆر دەریان نەکردمایە، بەجێم نەدەهێشتیت.

تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) ئەوەندە لە بیری شادبوونەوەدا بوو بە (مەککە)، ئەو کاتە دڵنیا و ئارامبوویەوە کە خودای گەورە بەڵێنی گەڕانەوەی پێدا، بە ئایەتی: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾. سورة القصص، الآية: ٨٥.

زانایانی راڤەکاری قورئان دەفەرموون: مەبەست لە ﴿لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ موژدەدانە بە گەڕانەوە و شادبوونەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بە خاکی نیشتیمان، کە (مەککە)ی پیرۆزە. ((قوله تعالى: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ ختم السورة ببشارة نبيه محمد صلى الله عليه وسلم برده إلى مكة قاهرا لأعدائه))[١٥]. ئەمەش بۆچوونی هەر کام لە ئەم یاوەرە بەڕێزانەی پێغەمبەرە: (جابر بن عبد الله، وابن عباس، ومجاهد، وغيرهم)[١٦]. خودا لە هەموویان ڕازیبێت.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین خودای پەروەردگار دوورخستنەوە و بەجێهێشتنی نیشتیمانی وەك سزایەك بۆ تاوانکاران داناوە. ئەوەتا سەبارەت بە چەتە و گەندەڵ و خراپەکاران، دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾. سورة المائدة، الآية: ٣٣.

هەر لە قورئانی پیرۆزدا، خۆکوشتن و دەربەدەربوون لە زێد و نیشتیمان، لە تای تەرازوویەکدا دانراوە و خودا هاوشانی یەکتر باسیکردوون. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِنْ دِيَارِكُمْ مَا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ

---

١٥ـ الجامع لأحكام القرآن، المسمى بتفسير القرطبي: ١٣/ ٣٢١. تفسير بحر العلوم، أبو الليث نصر بن محمد بن إبراهيم السمرقندي الفقيه الحنفي: ٢/ ٦٢٣.

١٦ـ تفسير الطنطاوي: ٣٢٩٢.

فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾. سورة النساء، الآية: ٦٦.

له ئایەتێکی دیکەدا شەڕکردن لەپێناو ئاییندا، دەرکردن لە نیشتیمانی هاوتای یەك باسکردووە و دەفەرموێت: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾. سورة الممتحنة، الآية: ٨.

هەروەها پێغەمبەری پێشەوا (درووودی خوای لەسەربێت) دەربارەی ئەو بڕوادار (کوڕ و کچ)ـانەی توشی ناپاکیی و زینا دەبن، بڕیاری فەرمووە بە دوورخستنەوە و دەربەدەرکردنی لە نیشتیمان. ئەوەتا لێیەوە ڕیوایەتکراوە کە: «أنه أمر فيمن زنى ولم يحصن بجلد مائة وتغريب عام»[17]. واتە: پێغەمبەر فەرمانی داوە هەر کوڕ و کچێك زینایانکرد، (سەد) داری حەدیان لێبدرێت و ساڵێکیش دووربخرێنەوە لە خاکی خۆیان.

سەبارەت بە پیلانی براکانی (یوسف –سەلامی خوای لەسەربێت)، کاتێك ویستیان ئەشکەنجەی بدەن، یەکێك لە پێشنیازەکان ئەوەبوو لە زەوییەکی چۆڵدا بەجێیبهێڵن: ﴿اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾. لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (ئیسماعیل حەقی) دەڵێت: ((وفيه إشارة إلى أن التغريب يساوي القتل))[18]. واتە: ئەم ئایەتە ئاماژەی تێدایە بە ئەوەی دوورخستنەوە و دەربەدەرکردن لە نیشتیمان لەگەڵ کوشتندا وەك یەکە.

هەروەها لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا، کە باسی ڕۆیشتنی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێت) و، خاتوو (خەدیجە)ی دایکمان (خودا لێی ڕازی بێت) دەکات بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفل) و هەواڵدانی دەربەدەرکردنی پێغەمبەر لە لایەن

---

١٧ـ رواه البخاري، برقم: ٢٥٦٠.

١٨ـ تفسير روح البيان: ٤/ ١٤١.

بێباوەڕانی هۆزەکەیەوە، شێخ (ئەبوشامەی مەقدیسی) دەڵێت: ((ففي هذا دليل على حب الوطن وشدة مفارقته على النفس))[19]. واتە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیی نیشتیمان و سەختیی دوورکەوتنەوە لێی.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودی خوای لەسەربێت) زۆر بایەخی بە خاك و نیشتیمان دەدا و خۆشەویستیی زۆر و سۆزی گەورەی بەرانبەر دەنواند. هەرکات لێی دووردەکەوتەوە بیریدەکرد و تامەزۆری زووگەڕانەوە بوو بۆی. ئەوەتا یاوەری بەڕێز (ئەنەس -خودا لێی ڕازی بێت) ئەم دیمەنەمان دەخاتە پێشچاو و دەفەرمووێت: «أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا قدم من سفر فنظر إلى جدرات المدينة أوضع راحلته وإن كان على دابة حركها من حبها»[20]. واتە: هەرکات پێغەمبەر لە گەشت دەگەڕایەوە و دار و دیواری (مەدینە)ی لێوە دەردەکەوت، لە خۆشەویستیی بۆ شاری (مەدینە) وڵاخەکەی خێرادەکرد و دەیبزواند، بۆ ئەوەی زوو بگاتەجێ.

هەرکام لە شێخ (ئیبن حەجەر)[21] و (بەدرەدینی عەینی)[22] لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویانە: ((وفي الحديث دلالة على فضل المدينة وعلى مشروعية حب الوطن والحنين إليه)). واتە: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ڕەوایەتیی خۆشویستنی نیشتیمان و سۆزنواندن بۆی.

---

19 شرح الحديث المقتفى في مبعث النبي المصطفى، لأبي شامة المقدسي: ١٦٣.

20 رواه البخاري، برقم: ١٧٨٧.

21 فتح الباري: ٣/ ٦٢١.

22 عمدة القاري: ١٠/ ١٣٩.

پێشەوا (زەهەبی)یش لە باسی ئەو شتانەدا کە پێغەمبەر خۆشیویستوون، دەڵێت: «ويحب جبل أحد، ويحب وطنه، ويحب الأنصار»[23]. واتە: پێغەمبەر کێوی (ئوحود)ی خۆشدەویست، نیشتیمانەکەی خۆشدەویست، (ئەنصارەکان)ی خۆشدەویست.

(ئەبو حومەید)ی یاوەریش (خودا لێی ڕازیبێت) دەڵێت، لە غەزای (تەبوك)دا کاتێك گەڕاینەوە و گەیشتینە بەرزاییەکانی (مەدینە)، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێت) فەرمووی: «هَذِهِ طَابَةُ وَهَذَا أُحُدٌ وَهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ»[24].

کەواتە لە نێوان مرۆڤ و نیشتیماندا پەیوەندییەکی قووڵی وابەستە هەیە، هەر وەك لە نێوان پێغەمبەر و کێوی (ئوحود) و خاکی (مەککە) و (مەدینە)دا هەستێکی خۆشەویستیی دوولایەنە هەبووە.

لەبەرئەوە کاتێکیش ئاوارەی (مەدینە) کرا، هەردەم لە بیری (مەککە)دا بوو، لەگەڵ یادەوەرییەکانی دەژیا و هەواڵپرسی دەکرد. ئەوەتا (حیزام) لە باوکییەوە ئەم هەستەی پێغەمبەرمان لە ڕیوایەتێکدا بۆ دەخاتەڕوو: «عن حزام بن هشام، عن أبيه، قال: قدم أصيل الغفاري قبل أن يضرب الحجاب، فدخل على عائشة، فاستخبرته عائشة رضي الله عنها، عن مكة كيف تركتها؟ فذكر مطرا أصابها، وقال: وتركت بطحاءها قد ابيضت، وأمشر عضاهها، وأعذق إذخرها، وأسلب ثمامها، وأبقل حمضها، فدخل النبي صلى الله عليه وسلم على ذلك، فقال: إيها يا أصيل، لا تحزنا»[25]. واتە: پێش واجبوونی بالاپۆشیی (حیجاب)، (ئوصەیلی غیفاری) بۆ لای (عائیشە)ی دایکمان هات، ئەویش هەواڵی شاری (مەککە)ی

---

٢٣. سير أعلام النبلاء: ١٥/ ٣٩٤.

٢٤. رواه البخاري برقم: ٤١٦٠، ومسلم برقم: ٦٠٨٧.

٢٥. أورده ابن أبي دنيا فى المطر والرعد والبرق، برقم: ٧٩. وأبوشيخ الأصبهاني فى العظمة: ٤/ ١٢٦٥.

لێپرسی، (ئەصیل) لە وەڵامدا گوتی: کاتێك (مەککە)م بەجێهێشت (بەتحا[26])کانی سپیی بووبوو، دڕکەکانی پێگەیشتبوون. (ئیزخیر[27])ەکانی تێراو بوبوو، گەڵای (سەمام[28])ەکانی وەریبوون. (حەمز[29])ەکانی پێگەیشتبوون. لە ئەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) هاتە ژوورەوە، کە گوێی لە ئەم پیاهەڵدانە بوو، فەرمووی: بەسە (ئەصیل) لە ئەوە زیاتر مەڵێ، با خەمبار نەبین.

واتە: وازبهێنە لە ستاییشکردنی (مەککە)، با خۆشیی کەش و هەواکەی وامان لێ نەکات دڵمان لە لای بێت و خوازیاری ژیانی ئەوێ ببین.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە: چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و پێیفەرموو: ئەصیل، بەسە ئیتر! لێبگەڕێ با دڵەکان ئارامبن. «لا تشوقنا يا أصيل! دع القلوب تقر»[30].

خۆشویستن و سۆزنواندن بەرانبەر بە خاك و نیشتیمان لە ئیسلامدا لە ئاستێکدایە، خودای مەزن گڵەکەی بە شیفا و چارەسەر داناوە. ئەوەتا خاتوو (عائیشە) لە پێغەمبەری سەروەرمانەوە (دروودی خوای لەسەربێت) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: «كان النبي صلى الله عليه و سلم يقول في الرقية: تربة أرضنا وريقة بعضنا يشفى سقيمنا بإذن ربنا»[31]. واتە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لە

---

٢٦ـ بەتحا: بە ئەو شوێنانە دەگوترێت کە نزم و بەرفراوانە و کاتێك لافاوی بەسەردا دەڕوات بە پاشماوەی لم و قوڕ زەوییەکە سپیی دەبێت. ئەمەش ئاماژەیە بە ئەوەی (مەککە) بارانی زۆری لێباریوە.

٢٧ـ ئیزخیر: جۆرە گیایەکی بۆنخۆشە.

٢٨ـ سەمام: جۆرە گیایەکی (مەککە)یە، گوڵەکەی وەك گوڵەگەنم وایە.

٢٩ـ حەمز: هەر جۆرە ڕووەکێکە بەرەکەی ترش بێت.

٣٠ـ سوهەیلی لە (الروض الأنف: ٥/ ٣١)دا دەڵێت: ((قد جاء في حديث أصيل الغفاري -ويقال فيه الهذلي- «أنه قدم من مكة، فسألته عائشة كيف تركت مكة يا أصيل؟ فقال: تركتها حين ابيضت أباطحها، وأحجن ثمامها، وأغدق إذخرها، وأمشر سلمها، فاغرورقت عينا رسول الله صلى الله عليه وسلم وقال: لا تشوقنا يا أصيل». ويروى أنه قال له: «دع القلوب تقر..»)).

٣١ـ رواه البخاري، برقم: ٥٤١٤. ومسلم، برقم: ٥٨٤٨. واللفظ للبخاري.

کاتی نووشتەکردندا دەیفەرموو: بە یارمەتیی خودا، گڵی زەوی و تفی هەندێکمان چارەبەخشی نەخۆشییمانە.

شێخ (ئیبن حەجەر) لە ڕۆشنایی ئەم فەرموودە شیرینەوە گوتوویەتی: ((وتراب الوطن له تأثير في حفظ المزاج ودفع الضرر، فقد ذكروا أنه ينبغي للمسافر أن يستصحب تراب أرضه إن عجز عن استصحاب مائها، حتى إذا ورد المياه المختلفة جعل شيئا منه في سقائه ليأمن مضرة ذلك))[٣٢]. واتە: گڵی نیشتیمان کاریگەرە بۆ پاراستنی باری دەروون و لادانی زیان. باسکراوە وا چاکە ڕێبوار لە گەشتەکەیدا ئەگەر نەیتوانی ئاوی نیشتیمان لەگەڵ خۆیدا بەرێت، ئەوا با هەندێك لە خۆڵەکەی لەگەڵ خۆی ببات، بۆئەوەی دووربێت لە زیان.

(ئیبن جەوزی)ش، دەڵێت: ((والاستشفاء بتراب وطن الإنسان معروف عند العرب وكانت العرب إذا سافرت حملت معها من تربة بلدها تستشفي به عند مرض يعرض))[٣٣]. واتە: چارەوەرگرتن بە خۆڵی نیشتیمان بە لای عەرەبەکانەوە شتێکی باوبووە، لە کاتی سەفەردا لەگەڵ خۆیاندا هەندێك گڵیان دەبرد، بۆ ئەوەی لە کاتی ناساغییدا وەك چارەسەر سودوی لێببینن.

هەر لەبەر هەستی نیشتیماندۆستیی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەربێت)، بەشێك لە زانایان فەرموویانە: یەکێك لە حیکمەتەکانی گۆڕینی قیبلە لە (قودس)ەوە بۆ (مەککە) هاتنەدی حەز و ویستی پێغەمبەرە، هەتا ئەو ڕێز و شکۆیە وەبەر زێد و نیشتیمانی خۆی ببرێت و خاکی خۆی ببێتە سەنتەر بۆ تەواوی مسوڵمانانی جیهان.

---

٣٢. فتح الباري: ١٠/ ٢٠٨.

٣٣. كشف المشكل من حديث الصحيحين، ابن الجوزي: ١/ ١٢٣٣.

سەبارەت بە هۆکاری دەستنیشانکردنی ئەشکەوتی (حەرا)یش بۆ خەڵوەت، چەند هۆکارێك هەبووە. یەکێك لە ئەو هۆکارانە وەك بەشێك لە زانایان گوتوویانە لەبەر ئەوەبووە کە ڕووی لە شاری (مەککە) بووە و پێی خۆشبووە هەمیشە نیشتیمان و زێدی خۆی لەبەرچاوبێت. لە ئەم بارەیەوە (شیروانی) دەفەرمووێت: ((وَكَانَتْ عِبَادَتُهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ ذَلِكَ فِي غَارِ حِرَاءٍ بِالتَّفَكُّرِ فِي مَصْنُوعَاتِ اللَّهِ وَإِكْرَامِ مَنْ يَمُرُّ عَلَيْهِ مِنْ الضِّيفَانِ فَكَانَ يَتَعَبَّدُ فِيهِ اللَّيَالِيَ ذَوَاتَ الْعَدَدِ وَاخْتَارَ التَّعَبُّدَ فِيهِ دُونَ غَيْرِهِ، لِأَنَّهُ تُجَاهَ الْكَعْبَةِ وَهُوَ يُحِبُّ رُؤْيَتَهَا))[٣٤].

ئەم عەشقی نیشتیمانە تەنها لە پێغەمبەردا نەبووە، بەڵکوو لە هاوەڵە بەڕێزەکانیشدا هەبووە. کتێبەکانی (سیرە) دەگێڕنەوە کە کاتێك هاوەڵە بەڕێزەکانی کۆچدەکەن بۆ مەدینە، هەموو بیری (مەککە) دەکەنەوە. هەندێکیان لە تاو دووریی نیشتیمانەکەیان نەخۆشدەکەون. وەك: (ئەبو بەکر، بیلال، عامیر).

حەزرەتی (بیلال) بە دەم (تا و لەرز)ەوە وڕێنەی دەکرد و شیعری دەگوتەوە و دەیگوت:

لیت شعری هل ابیتن لیلة    بواد و حولی (شامة) و (طفیل)[٣٥].

خۆزگە شەوێکیتر دێتەپێشم کە لە دۆڵێکدابم و لە چواردەوریشمدا شاخی (توفەیل) و (شامە) دەبوون[٣٦].

پێغەمبەریش کە ئەمەی لە هاوەڵە بەڕێزەکانی بینی (ڕەزای خودایان لێبێت)، فەرمووی: «اللهم حبب الینا المدینه کما أحببت إلینا مکه، أو أشد». خودایە وەك

---

٣٤ـ حواشي الشرواني على تحفة المحتاج بشرح المنهاج، عبد الحميد الشرواني: ١/ ٤١٧.

٣٥ـ رواه البخاري، برقم: ٥٦٧٧.

٣٦ـ (شامە) و (توفەیل) دوو شاخی نزیك (مەککە) بوون.

چۆن (مەککە)ت لا خۆشەویست کردووین، (مەدینە)ش هەروەها، یان زیاتر لە ئەو لەلا خۆشەویستبکە.

دایکمان (عائشە -خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) هەواڵی باوکم و ئەوانی لێپرسیم، عەرزمکرد: (تا)یەکی زۆریان هەیە هەموو وڕێنەدەکەن. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) چاوی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و فەرمووی: «اللهم حبب إلينا المدينة كما حببت إلينا مكة أو أشد»، وفي رواية: «وأشدّ، وبارك لنا في مدّها وصاعها، وصححها لنا ثم انقل وباءها إلى مهيعة»[37]. واتە: خودایە، مەدینەشمان لا خۆشەویستبکە، وەك چۆن مەککەت لا خۆشەویستکردبووین. ئەم زیاتر خۆشەویستبکە لامان، بەرەکەت بخەرە گوز و پێوانەکانی، ساغ و تەندروستمان بکە و نەخۆشیی دەردی ئەم شارە بەرە بۆ (موهەیعە)[38].

خاوەنی (سیرەی حەلەبی) دوای ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ((ودعاؤه أن يحبب إليهم المدينة إنما هو لما جبلت عليه النفوس من حبّ الوطن والحنين إليه))[39]. واتە: نزاکردنی بۆ ئەوەی مەدینەیان لا خۆشەویست ببێت، هۆکەی ئەوەیە کە دەروونی مرۆڤ وا دروستبووە نیشتیمانی خۆی خۆشدەوێت و سۆزی بۆی دەجوڵێت.

لە پێشەوای دادگەریش (عومەری کوڕی خەتاب)ەوە دەگێڕنەوە، فەرمویەتی: «لولا حب الوطن لخرب بلد السوء[40]، فبحب الأوطان عمرت البلدان»[41]. واتە: ئەگەر

---

٣٧. رواه البخاري، برقم: ٥٦٠٠.

٣٨. (موهەیعە): ناوچەیەکە لە نێوان مەککە و مەدینە، پێیدەگوترێت (جوحفە).

٣٩. (السيرة الحلبية: ٣/ ٣٠٤). (سوهەیلی)ش لە (الروض الأنف)دا ئەڵێت: ((وفي هذا الخبر ما ذكر فيه من حنينهم إلى مكة ما جبلت عليه النفوس من حب الوطن والحنين إليه)). پاشان حەدیسەکەی (ئەصیلی غیفاری) باسئەکات.

٤٠. المحاسن والمساوئ، إبراهيم البيهقي: ٣٩٣٤.

خۆشەویستیی نیشتیمان نەبایە، ولاّتی پیاوخراپان دەبوویە ویّرانە، بە خۆشەویستیی نیشتیمان ولاّت ئاوەدانە.

هەموو ئەمانەمان لەبەرئەوە بەیانکرد، هەتا ئیّمەی کورد، ریّز لە نیشتیمانی خۆمان بگرین و قەدر و بەهای ولاّت و هاولاّتییانی خۆمان بزانین و سۆزمان بۆیان هەبیّت، کە ئەمە هەستیّکی خۆرسکی سروشتیی و سەرەتاییە. لە هەمان کاتیشدا پەرستشیّکی پاداشت لەسەر وەرگیراوەی خودای پەروەردگارە.

لە کۆتاییشدا بە گرنگیی دەزانم ئەم چەند سەرنجە لەبەرچاوبگرین:

أ- پیّویستە خۆشەویستیی گەل و نیشتیمان نەبیّتە بیانوویەك بۆ (شۆفیّنیزم)ی و دەمارگیریی و خۆپەرەستیی و رقبوونەوە لە ئەوانی تر.

ب- بەهەمان بیانوو نابیّت نیشتیمان بکریّتە بەدیل و جیّگرەوەی دین، یان هاوئاستی.

ت- نابیّت کورد کە رۆیشتووەتە بازنەی دووەم، یان سیّیەم، جاریّکی تر بە هیچ پاساویّك بهیّنریّتەوە بۆ بازنەی یەکەم!

بەختەوەریی و ئاسودەیی بۆ هەموو لایەك و خاك و نیشتمانیشمان هەمیشە گەش و ئاوەدان.



٤- تفسیر روح البیان، إسماعیل حقي: ٦/ ٣٢٠. المحاسن والأضداد، أبو عثمان عمرو بن بحر الجاحظ البصري: ٧٧.

# بەشی یەکەم
# شێواندن و خراپوێناکردنی کورد
# ـ هەڵسەنگاندن و بەراوردێک لە نێوان زانایانی کورد و زانایانی گەلانی تر ـ

ئەم بەشە (دوو) باس لەخۆدەگرێت:

**باسی یەکەم/ کورد لە دیدگای ئەوانی ترەوە.**

**باسی دووەم/ دید و تێڕوانینی کورد بەرانبەر نەتەوەی عەرەب.**

**ئەوەی لێرەدا دەیلێین و دەیخەینەبەردەست، ڕەگەزپەرستیی و دەمارگیریی کوێرانە نییە بۆ کورد و کوردایەتیی، بەڵکوو تەنها لە خۆناسینێك و بەرانبەر هەڵسەنگاندنێك بە ئەولاوە هیچیتر نییە. ئێمە پێمانوایە نە ئێمە فریشتەی بێخەوش و خاڵین، نە ئەوانی تر دڕندە و شەیتانن.**

**حاشایش لە ئەوە ناکرێت، کە لە گەلێك سەرچاوەی مێژوویيدا و لە لایەن بەشێك لە نووسەرانەوە بە بیانوو و پاساوی جۆراوجۆر، وێنای کورد شێوێنراوە و ناوی زڕێنراوە.**

جێگەی داخە تێگەیشتنی ئایینیی و زانستیی و ژیریی بەشێك لە زانایان و بیرمەندانی گەلانی دیکە لە ئاستێکی هێندە لاواز، یاخود دەرماگیر و دڵڕەقانەدایە، کە نەتەوەی کوردی مسوڵمانیان بە دڕندە و دووڕوو هەژمارکردووە.

تەنانەت هەندێکجار کاردانەوە و شۆڕش و چالاکییە چەکدارییەکانیشیان -ئەگەرچی ڕەوایش بووبێت-، بە سەرکەشیی و چەتەیی و ئاژاوەگێڕیی تۆمارکردووە. هەتا ئەو ئاستەی هەندێکیشیان بە نەوەی جنۆکە و شەیتانیان لە قەڵەم داوین[42].

ئەم تێگەیشتنە جگە لە نەژادپەرستیی و خودگەرایی، شێواندنی جوانیی و ونکردنی ڕاستییەکان و تۆمەتبارکردنی نەتەوەی کوردیشە، بە ڕادەیەکی زۆریش تۆوی ڕق و کینەی لە نێوان ئێمە و گەلانی تردا چاندووە و ململانێی بێبەها و بێبەهانەی هێناوەتە ئاراوە، کە لە سەدە و چینەکانی ڕابردووەوە هەتا هەنوکەش شوێنەوارە خراپ و نەرێنییەکانی بەرجەستە و دیار و کاریگەرە.

گەلێك زانا و ڕۆشنبیری بیانی -لە عەرب و فارس و تورك و ئینگلیز و هتد- هەمان تێگەیشتن و تێڕوانینیان هەیە. تەنانەت ئەورووپیی و ڕۆژئاواییەکانیش، گەلانی ڕۆژهەڵات -بە کوردیشەوە- بە مرۆڤی ژمارە دوو هەژماردەکەن.

---

٤٢ ـ ئەمانە ئەگەر باوەڕ و بۆچوونی کەسانێکی دوور لە دین-بن کەمتر جێی گلەیی و گازندەیە، بەڵام گرفتەکە لە ئەوەدایە وەك هەمیشە ئێمەی کورد چاوەڕوانی شتی زیاتر و گەورەتر لە مسوڵمانان دەکەین و، هەر ئیسلام و مسوڵمانانیش لە جێگەی هیوا و ئومێد دادەنێین.

وەگەرنا زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناس و خۆرئاواییەکانیش ئەم سنوورەیان بەزیادەوە بەزاندووە و بە ناشیرینیی وێنا و دیمەنی کوردیان نیشانداوە.

## باسی یەکەم

## کورد لە دیدگای ئەوانی ترەوە

بۆ چەسپاندنی ڕاستێتیی ئەوەی لە سەرەوە خستمانەڕوو، لێرەدا هەندێك لە ئەو بۆچوونانە دەخەینەبەردەست، کە سیما و وێنای نەتەوەی کوردی پێ لەکەدارکراوە:

### یەکەم/ کورد لە دیدگای بەشێك لە عەرەبەکانەوە:

بەشێك لە زانایانی عەرەب سەبارەت بە کورد، تێڕوانینێکی نەرێنیی و ناپەسەندیان هەیە. لێرەدا بە کورتیی چەند وێنایەکیان دەخەینەبەرچاو:

١ـ مێژوونووس (مەسعودی[٤٣])، سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد دەڵێت: ((من نسل الشياطين)) یاخود ((من نسل الجن))[٤٤]. واتە: نەوەی جنۆکەن، بەری شەیتانن!

هەروەها دەڵێت: ((ولذلك جانبوا فَظاظةَ الأكراد وسكان الجبال من الأجيال الجافية وغيرهم الذين مساكنهم حُزُون –الأماكن المرتفعة الوعرة– الأرض))[٤٥].
واتە: خۆتان دووربگرن لە زمانی پیس و مامەڵەی خراپی کورد و دانیشتووانی کێوە وشك و گردە ڕەقەڵانە بەرزەکان.

---

٤٣ـ (مەسعودی) یەکێلە لە ئەو زانایانەی کە تۆمەتی شیعەیی و موعتەزیلی دەدرێتەپاڵ. لە ڕاستیبدا شیعەکان تێڕوانینیان بەرانبەر بە کورد زۆر نەرێنیی و ناهەموارە. وتەکانی هەریەکە لە (یەعقوبی) و (کولەینی) و هاوشێوەکانیان دیارترین شایەتحاڵن، تەنانەت کورد بە مرۆڤیش نازانن.
هەروەك چۆن لە سیاسەتکردنیاندا بە ئاشکرا ڕەنگیداوەتەوە.

٤٤ ـ مروج الذهب و معادن الجوهر، أبو الحسن علي بن الحسين بن علي المسعودي: ٣/ ١٢٣

٤٥ ـ هەمان سەرچاوە: ٢/ ١٢١.

٢ـ ڕاڤـەکاری فـەرمووده پێشـەوا (مـەناوی)[٤٦]، سـەرەڕای ئـەوەی خـۆی دان بـە ئـەوەدا دەنێـت، دایکـی لـە نـەوەی (زەینـەدینی عێراقـی)ە، – کـە خانەوادەیـەکی زانـا و ناسـراوی کـوردن–، بـەڵام ئەمـە نەبووەتـە هـۆی خۆبـواردنی لـە خراپنیشاندانی کورد.

وەك سەبارەت بە ڕێزگرتنـی شـێخ دەڵێـت: ((«الشـيخ في أهلـه»، وفي روايـة: «في قومه كالنبيّ في أمته». أي يجب له من التوقير مثـلُ مـا للـنبي صـلى الله عليـه وسـلم في أمته منه، أو المراد: يتعلمون من علمه، ويتأدّبون مـن أدبـه، لزيـادة تجربتـه الـتي هي ثمـرةُ عقلـه. ولـذلك تـرى الأكـرادَ والأتـراك وأجـلاف العـرب مـع قُـرب رُتبـتهم مـن البهيمة، يُوقّرون الشـيخَ بـالطبع))[٤٧]. کورتـەی مەبەست ئەوەیـە: شـێخی (مـەناوی) باسی ڕێزگرتنی زانا و شێخ دەکات، کە دەبێت ڕێزیان بگیرێت. جا دەڵێـت: کـورد و تورك و عەرەبە بێبەزەییەکان، وێڕای ئەوەی پلەیان لـە ئاژەڵـەوە نزیکـە، دەبینیـت قەدری شێخیان لە لایە و ڕێزیان دەگرن.

ئەمە لە کاتێکدا (مەناوی)[٤٨] لە بارەی فەرموودەوە دەدوێت و ئەسڵ وایـە زمـانی لە وشەی بریندارکەر و زبر بپوێرێت، کەچی لێرەدا کورد و تـورك و عەرەبـەکانی بـە

---

٤٦ـ ئەسڵ و دروستتر ئەوەیە بگوترێت: (موناوی)، نەك (مەناوی)، کە نیسبەتە بۆ شاری (مونا) لە وڵاتی (میصر)، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوەکە بەو جۆرە ڕۆشتووە، ئێمەش هەر بەو جۆرە نوسیمان.

٤٧ ـ فيض القدير، المناوي: ٤/ ٢٤٤.

٤٨ـ لە ڕاستییدا ئەم قسەیەی پێشەوا (مەناوی)، پێشتر پێشەوا (غەزالی) لە (ئیحیا)کەیدا کردوویەتی، لە بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٦٠)، هەروەك دەڵێت: ((ولذلك ترى الأتراك والأكراد وأجلاف العرب وسائر الخلق مع قرب منزلتهم من رتبة البهائم يوقرون المشايخ بالطبع)). زانراویشە (غەزالی) لە ساڵی (٥٠٥)ی کۆچیدا وەفاتیکردووە. لە کاتێکدا پێشەوا (مەناوی) لە ساڵی (١٠٣١ك)دا وەفاتیکردووە.

کەواتە بۆچوونەکە لە بنەڕەتدا هی (غەزالی)یە، بەڵام (مەناوی) بەبێ ئەوەی بیداتە پاڵی، هەمان قسەی (غەزالی) لە زاری خۆیەوە دووپاتکردووەتەوە و ئیقراریشی لەسەرداوە.

نزیك له ئاژەڵ ئەژماردووە و پلەی یەکەمیشی لە ئەوەدا بە کورد بەخشیوە. لەگەڵ ئەوەشدا دایکی خۆی کوردێکی ڕەسەنە.

٣ـ (قەزوینی) دەڵێت: ((قال القزويني، قال إبليس –لعنه الله–: أنا مع الأكراد في راحة. فإنهم لا يخالفونه))[٤٩]. واتە: شەیتان گوتوویەتی: من لەگەڵ کوردەکاندا لە خۆشیی و لە پشووداندام؛ چونکە کورد فەرمانبەرداری منن و سەرپێچییم ناکەن.

لێرەشدا دیسانەوە دەبینین چۆن زانایان ڕێگەیان بە خۆیان داوە و بە ناوی شەیتانەوە قسەبکەن و لەسەر زاری ئەویشەوە کورد بە موتیع و ملکەچ دابنێن بۆ نافەرمانیی و ناشەرعیی.

٤ـ کاتێك کوردەکان لەگەڵ (ئەبوهەیجائ)دا چوونە نێو شاری (سەلام)ەوە و (بابوتاق)یان تێپەڕاند، یەکێك لە زانا بازرگانەکان گووتی: کوردەکان ئەوانەن کە خودا دەربارەیان فەرموویەتی: (الأكرادُ أشدُّ كُفراً ونِفاقاً). لە ئەو کاتەدا یەکێکی تر لە بازرگانەکان پێیگوت: فڵانی خودا فەرموویەتی: ﴿الأعرابُ أشدُّ كُفراً ونِفاقاً﴾. ئەویش گوتی: سبحان الله! کوردەکان دەمانبڕن و درۆ بەدەم عەرەبەکانەوە هەڵدەواسن. ((لما دخل الأكراد مدينة السلام مع "أبي الهَيْجاء"، واجتازوا بباب الطاق، قال بعض المشايخ من التجّار: هؤلاء الذين قال الله تعالى في كتابه: "الأكرادُ أشدُّ كُفراً ونِفاقاً". فقال له إنسان: يا هذا، إنما قال الله "الأعرابُ". قال الشيخ: يا سبحان الله! يقطع علينا الأكراد، ونكذب على الأعراب[٥٠]؟! سُمع رجل يقرأ:

---

٤٩ـ نزهة المجالس ومنتخب النفائس، عبد الرحمن بن عبد السلام الصفوري: ٢/ ١٨٧.

لە ڕاستییدا (قەزوینی) بەدەرنەبووە لە قسەبۆهەڵبەستن لە لایەن شیعە و موبەشیرەکانەوە، دوور نییە ئەم قسەیەش ئەوان بە دەمیانەوە کردبێتیان و بۆیان داتاشی بێت، بە تایبەت کتێبی (نزهە المجالس) کە سەرچاوەی ئەم نەقڵەی ئێمەیە کتێبێکی زانستیی و دڵنیابەخش نییە.

٥٠ ـ نثر الدر الآبي: ٢/ ١١٤.

"الأكرادُ أشدٌّ كَفراً ونِفاقاً". فقيل له: ويحك، "الأعرابُ". فقال: كلّه يقطع الطريق))[51].

ئەمانە مشتێك بوون لە خەرمانی ئەو بۆچوونە نازانستیی و ناتەبایانەی کە خەڵکانێك دژ بە کورد. جا بە نەزانیی بێت، یان بە مەبەست بۆیان داتاشیوە و چوارچێوە و ناسنامەی ساختەیان بۆ داناوە، کە بە ڕاستیی ستەمێکی گەورەیان کردووە و ناحەقییان تۆمارکردووە؛ چونکە نەدەبوو وەها هەڵەیەکیان بەسەرداتێبپەڕێت.

---

٥١ ـ ربيع الأبرار وفصوص الأخبار، الزَّمَخشري: ١/ ٣٦٤. التذكرة الحمدونية، ابن حمدون: ٩/ ٤١٩.

## دووەم/ كورد لە دیدگای بەشێك لە فارسەكانەوە:

لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە فارسەكان كوردیان وەك لقێك لـە خۆیـان ئـەژماردووە، كەچی هێشتا كـورد لـە ئاسـتی خۆیانـدا نـابینن و وەك بەشـێكی ڕاسـتەقینە لـە خۆیان مامەڵەیان لەگـەڵ ناكـەن. لێرەدا و لـە گۆشـەنیگای چـەند زانایەكیانـەوە هەڵوێستیان لەمەڕ كورد دەخەینەڕوو:

١ـ پێشـەوا (غـەزالی –كـە بـە ڕەگـەز فارسـە–)، لـە چـەند شـوێنێكی كتێبـی (ئیحیا)دا باسی كورد بە ئەم چەشنەی خوارەوە دەكات.

وەك سەبارەت بە ڕێگەچارەكانی دەستبەرداربوون لە تـەماع و دنیاپەرسـتیی، دەڵێـت: ((الرابـع: أن يُكثـر تأمّلـه في تـنعُّم اليهـود والنصـارى، وأراذل النـاس، والحَمْقى من الأكـراد والأعـراب الأجـلاف، ومَـن لا دِيـن لهـم ولا عقـل. ثـم ينظـر إلى أحوال الأنبياء والأولياء، وإلى سَمْت الخلفاء الراشـدين وسـائر الصـحابة والتـابعين، ويستمع أحاديثَهم ويُطالِع أحوالَهم. ويُخيِّر عقلَه بـين أن يكـون علـى مُشـابَهة أراذل النـاس، أو علـى الاقتـداء بمـن هـو أعـزُّ أصـناف الخلـق عنـد الله))[٥٢]. واتـە: زۆر تێـڕابمێنن لـە ئـەو نـاز و نیعمەتـەی كـە فەلـە و جووەكـان و خەڵكـە بێبـەها و گەمژەكان لە كورد و عەرەبە دەشتەكیی و بێدین و بێعەقڵەكان تێیدان.

لێرەدا بە ڕوونیی دیارە، پێشەوا (غەزالی) كوردی پێشخستووە و كردوونیەتە پێشەنگ لە نمونەی خراپییدا.

دەربارەی چارەسەری تووڕەیی، دەڵێت: ((بل ينبغي أن يعالَج هذا الجاهلُ بأن تُتْلى عليه حكاياتُ أهل الحِلم والعفو، وما استُحسِن منهم من كَظْم الغَيْظ، فإنّ ذلك

---

٥٢ ـ إحياء علوم الدين: أبو حامد الغزالي، بتخريج الحافظ العراقي: ٣/ ٢٤٣.

منقولٌ عن الأنبياء والأولياء والحكماء والعلماء وأكابر الملوك الفُضلاء. وضدُّ ذلك منقولٌ عن الأكراد والأتراك والجهلة والأغبياء الذين لا عقولَ لهم ولا فضلَ فيهم))[٥٣].

واته: دەبێت چارەی ئەم نەفامە بکرێت بە ئەوەی چیرۆکی ئارامگران و لێبوردەکانی بەسەردا بخوێنرێتەوە؛ چونکە ئەمە لە گەورەپیاوانی وەك پێغەمبەران و دانایان و زانایان و پیاوچاکان و پاشا گەورەکانەوە گێڕدراوەتەوە، پێچەوانەی ئەمەش لە کورد و تورك و نەزان و نەفامە بێعەقڵە بێفەزڵەکانەوە وەرگیراوە.

لێرەشدا دیسان کوردی لە خانەی یەکەمی نەزان و نەفاماندا داناوە و لە ئەم ڕووەوە سەرمەشقیی پێبەخشیوون.

ناوبراو لە چەندین شوێنی تردا باسی کورد دەخاتە بەرچاو و دەڵێت: ((وأما الجندية من الأتراك والتركمانية والعرب والأكراد والسراق والخونة وأكلة الربا والظلمة وكل من أكثر ماله حرام فلا ينبغي أن يتملك مما في أيديهم شيئا لأجل أنها حرام))[٥٤]. پێشەوا (غەزالی)، کورد و تورك و تورکمان و عەرەب، هاوشانی دز و چەتە و ستەمکار و سوخۆر و ماڵحەرامەکان دەکات و فەتوا دەدات کە نابێت مسوڵمانان شتیان لێبکڕن؛ چونکە شتی دەستیان حەرامە[٥٥].

وەك دەبینین پێشەوا (غەزالی) بە ڕەحمەت بێت، بە هیچ جۆرێك ئاماژەی بە ڕەفتاری ناپەسەند و مامەڵەی خراپ و بیر و باوەڕی چەوتی فارسەکان -هەر لە

---

٥٣ ـ هەمان سەرچاوە: ٣/ ١٧٢ ـ ١٧٣.

٥٤ـ إحياء علوم الدين: ٢/ ٣٥٦.

٥٥ـ لە ڕاستییدا گەر سەرنج بدەین دەبینین پێشەوا (غەزالی) وتەکانی بە ئەو ڕادەیەش زەق و ئاڵۆز نییە، بەڵکوو ئەوەندە هەیە کوردی لە مەقامی زەمدا کردووەتە پێشەنگ، وەگەرنا گەلانی تریشی ناوهێناوە و پێکەوە زەمیکردوون.

مەجوسیتیانەوە هەتا تەشەیوع- نەکردووە، هەرچەندە خراپ و نالەباریش بوون. ئەمەش لەبەرئەوەی خۆی فارس بووە، نەیتوانیوە بەسەر ئەو هەستەدا زاڵببێت. لە کاتێکدا وەك ڕوونە فارس لە مێژوودا زۆربەیان (مەجوسی) و ئەهلی (شیرك) بوون.

٢- (ئەبوفەتحی موتەریزی خوارزمی/ ئۆزبەکستانی[٥٦]) دەربارەی کورد ئاوا دەدوێت: ((الكَلبُ الكُرديّ مَنْسوبٌ إلى الكُردِ، وهم جِيلٌ مِن النّاس لهم خُصُوصِيَّةٌ في اللُّصُوصِيّة))[٥٧]. واتە: کورد خەڵکانێکن تایبەتمەندیی خۆیان هەیە لە دزییکردندا.

٣- جارێك (کیسرا)ی فارس لە (مەوبەزە)ی گەورەزانای ئایینی (زەردەشتی/ فارسی) پرسی: ((أيُّهما أكثر: الشياطين أو الناس؟ فقال: إن حَسَبْتَ الأكرادَ والرعاةَ والعامّةَ وأهلَ الأسواق من الناس فإن الناس له كثيرٌ))[٥٨]. واتە: مرۆڤ و شەیتان کامیان لە ڕووی ژمارەوە زۆرترن؟ (مەوبەزە) گوتی: ئەگەر کوردەکان و شوان و عامەی خەڵك و بازاڕییەکانیش حسابیکەین، ئەوە مرۆڤ زۆرترە.

وەك ئاشکرایە بەلای گەورەی زەردەشتیی و فارسەکانیشەوە، کورد سووك و بێنرخ تەماشاکراوە.

٤- (ڕاغیبی ئەصفەهانی[٥٩]) -کە لە ڕەگەزی فارسە- دەڵێت: منداڵێك ئەم ئایەتەی بە ئەم شێوازە بە هەڵە بۆ مامۆستاکەی خوێندەوە: ﴿عليها ملائكةٌ غِلاظٌ شِدادٌ يَعصُون الله ما أمرهم ولا يفعلون ما يؤمرون﴾. مامۆستاکە گوتی: ئەو شێوازە خوێندنەوە هەڵەیەی تۆ کورد دەگرێتەوە، نەك فریشتە. ((أن صبياً قرأ

---

٥٦- کە ئەوکات ئۆزبەکستان سەر بە خۆراسان بووە و خۆراسانیش بەشێك بووە لە فارس.

٥٧ - المُغْرِب في ترتيب المُعْرِب، المُطرِّزي: ٤٠٤.

٥٨ - نثر الدر الأبي: ٢/ ٥١، الباب ٣ حكم ونوادر للفرس.

٥٩- (ڕاغیبی ئەصفەهانی) تۆمەتی شیعەیی و ئیعتیزالیشی دەدرێتەپاڵ.

على معلم: "عليها ملائكةٌ غلاظٌ شدادٌ يَعصُون الله ما أمرهم ولا يفعلون ما يؤمرون".
فقال: هؤلاء أكراد لا ملائكة. والمقصود هو الآية: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾. سُورة التَّحْرِيم، الآية: ٦))[٦٠].

(ئیبن عەساکری دیمەشقی)یش لە (تەئریخ)ەکەیدا بە ئەم چەشنە دەیگێڕێتەوە: ((الصبي قرأ على المعلم: ﴿عليها ملائكةٌ غِلاظٌ شِدادٌ لا يَعصون الله ما أمرهم ويَفعلون ما يَأمُرون﴾. فقال له: يا ابن الخبيثة، ما هؤلاء إلا أكراد شَهْرَزُور، وليس هؤلاء ملائكةً))[٦١].

بەپێی ئەم ریوایەتەشیان، مامۆستا قوتابییەکەی وا حاڵیکردووە، ئەو فریشتە دڵڕەق و زبر و توندانەی لە دۆزەخدا خەڵکی سزادەدەن، کوردەکانن.

لێرەدا تێدەگەین مامۆستاکان بۆ پێکەنین و وەك کەرەستەی گاڵتەکردن وشەی کوردیان بەکارهێناوە و وایان لە قوتابییەکان گەیاندووە ئەوانەی هەمیشە نافەرمانیی خودا دەکەن کوردن؛ چونکە منداڵەکە وشەی (لا)ی لە ﴿لا يَعْصُونَ﴾ لابرد و کردی بە پێشگر بۆ وشەی: ﴿وَيَفْعَلُونَ﴾. بە ئەمەش واتای ئایەتەکە پێچەوانە دەبێتەوە.

---

٦٠ ـ محاضرات الأدباء، الراغب الأصفهاني: ١/ ٥٤.

٦١ ـ تأريخ دمشق، ابن عَساكر: ٦٨/ ٧٣.

## سێیەم/ کورد لە دیدگای ڕۆمەکانەوە:

لە ئەم بارەیەوە تەنها ئەم گوتەیەی شێخ (شەهابەدین)ی ناسراو بە (یاقوتی حەمەوی –کە بە ڕەچەڵەك ڕۆمییە) دەخەینە ڕوو. کە دەربارەی کورد دەڵێت:

((إلا أن الأكراد في جبال تلك النواحي على عادتهم في إخافة أبناء السبيل وأخذ الأموال والسرقة، ولا ينهاهم عن ذلك زجر ولا يصدهم عنه قتل ولا أسر، وهي طبيعة للأكراد معلومة وسجية جباههم بها موسومة))[٦٢]. واتە: کوردان لە ئەو شاخانەدا وەك نەریتی خۆیان، سەرقاڵی ترساندنی ڕێبواران و ماڵبردن و دزی و تالآنین، نە بە قەدەغەکردن و ڕێلێگرتن وازدەهێنن، نە بە کوشتن و بەندکردن، بەڵکوو ئەمە سروشتێکی ئاشکرای کوردانە و نەخشێکە بە ناوچاوانیانەوە.

خۆ بێگومان لە ناو کورددا –وەك سەرجەم گەلانی دنیا– هەڵگری لە ئەو خەسڵەتانە هەن، بەڵام گشتاندنی بەسەر تەواوی نەتەوەکەدا، تاوان و ستەمێکی گەورەیە.

ئەمە لە کاتێکدا (یاقوتی حەمەوی)، خۆی لە سەردەمی سولتان (صەلاحەدینی ئەیوبی)دا ژیاوە و بە باشیی ئاشنای نەریتە جوان و ڕەسەنەکانی کورد بووە!

گشت ئەم هەڵوێست و بۆچوونانەی سەرەوە، وەکو گوتمان، هی زانایانی مسوڵمان بوون. وە ئێمە بۆیە تەنها ئەم بۆچوونانەمان تۆمارکرد؛ چونکە کاری ئێمە لە بازنەی شەریعەت و ئیسلامدا دەسوڕێتەوە. وەگەرنا بێگومان دید و تێڕوانینی نامسوڵمانەکان زۆر لە هی مسوڵمانەکان نەرێنی تر و توندترە. لە ئەمبارەیەوە تەنها ئەم گوتەیەی (مەلای گەورە) دەگوازینەوە، کە لە

---

٦٢ ـ معجم البلدان، ياقوت بن عبد الله الحموي أبو عبد الله: ٣/ ٣٧٦.

تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ((لە وەقتی ئیستیلای ئینگلیز، حاکمی سیاسیی کۆیە "ڕەندیل" ناو، تەماشای ئێمەی ئەکرد، لە قیام و قوعود و ئاداب و خواردن و لیباسی ئادەمییانە تەعەجوبی ئەکرد، ئەیوت: لە مەکتەب ئێمەیان دەرس ئەدا، کورد قەومێکن وەحشیی، ئادەم خۆر، وەك گورگی هار))[٦٣].

وەك دەبینین، ئینگلیزەکانیش هەر لە منداڵییەوە نەوەکانیان بە ڕق و قینی کوردەوە گۆش کردووە، لە بری ئەوەی وانەکانی یەکسانی و ڕێز و مافی مرۆڤ و مافی گەلانی جیاوازیان فێر بکەن، بەو چەشنە تۆوی ڕقیان لە دڵیاندا بەرامبەر بە کورد چاندووە.

---

٦٣ ـ تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٢/ ٣١٢.

## چوارەم/ کورد لە دیدگای بەشێك لە تورکەکانەوە:

(ئیسماعیل حەقی ئیستانبولی) کە خاوەنی تەفسیری (روح البیان)ە و تورکە. لە بارەی کوردەوە دەڵێت: ((«قال ابن عمر رضي الله عنهما: إن الذي أشار بإحراقه رجل من أعراب العجم يعني من الأكراد». ولعمري أنهم لفي فسادهم وجفائهم وغلوهم في تعذيب الناس بعد يقدمون ولا ينفكون عن ذلك ما ترى للإسلام الذي هو دين إبراهيم الخليل عليهم أثراً في خلق ولا عمل خلقهم نهب أموال المسلمين وعلمهم ظلم وسرقة وقتل وقطع الطريق والله ما هؤلاء بأهل الملة الغراء لا كثر الله في الناس مثل هؤلاء إياك والمصاحبة بأصلحهم والمرور ببلادهم))[٦١]. واتە: ئەو کەسەی پێشنیازی سووتاندنی حەزرەتی (ئیبراهیم)ی کرد، کوردێك بوو. بە گیانی خۆم، هەتا ئێستاش کوردان لە خراپە و دڵڕەقیی و خەڵکسزاداندا بەردەوامن، ئەو دینە پاکەی (ئیبراهیم خەلیل) بۆی هێنان هیچ کاریگەرییەکی لەسەریان نەبوو. ڕەفتاریان تاڵانییە و کرداریان ستەم و دزی و کوشتن و جەردەییە. ئەوانە خودا بە زیادیان نەکات، سوێند بە خودا سەر بە دینی پاك نین. وریابە هاوڕێیەتیی باشترینیان نەکەیت و بە وڵاتیشیاندا گوزەر نەکەیت!

بۆ وەڵامی ئەم تۆمەتە، دەچینە خزمەت (مەلای گەورە)، کە لە تەفسیرەکەیدا سەبارەت بە دەنگۆی پێشنیازی سووتاندنی حەزرەتی (ئیبراهیم) لەلایەن کوردێکەوە، دەڵێت: ((خوا ئینسانی درۆزن بە قوڕدا بدا، ناوی "لاهەیون"، قیلە "هدیر" بووە. حەقەن ئەوە لە ناو کوردەواری نییە، با وابێ، مەقسەدی چییە؟ زەمی کوردانە بێ مەعنا، ئەو هەموو سەییئاتی لە حەقی پێغەمبەری کرا، هەتا

---

٦١. تفسير روح البيان، إسماعيل حقي بن مصطفى الإستانبولي الحنفي الخلوتي: ٨/ ٣٠٢.

دائیر بە ناموسی مەعصومانەی لە تەرەف کوردان بوو، یا عەرەبان!!
"حسەین"ی سەبتی کێ کوشتی؟ ئەو ئەتفالە مەعصوومانە کێ هیلاکی کردن؟ کورد سەری "حسەین"ی بڕی؟ کورد "زەکەریا"ی بە مینشار شەق کرد؟ کورد ئیشارەی کرد بۆ سەربڕینی "یەحیا" بۆ کەیفی فاحیشەیێ؟ کێ ئیمامی "حەمزە"ی مەسولە کرد و جەرگی خوارد؟ سەبیئەی کوردان نەزەر بە ئەقوامی دی، ناخوێنرێتەوە))[٦٥].

لە ڕاستییدا دەبوو ئەدەب و ئسلوبی ڕاڤەکار و خزمەتکاری قورئانی پیرۆز لە ئاستێکی بەرزتر و شیاوتربایە، نەك بە ئەم جۆرەی (ئیسماعیل حەقی)!

لە کاتێکدا ڕاڤەکاری ناوبراو هاوڕێ و هاوچەرخی گەورەپیتۆلێ و هەلکەوتەی کەموێنەی نەتەوەکەمان بەدیعولزەمان مامۆستا (نورسی) بووە و بە چاوی خۆی جیهاد و خزمەت و خەمخۆرییەکانی مامۆستا و هاوڕێ و قوتابییە کوردەکانی دیتووە.

کاتێك سەرنج لە ئەم دوو کەسایەتییە (سەعیدی کوردی و، ئیسماعیل حەقی تورکی) دەدەین و بەراوردیان لە نێواندا دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت دڵپاکیی و ڕاستگۆیی و ویژدانی بەشێك لە کوردان و تێڕوانینی ئەوانی تر سەبارەت بە کورد گەلێك دوور و جیاوازن.

ئەم وتانەی (ئیسماعیل حەقی) لە کاتێکدایە، زۆرێك لە زانایان ڕیشە و ڕەچەڵەکی (ئەیجوج و مەئجوج) دەبەنەوە سەر تورك و، بە تیرەیەك لە ئەوانیان دادەنێن و، دەشڵێن: ئەو بەربەستە (سەدە)ی کە (زولقەرنەین) بۆ گەلانی ستەمدیدە و ژێردەستە بنیاتینا، بۆ پاراستنیان بوو لە دەست گەندەڵیی و دڕندەیی

---

٦٥ـ تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٢/ ٦٠٨.

و خراپیی تورك[٦٦]. ڕاڤەکاری قورئان پێشەوا (قورتوبی) لە ئەم بارەوە دەفەرمووێت: ((قال السدي والضحاك: «الترك شرذمة من يأجوج و مأجوج خرجت تغير، فجاء ذو القرنين فضرب السد فبقيت في هذا الجانب». قال السدي: «بني السد على إحدى وعشرين قبيلة، وبقيت منهم قبيلة واحدة دون السد فهم الترك» قاله قتادة. قلت: وإذا كان هذا فقد نعت النبي صلى الله عليه وسلم الترك كما نعت يأجوج ومأجوج، فقال عليه الصلاة والسلام: «لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون الترك قوما وجوههم كالمجان المطرقة يلبسون الشعر ويمشون في الشعر». وفي رواية: «ينتعلون الشعر». خرجه مسلم وأبو داود وغيرهما. ولما علم النبي صلى الله عليه وسلم عددهم وكثرتهم وحدة شوكتهم قال عليه الصلاة والسلام: «اتركوا الترك ما تركوكم»))[٦٧].

مێژوونووس (ئیبن ئەسیر)یش جۆرە دڵنیاییەکمان دەکات لە ئەوەی (یەئجوج و مەئجوج) تورکن و ئەمەش بە بۆچوونی دروست دادەنێت: ((وقد اختلفت الأقوال فيهم، والصحيح أنهم نوع من الترك لهم شوكة وفيهم شرّ، وهم كثيرون، وكانوا يفسدون فيما يجاورهم من الأرض ويخربون ما قدروا عليه من البلاد ويؤذون من يقرب منهم))[٦٨].

بەڵکوو بەشێك لە زانایان (مەغۆل و تەتار)یش بە زادەی تورك دادەنێن، دەچینە خزمەت تەفسیرەکەی مامۆستای (مودەریس)، کە لە ئەم باسەدا دەفەرمووێت: ((ذكر بعض المدققين في البحث عن تأصيلهم أن أصل المغول والتتر

---

٦٦. هەرچەندە ئەم جۆرە خوێندنەوانە بە شێوەیەکی ڕەهایی و دڵنیایی یەکلانەبووەتەوە و قابیلی قسەی جیاوازە.

٦٧ ـ تفسير القرطبي: ١١/ ٥٨.

٦٨ ـ الكامل في التاريخ، ابن الأثير: ١/ ٩٤.

من رجل واحد يقال له "تُرك" وهو نفس الذي سماه أبوالفداء باسم يأجوج ومأجوج، فيظهر من هذا أن المغول والتتر هم المقصودون بيأجوج مأجوج))[٦٩].

هەر لەبەر ئەم دابڕیین و سنووربەندییە تورك ناونراون بە (تورك)؛ چونکە کاتێك بە هۆی دەربەندەکەوە دابڕێنران لە گەلەکانی تر و تەرککران و خرانە پەراوێز و سنووربەندەوە. ئیتر بە ئەو ناوەوە ناونران. هەروەك (مەناوی) دەڵێت: ((وقيل: هم بنو عم يأجوج ومأجوج لما بني السد كانوا غائبين فتركوا لم يدخلوا معهم فسموا الترك))[٧٠].

لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لەسەربێت) ئاماژە بە ڕەقیی و توندیی و سەرسەختی تورك کراوە. وەك لە ئەم فەرموودە شیرینەدا هاتووە: «اتْرُكُوا التُّرْكَ مَا تَرَكُوكُمْ»[٧١]. واتە: واز لە تورك بهێنن و جەنگ و جیهادیان لەگەڵ مەکەن، مەگەر ئەوان لەگەڵتان بجەنگن.

زانایانی ڕاڤەکار لە ئەم فەرموودەوە ئەوە دەخوێننەوە کە تورك نەتەوەیەکی سەرسەخت و بەزەبرن، نیشتیمانیشیان سارد و کوێستانە، لەبەرئەوە پێغەمبەر ڕێگری یاوەرانی کرد لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیان. هەروەك (مەناوی)[٧٢] و، (سندی)[٧٣] و، (مەلا عەلی قاری)[٧٤] و، (عەزیمی ئابادی)[٧٥]، دەفەرموون: ((التُّرْك فَبَأْسهمْ شَدِيد وَبِلَادهمْ بَارِدَة)).

---

٦٩- مواهب الرحمن في تفسير القرآن، للشيخ عبدالكريم المدرس: ٥/ ٢١٠.

٧٠- فيض القدير: ١/ ١٥٢.

٧١- رواه أبوداود، برقم: ٤٣٠٤. والبيهقي في الكبرى، برقم: ١٨٣٧٨. والنسائي في الكبرى، برقم: ٤٣٨٥. والطبراني في الكبير، برقم: ٨٨٢.

٧٢- التيسير بشرح الجامع الصغير: ٢/ ١٤.

٧٣- حاشية السندي على النسائي: ٦/ ٤٤.

٧٤- مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح: ١٥/ ٤١٦.

هەروەها لەبەر ئەوەیش کە ئەوان -واتە تورکەکان- یەکەم گەلن دژ بە نەتەوەی عەرەب دەوەستنەوە و دەستەڵات و خێر و خۆشییەکانیان لێ زەوتدەکەن. وەك ئەمە ڕاشکاوانە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێت) هاتووە: «اتركوا الترك ما تركوكم فإن أول من يسلب أمتي ملكهم وما حولهم الله بنو قنطوراء»[76]. واتە: واز لە شەڕی تورك بهێنن هەتا ئەوان نەیەنە جەنگ و بەرانبەرتان نەوەستن؛ چونکە ئەوان یەکەم کەسن زەویوزار و خێروبێرتان لێ داگیردەکەن.

جا (بەنوقەنتورا) کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، مەبەست لێی ئەو کەنیزەکەیە کە حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خودایٖ لەسەربێت مارەیکرد و دواتر نەتەوەی (تورك) و نەتەوەی (چین)ی لێکەوتەوە. ((هي جارية إبراهيم الخليل ولدت له أولادا منهم الترك والصين))[77].

بۆ بەرچاوڕوونی زیاتری ناوەرۆك و واتای فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) دەچینە خزمەت چەند وتەیەکی زانایان لە سەردەمە جیاوازەکاندا و لە زاری ئەوانەوە چەند نەقڵێك دەربارەی (تورك) دەخەینەڕوو[78]:

پێشەوا (قورتوبی) کە لە سەدەی (شەش)ی کۆچییدا ژیاوە و ساڵی (٦٧١ك) وەفاتیکردووە، دەڵێت: ((وقد خرج منهم في هذا الوقت أمم لا يحصيهم إلا الله تعالى، ولا يردهم عن المسلمين إلا الله تعالى، حتى كأنهم يأجوج ومأجوج أو

---

٧٥- عون المعبود شرح سنن أبي داود: ١١/ ٢٧٦.

٧٦- رواه الطبراني في الكبير، الرقم: ١٠٣٨٩.

٧٧- مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، الملا علي القاري: ١٥/ ٤١٦. فيض القدير: ١/ ١٥٢.

٧٨- ئەڵبەت کە باس لە تورك دەکەین مەبەستمان بەشە خراپ و نالەبارەکەیەتی، وەگەرنا ئێمە بە شێوەیەکی گشتیی بڕیار نادەین و بێگومان ئەوانیش هەموویان وەکیەك نین. هەروەك ناڵێین هەموو کورد خەڵکانی باش و بژاردەن!

مقدمتهم))[٧٩]. واتە: لە ئەم کاتەدا لە نەتەوەی تورك گەلانێك پەیدابوون مەگەر تەنها خودا خۆی ئاماریان بکات، مەگەر هەر خۆیشی مسوڵمانان لە دەستیان بپارێزێت، وەك ئەوەی یەئجوج و مەئجوج بن، یان پێشەنگیی و پێشەکیی ئەوان.

هەروەها پێشەوا (ئیبن حەجەر) کە لە سەدەی (هەشتەم)دا ژیاوە و لە ساڵی (٨٥٧ك) وەفاتیکردووە، دەڵێت: ((قد ظهر مصداق الخبر))[٨٠]. واتە: مەبەست و ناوەڕۆکی فەرموودەکە هاتووەتەدی...

مامۆستای گەورەی کورد (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)یش دەفەرمووێت: ((ومع ملاحظة ما ذكرناه لم يسلب الأمة الإسلامية مكلها إلا هؤلاء))[٨١]. واتە: بە سەرنجدان لە مێژوو بۆمان دەردەکەوێت کە سامان و سەروەتی ئوممەی ئیسلامیی تەنها ئەوان داگیریانکردووە. هەروەها دەفەرمووێت: ((وقد ذكر المؤرخون أن هذه الأمة كانت تغير قديما فى أزمنة مختلفة على الأمم المجاورة لها فكم أفسدوا وقلبوا الأمم قلبا قبل زمن النبوة ودمروا العالم تدميرا؟ فهم مفسدون فى الأرض بنص القرآن وشهادة التأريخ))[٨٢].

وتەی زانایان زۆر و زەبەندە لەسەر شاڵاو و پەلامار و زەبر و زەنگی -بەشێك لە- تورکەکان بۆسەر گەل و نەتەوەکانی تر، بەڵام بە ئەم چەند دێڕەی شێخی (مەناوی) بەسندە دەکەین و دەست لە ئەم باسە هەڵدەگرین، کێیش زیاتری دەوێت لە ئەم بارەیەوە بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی تەفسیر و مێژوو زیاتری چنگدەکەوێت.

---

٧٩ـ تفسير القرطبي: ١١/ ٥٨.

٨٠ـ فيض القدير: ١/ ١٥٣.

٨١ـ مواهب الرحمن في تفسير القرآن: ٥/ ٢١٢ ـ ٢١٣.

٨٢- مواهب الرحمن في تفسير القرآن: ٥/ ٢١٠ ـ ٢١١.

((قال ابن دحية: خرج سنة سبع عشرة وستمائة جيش منهم وهم التتر عظم منهم الخطب والخطر وعم الضرر وقضى لهم من قتل الأنفس المؤمنة الوطر فقتلوا من رواء النهر وما دونه من جميع بلاد خراسان ومحوا آثار ملك بني ساسان وهذا الجيش ممن يكفر بالرحمن ويرى أن الخالق المصور هو النيران وملكهم يعرف بجنكزخان ومن أمثالهم اترك الترك إن أحبوك أكلوك وإن أبغضوك قتلوك وقال ابن حجر: قد ظهر مصداق الخبر وروى أبو يعلى عن معاوية بن خديج قال: «كنت عند معاوية فأتاه كتاب عامله أنه وقع بالترك فهزمهم فغضب، ثم كتب إليه: لا تقاتلهم حتى يأتيك أمري فإني سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: إن الترك تجلي العرب حتى تلحقها بمنابت الشيح فأنا أكره قتالهم لذلك». وقاتل المسلمون الترك في خلافة بني أمية وكان ما بينهم وبين المسلمين مسدودا إلى أن فتح شيئا فشيئا وكثر السبي منهم وتنافس فيهم الملوك لما فيهم من الشدة والبأس حتى كان أكثر عسكر المعتصم منهم ثم غلب الأتراك على الملك فقتلوا ابنه المتوكل ثم أولاده واحدا بعد واحد إلى أن استولى على الملك الأتراك طائفة بعد طائفة إلى آل سلجوق فخرج عليهم في المائة الخامسة الغز فخربوا البلاد وقتلوا العباد ثم جاءت الطامة الكبرى بالتتار فكان خروج جنكزخان بعد الستمائة فاسعرت بهم الدنيا نارا سيما المشرق حتى لم يبق بلد منه حتى دخله شرهم ثم كان خراب بغداد وقتل المعتصم آخر الخلفاء بأيديهم سنة ست وخمسين وستمائة ثم لم تزل بقاياهم يخربون إلى أن كان آخرهم التمرلنك فطرق الديار الشامية وخرب دمشق حتى صارت خاوية على عروشها ودخل الروم والهند وما بين ذلك وطالت مدته حتى أخذه الله وتفرق بنوه في البلاد وظهر بجميع ذلك مصداق الحديث (طب) وكذا في الأوسط والصغير، عن أبي عبد الرحمن عبد الله بن مسعود، قال الهيتمي: فيه

مروان بن سالم متروك وذكره في موضع آخر وقال: فيه عثمان بن يحيى الفرقسابي لم أعرفه وبقية رجاله رجال الصحيح انتهى))[٨٣].

ماوەتەوە بڵێین: ئەم جۆرە جەدەل و کێشمەکێشمانە کە شوێنەواری خراپیان دوای خۆیان جێهێشتووە، بە پلەی یەکەم ئەو کەسانە لێی بەرپرسن کە جوڵێنەر و پاڵنەری ئەو بیرەن، لە دنیادا هاوبەشی تاوانی دەرهاویشتە و کاردانەوەکانیانن و دواڕۆژیش دەبێت وەڵامگۆی لێپرسینەوەی خواییبن دەرهەق بە ئەو هەموو تۆمەت و ناڕەوایی و ناڕاستییانە.

لەبەرئەوە پێویستە ئەم تێگەشتنانە ڕاستبکرێنەوە و بێبنەمایی ئەو سیما شێوێنراوەی کورد ئاشکرابکرێت، کە بیانییەکان وێنایانکردووە.

ئەم دید و تێڕوانینە ئەگەر لایەنێکی پەیوەندیی بە دەمارگیریی نەتەوەییەوە هەبێت، ئەوا لایەکەی تری پەیوەستە بە بیری یەکترسڕینەوە و هەژاریی ئاستی ڕۆشنبیریی و لاوازیی گیانی پێکەوە ژیان و یەکتری قبوڵکردن، کە یەکێکە لە سیما هەرە دیارەکانی ئیسلام.

لە هەمان کاتدا بەدحاڵیبوونە لە ئەو ئایینە پاك و جوانەی کە هەموو مرۆڤێك وەك یەك تەماشادەکات و جیاوازیی چینایەتیی و ڕەگەزایەتیی وەلادەنێت و ڕەگی دەمارگیریی دەبڕێت و هەمووان بەبێ جیاوازیی دەخاتە تای تەرازوویەك.

چونکە ئێمە گەلێکین، نەتەوە و خاکمان بەڕێز و پیرۆزە و مێژوویەکی دێرین و خاوێنمان هەیە. هەروەك زانا و ئەکادیمای ڕوسیی (ن.یا.مار)، کە توێژەرە لە کاروباری کورد و (قەوقاز)، وەسفی کورد دەکات بە: ((قردێلەی سەری مێژوو! چونکە ئەوەندە دیار و بەرچاوە لە مێژوودا))[٨٤].

---

٨٣ـ فيض القدير: ١/ ١٥٢ ـ ١٥٣.

٨٤ ـ مێژووی کوردستان: لازاریف.ن، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵا سەنگاوی: ١٩.

خودای بەرز و باڵایش دەفەرموویّت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. سورة الحجرات، الآية: ١٣. لە هەمان سورەتدا و لە ئایەتەکانی (١٠ و ١١)دا دەفەرموویّت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.

پێغەمبەری پێشەوایش (درووودی خوای لەسەربێت) لە وتاری ماڵئاواییدا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ، ألاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، ألاَ وَإِنَّ أبَاكُمْ وَاحِدٌ، ألاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلاَ أسْوَدَ عَلَى أحْمَرَ، وَلاَ أحْمَرَ عَلَى أسْوَدَ، إِلاَّ بِالتَّقْوَى»[٨٥]. واتە: هیچ گەورەییەك بۆ عەرەب بەسەر عەجەم و عەجەم بەسەر عەرەبەوە نییە، مەگەر بە تەقوا، ڕێزدارترینتان لای خودا تەقوادارترینتانە.

لەسەر ئەم بنەما و پێوەدانگە دادوەرییانەیە، دەبینین (ئەبولەھەب) لەگەڵ ئەوەی مامی پێغەمبەری خودایە و لە ڕەگەزی عەرەبە و لە هۆزی قورەیشە، کەچی خودای گەورە نەفرەتی لێکردووە و وەبەر خەشمی خۆی خستووە. بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای ڕیشە و ڕەچەڵەك و نەتەوەیدا. وەك دەفەرموویّت: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾. لە ئەولاشەوە (سەلمان)ێکی عەجەمی فارسی، کە هیچ پەیوەندییەکی نەتەوەیی و ڕەگەزییان لە نێواندا نییە. پێغەمبەری پێشەوا (درووودی خوای لەسەربێت)، بە ئەندامێکی خێزانی خۆی هەژماردووە و

٨٥ ـ رواه أحمد، برقم: ٢٣٥٣٦. والبيهقي في الشعب، برقم: ٥١٣٧. والطبراني في الكبير، برقم: ١٤٧٢٤.

پێیفەرمووە: (سەلمان) لە ئێمە و لە ئال و بەیتی ئێمەیە. «سلمان منا أهل البيت»[86].

شاعیریش ئەم تابلۆیەی بە جوانیی لە دوو بەیتدا ڕێکخستووە، کە دەفەرموێت:

لعمرك ما الإنسان إلا بدينه        فلا تترك التقوى اتكالا على النسب

لقد رفع الإسلام سلمان فارس        وقد وضع الشرك النسيب أبا لهب[87].

ئەم دەقە شەرعییانە ئەوەمان بۆ بەیاندەکەن، کە هیچ مرۆڤێك لە ئەوی تر باشتر و ڕێزدارتر نییە، مەگەر لە خوداناسییدا. هەروەها دەریدەخەن کە شێواندن و لەکەدارکردنی هیچ نەتەوە و هۆزێك، تەنانەت هیچ مرۆڤێکیش دروست نییە، بەڵکو ناڕەوا و نەگونجاوە.

ئەوەی خستمانەڕوو نە دەمارگیریی کوێرانەیە، نە بوهتانکردن، نە بێڕێزیی و ناوزڕاندنە، بەڵکوو نیشاندانی هەندێك بۆچوونی ناڕاست و سەرپێییانەی بەشێك لە زانایانە بەرانبەر ئێمەی کورد، کە قابیلی هەڵسەنگاندن و هەڵوێستە لەسەر کردنە. بێگومان ئەمانە نە فەرمایشتی خودان، نە هی پێغەمبەر، بەڵکوو قسەی مرۆڤن. زانراویشە جگە لە پەیامبەر (دروودی خوای لەسەربێت)، هیچ کەس و بۆچوونێك پیرۆز و پارێزراو نییە و لەسەر ئیسلامیش ماڵ نییە.

ڕەخنە و سەرنجیشمان لەسەر ئەو بۆچوونە ناڕەوایانەی سەرەوە، بە پشتبەستن و لەسەر بنەمای ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) خستەبەرچاو، کە ئیلهامبەخشی بەرگرییکردنێکی دروست و ژیرانەیە لە هەر نەتەوەیەك، بەڵام بەبێ زیادەڕەویی. وەك دەفەرموێت: «عَنْ فُسَيْلَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ

---

٨٦ ـ رواه الحاكم في مستدركه، برقم: ٦٥٣٩. والطبراني في الكبير، برقم: ٦٠٤٠.

٨٧- جامع العلوم والحكم، ابن رجب الحنبلي: ٣٤٨.

أَبِي، يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ مِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِينَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ»[88]. واته: باوكی (فوسەیلە) لە پێغەمبەری پرسی:

- ئایا مرۆڤ هۆزەكەی خۆی خۆشبوێت بە دەمارگیریی هەژمارە؟

- فەرمووی: نەخێر، بەڵكوو دەمارگیریی ئەوەیە مرۆڤ یارمەتییدەربێت بۆ هۆزەكەی لەسەر تاوان و ستەم.

هەروەها دەفەرموێت: «خير القوم المدافع عن قومه ما لم يأثم»[89]. واته: باشترینی ناو هۆز ئەو كەسەیە بەرگریی لە هۆزەكەی خۆی دەكات، بە مەرجێك توشی تاوان نەبێت لەسەری.

دیسان دەفەرموێت: «انصر أخاك ظالما أو مظلوما. فقال رجل: يا رسول الله أنصره إذا كان مظلوما، أفرأيت إذا كان ظالما كيف أنصره؟ قال: تحجزه أو تمنعه من الظلم فإن ذلك نصره»[90]. واته: براكەت ئەگەر ستەمكار بوو، یارمەتیی بدە بە ئەوەی دەست لە ستەم هەڵبگرێت، ئەگەر ستەملێكراو و مافخوراویش بوو، ئەوا دەستبارییە بۆ ئەوەی ستەمەكەی لەسەر هەڵبگریت و مافەكەی بۆ بگێڕیتەوە.

## باسی دووەم
## دید و تێڕوانینی كورد بەرانبەر ئەوانی تر

---

٨٨. رواه أحمد، برقم: ١٧٤٧٢. والطبراني، برقم: ٩٥٥. والبيهقي في شعبه، برقم: ٧٦٧٥. وابن ماجه، برقم: ٣٩٤٩.

٨٩. أخرجه الطبراني في الكبير، برقم: ٤١٣٠. وأبونعيم في المعرفة، برقم: ٢٢٢٤.

٩٠. رواه البخاري، الرقم: ٦٥٥٢.

لێرەدا دەبێت گلەییەکی بەجێ لە خۆمان بکەین، کە ئێمەی کورد هەمیشە لە بەرانبەر گەلانی تردا خۆمان بە کەم و بچووك و پاشکۆ زانیوە. ئەمەش یەکێکە لە خاڵە لاواز و نەرێنییەکانمان.

بۆ زیاتر چەسپاندنی ئەم ڕاستییە چەند نموونەیەك دەخەینەبەرچاو:

١ـ (شێخ ئیبن تەیمیە) -کە بە ڕەچەڵەك کوردە-، دەمارگیرییەکی سەیری بۆ عەرەب نیشاندەدات و دەڵێت: ((فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم عبرانيهم وسريانيهم رومهم وفرسهم وغيرهم ... وليس فضل العرب ثم قريش ثم بني هاشم بمجرد كون النبي صلى الله عليه و سلم منهم وإن كان هذا من الفضل، بل هم في أنفسهم أفضل وبذلك ثبت لرسول الله صلى الله عليه و سلم أنه أفضل نفسا ونسبا وإلا لزم الدور.

ولهذا ذكر أبو محمد حرب بن إسماعيل بن خلف الكرماني صاحب الإمام أحمد في وصفه للسنة التي قال فيها هذا مذهب أئمة العلم وأصحاب الأثر وأهل السنة المعروفين بها المقتدى بهم فيها وأدركت من أدركت من علماء أهل العراق والحجاز والشام وغيرهم عليها فمن خالف شيئا من هذه المذاهب أو طعن فيها أو عاب قائلها فهو مبتدع خارج عن الجماعة زائل عن منهج السنة وسبيل الحق وهو مذهب أحمد وإسحاق بن إبراهيم بن مخلد وعبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور وغيرهم ممن جالسنا وأخذنا عنهم العلم، فكان من قولهم أن الإيمان قول وعمل ونية وساق كلاما طويلا إلى أن قال ونعرف للعرب حقها وفضلها وسابقتها ونحبهم لحديث رسول

الله صلى الله عليه و سلم: «حب العرب إيمان وبغضهم نفاق» ولا نقول بقول الشعوبية وأراذل الموالي الذين لا يحبون العرب ولا يقرون بفضلهم فإن قولهم بدعة وخلاف))[٩١].

به کورتیی واته: ڕەگەزی عەرەب لە جگە خۆیان باشترن، ئەمەش لەبەرئەوە نا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) عەرەبە، بەڵکوو هەر لە بنەڕەتدا خۆیان باشترینن.

دواتر دەڵێت: هەرکەسێکیش تانە لە ئەم قسەیە بدات و ڕەخنەی لێبگرێت و پێچەوانەی ئەمە باوەڕی بێت، ئەوە بیدعەچییە و لە کۆمەڵی مسوڵمانان و ڕێبازی پێغەمبەر دەرچووە.

دواتر شێخ درێژە بە گوتەکانی دەدات و دەڵێت: ((وذهبت فرقة من الناس إلى أن لا فضل لجنس العرب على جنس العجم وهؤلاء يسمون الشعوبية لانتصارهم للشعوب التي هي مغايرة للقبائل كما قيل القبائل للعرب والشعوب للعجم، ومن الناس من قد يفضل بعض أنواع العجم على العرب، والغالب أن مثل هذا الكلام لا يصدر إلا عن نوع نفاق إما في الاعتقاد وإما في العمل المنبعث عن هوى النفس مع شبهات اقتضت ذلك ولهذا جاء في الحديث «حب العرب إيمان وبغضهم نفاق» مع أن الكلام في هذه المسائل لا يكاد يخلو عن هوى للنفس ونصيب للشيطان من الطرفين وهذا محرم في جميع المسائل))[٩٢].

لێرەدا شێخ خەسڵەتی دووڕوویی و ئارەزووپەرستیی دەداتەپاڵ ئەو کەسانەی عەجەم لە عەرەب بە باشتر دەزانن.

---

٩١ ـ اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم، للشيخ بن تيمية الحراني: ١٤٧.

٩٢ ـ المصدر السابق: ١٤٨.

٢ـ کەڵەزانای کورد و پیتۆڵی سەردەم، مامۆستا (نورسی)، لە چەند جێگەیەکدا لە گەورەیی تورك دەدوێت و فەزڵیان دەدات بەسەر گەلانی تر و تەنانەت کوردیشدا.

وەك دەڵێت: ((والأتراك –كشعب ممتاز فی كل العصور– أینما كانوا فی أقطار الأرض هم مسلمون))[٩٣]. واتە: تورکەکان وەك گەلێکی نایاب لە هەر چەرخێك و لە هەر کوێیەکدابن مسوڵمانن.

دووبارە دەڵێت: ((والأتراك مسلمون في أنحاء العالم كافة، فقوميتهم مزجت بالإسلام لا يمكن فصلهم عنه. فالتركي يعني المسلم. حتى إن غير المسلم منهم لا يكون تركيا. وكذلك العرب فإن قوميتهم مزجت بالإسلام أيضا))[٩٤]. بە واتای: تورك واتە مسوڵمان، ئەگەر نامسوڵمانێکت لێبینین بزانە ئەوە تورك نییە.. عەرەبەکانیش هەر ئاوا تێکەڵبوون بە ئیسلامەوە..

دیسان دەڵێت: ((قبل كل شيئ أنا مسلم، و ولدت فی كردستان. لكني خدمت الترك، وإن تسعا وتسعين من خدماتي النافعة حصلت للترك، وأمضيت معظم عمري بين الترك، وأخلص إخواني وأصدقهم ظهروا من الترك، وأستطيع أن أشهد ألفا من شباب الترك الحقيقيين الشهميين، بأني خدمت الملة التركية أكثر من ألف من هؤلاء الذين يظهرون أنفسهم محبين لقوميتهم وينعتونني بالكردي))[٩٥]. واتە: من لە سەدا نەوەد و نۆی خزمەتەکانم بۆ تورك بووە، زۆربەی تەمەنم لە ناو ئەواندا بەسەربردووە، دڵسۆزترین و ڕاستگۆترین هاوڕێکانیشم لە ئەوانە...

---

٩٣ـ سيرة ذاتية: بديع الزمان سعيد النورسي، ترجمة: إحسان قاسم الصالحي: ٣١١.

٩٤ـ سيرة ذاتية، بديع الزمان سعيد النورسي: ٥٦٥.

٩٥ـ سيرة ذاتية، بديع الزمان سعيد النورسي: ٣٠٨ ـ ٣٠٩.

ئەمە لە كاتێكدا بەشێك لە توركەكان جاروبار مامۆستايان بە (سەعيدی كوردی) ناوهێناوە، ئەمەش لەبەرئەوە بووە بە ئەو نازناوە كوردييەوە ناشيرين و بێزراوی بكەن.

لێرەدا شياوە بەراوردێك لە نێوان زمان و ئەدەبياتی مامۆستا (نورسی) كورد و (ئيسماعيل حەقی) توركدا بكەين، كە جەنابی (نورسی) بە تێگەيشتنێكی پاك و ژيرانە و ئاينييانە ديدی خۆی لە هەنبەر نەتەوەی (تورك) خستووەتەڕوو و دەربارەيان دەفەرمووێت: ((وكانوا إخوة حققيين للأتراك في الوطن، ورفاقهم في سوح الجهاد منذ سالف العصور))[96]. واتە: كوردەكان برای ڕاستەقينەی توركەكان بوون لە ئەم نيشتمانەدا و چەندين سەدە هاوڕێی گۆڕەپانی جيهاديان بوون.

هەروەها دەفەرمووێت: ((إنني على علاقة وثيقة جدا بمؤمني هذا الوطن الذين يسمون بالأتراك المرتبطين ارطباتا قويا، وبأخوة صادقة أبدية وحقيقية بالأمة الإسلامية.. وأكنّ حبا عميقا و ولاء بفخر وإعتزاز –باسم الإسلام– لأبناء هذا الوطن الذين رفعوا راية القرآن خفاقة عزيزة في ربوع العالم أجمع زهاء ألف عام))[97]. واتە: من ڕەبت و پەيوەندييەكی زۆر توندوتۆڵم لەگەڵ بڕوادارانی ئەم نيشتيمانەدا هەيە كە پێياندەگوترێت تورك. ئەوان برايەكی ڕاستەقينە و ڕاستگۆ و هەميشەيين و خۆشەويستيی و دۆستايەتييەكی زۆری شاراوەم بەرانبەريان هەيە...

---

٩٦ـ المكتوبات: بديع الزمان سعيد النورسي، ترجمة: إحسان قاسم الصالحي: ٥٤٧.

٩٧ـ المكتوبات، بديع الزمان سعيد النورسي: ٥٣٤.

٣- (شێخ عەبدوڵای بێتوشی)، زانا و وێژەوان و شاعیری گەورەی کورد، بە ئەدەبیاتێکی ناسك و جوان دەربارەی نیشتیمانپەروەریی خۆی دەدوێت و دەڵێت[٩٨]:

أنا كرديٌّ عن أم وأب غذياني حبّ قومي بلبان الأدب

علّماني حبَّ قومي مثلما علّماني حبَّ قوم العرب.

واتە: من کوردم و دایك و باوکیشم کوردن. گەورەیانکردووم بە شیری ئەدەب لەسەر خۆشویستنی گەلەکەم. فێریانکردووم هۆزەکەی خۆمم خۆشبوێت، وەك چۆن فێریانکردووم هۆزی عەرەبم خۆشبوێت.

وەك دیارە، ڕێزی نەتەوەی عەرەبی هاوتای ڕێز و خۆشەویستیی بۆ نەتەوەکەی خۆی داناوە.

کە لە ڕاستییدا ئەمە نمونەی ئەدەب و ڕێزە، کە ئێمەی کورد هەمانە، نەك گاڵتە و سوکایەتییکردن و خۆفەرزکردن.

٤- هەروەها گەورەزانایەکی وەك (سەید حەسەن)ی ناسراو بە (مەلا ئەبوبەکری موصەنیف)، لە بەرانبەر ئەزیەت و زیانپێگەیاندنی بەشێك لە (جافەکان)، لە کاتی هاتوچۆ و گوزەرکردنی بە دەشتی شارەزووردا، تەواوی کوردانی خستووەتە ناو قەفەسی ستەم و بەدناوییەوە. هەتا ئەو ئاستەی بڵێت:

لو كان في الجنة أكراد جارا          لتركت الجنة واخترت نارا[٩٩].

---

٩٨- ئیسلام و کوردەواریی: محەمەد ئەمین عەبدولحەکیم، گۆڤاری پەیامی زانایان، ژمارە: ٧، زستانی ٢٠٠٤، ل: ٤٨.

٩٩- بڕوانە/ ڕۆژگاری ژیان یادداشت و بیرەوەرییەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، ئامادەکردن و لەسەرنووسینی: ڕەئوف مەحمودی: ٤٩.

واتە: ئەگەر کوردەکان لە بەهەشتدا دراوسێمبن، ئەوا من لە بەهەشت هەڵدێم و دەچمە دۆزەخەوە.

٥- شاعیری گەورەی گەلەکەمان (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) کە هەر کوردێکی دیبێت، لە هەر پلە و ئاستێکدا بووبێت، هەجووی کردووە و دایشۆریوەتەوە. وەك خۆی دەڵێت (تیغی زمانی موو دەکات)، بەڵام کە باسی عەرەب دەکات بە ئەم چەشنە دەدوێت:

(عەرەب) ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن ئەمما

(صەلاحەدین) کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو.

وەك دەبینین ئەفزەلیەتی بەخشیوەتە عەرەب و لە بری هەجوو -کە لە تایبەتمەندیی شیعرەکانیەتی-، بە ئەفزەڵی داناوون.

وەك دەبینین تەواوی کوردی خستووەتە ناو بازنەی تۆمەتی بەدخویی و ستەمکارییەوە، کە ئەم گشتاندنە تەواو ناڕەوا و ناتەواوە. بە تایبەت بۆ ناوبراو کە خۆی کوردێکی ڕەسەنە و هەر هیچ نەبێت زانیویەتی لە ناو نەتەوەکەی خۆیدا هەزاران کەڵەپیاوی وەك خۆی بوونی هەبووە و هەیە. ئیتر نازانم بە چ حەقێك هەمووانی بەدناوکردووە!

ئەمانەی سەرەوە مشتێك بوون لە نمونەی ئەو خۆبەکەم و بچوککگرتنەی زانا و کەسایەتییە کوردییەکان و فەزڵدانی غەیرە بەسەر خۆماندا، کە ئەو تێڕوانیە نادروستە بەداخەوە هەتا هەنوکەش لە ناوماندا هەیە و کوردەکان زۆرجار خۆیان بە کەسایەتییەکی تێکشاو و ناتەواو بۆ بەرانبەر وێنادەکەن و تەنانەت هەتا ئاستی خۆ تواندنەوە.

ئومێدەوارم چیدی بە ئەم چەشنە بیر نەکەینەوە و هیچ کات و لە بەرانبەر هیچ نەتەوەیەکدا خۆمان بە بچووك نەزانین. هەروەك چۆن نابێت خۆمان پێ بژاردە و نمونەیی و سەردەستە و تایبەتیی بێت.

ئێمە ئەگەر سەرنجی گەلانی تر بدەین ڕۆحی خۆبەگەورەزانین و دەمارگیریی و شانازییان بە ڕەگەزی خۆیانەوە، هەتا ئاستێکی مەترسیدار بەزاندووە. ئەوەتا گەورەزانا و موفەسیرێکی وەك (زەمەخشەری) شانازیی بە ئەوەوە دەکات کە خودا هەستێکی وای پێداوە لەسەر دەمارگیریی بۆ عەرەب توڕە دەبێت. وەك خۆی دەڵێت:

((اللهَ أحمد على أن جعلني من علماء العربية وجبلني على الغضب للعرب والعصبية وأبى لي أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز وأنضوي إلى لفيف الشعوبية وانحاز))[1].

ئەمانە مشتێك بوون لە خەرمانی ئەو بۆچوونە نازانستیی و ناتەباییانەی کە خەڵکانێك دژ بە کورد، جا بە نەزانیی بێت، یان بە مەبەست بۆیان داتاشیوە و چوارچێوە و ناسنامەی ساختەیان بۆ داناوە، کە بە ڕاستیی ستەمێکی گەورەیان کردووە و ناحەقییان تۆمارکردووە؛ چونکە نەدەبوو وەها هەڵەیەکیان بەسەردا تێبپەڕێت.

جگە لە ئەمانەش، هەوڵی زۆر دراوە و ئێستاش هەر بەردەوامە، بۆ جیاکردنەوە و داڕنینی سەروەریی و جوانییەکانی کورد. بۆ نمونە زانای بەناوبانگ (ئیبن جەوزی)، کە خاوەنی چەندین کتێبە، لە بەناوبانگترین کتێبەکانیشی (المنتظم في تأريخ الملوك)ە، کە یازدە بەرگە، مێژووی مارەکانی پێشووی تۆمارکردووە هەتا دەگاتە

---

١ـ المفصل فی صنعة الإعراب، أبو القاسم محمود بن عمر الخوارزمي الزمخشري: ١/ ١٧. (قرص المكتبة الشاملة).

سالّی (٥٧٤ك)، نە لە نزیك و نە لە دوورەوە ئاماژەی بۆ (صەلاحەدینی ئەیوبی) نەکردووە. کاتێکیش باسی مردنی (نورەدین مەحمود) دەکات، تەنها ناوی دەهێنێت، بەبێ ئەوەی ماف ڕێز لێنانی پێبدات، کاتێك باسی دەنگوباسی ناردنی هێزێك بۆ (میصر) دەکات، ئەوەندەی گوتووە: (سەربازی نارد و وڵاتگیری میصری کرد)، ناوی (شیرکۆ) و (صەلاحەدین)ی نەهێناوە و پشتگوێیخستووە. ئەمە لە کاتێکدا (ئیبن جەوزی) باسی چەندین هەواڵی بچووك و کەمبایەخی لە ئەو کتێبەدا کردووە. وەك دەڵێت: ((ئافرەتێکی دراوسێمان سێ منداڵ، کوڕێك و دوو کچی بە یەك سك هێنا)). یان دەڵێت: ((هەواڵێك لە ئەوبەری بەغدادەوە هات، کە کەڵەشێرێك هێلکەی کردووە))[101]. دەبینین کە چۆن لە بایەخ و گرنگیی (صەلاحەدین) و دارودەستە کوردە تێکۆشەرەکانی کەمکردووەتەوە و لە بەرانبەردا هەواڵی بچووك و تەنانەت ناواقیعیی و دوور لە لۆژیکی بڵاوکردووەتەوە.

یان مێژوونووسێکی ناوداری وەك (ئیبن ئەسیر) کە -کوردە و- هاوچەرخ و شایەتحاڵی خەبات و تێکۆشانی سولتان (صەلاحەدین) بووە، کەچی زۆرێك لە ڕاستییەکانی شێواندووە و قسەی ناڕاستی دەرهەق خۆی و سوپاکەی کردووە. چاویان بەرایی نەداوە کەسانێکی غەیری خۆیان لە مێژووی ئیسلامییدا سەرهەڵبدات، ئێستا چۆن دەبێت سەرکردەیەکی ئاوا ئازا و لێهاتوو لە ناو کورددا هەڵبکەوێت[102].

---

١٠١ ـ بڕوانە/ المنتظم فی تأریخ الملوك، لابن الجوزی: ٨/ ٢٨٣. وەرگیراو لە/ (صەلاحەدین) بدوێنین، یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین؟ پرۆفیسۆر موحسین محەمەد حوسێن: ٦٩.

١٠٢ـ (صەلاحەدینی ئەیوبی) گەورەتر لە ڕەخنەگرانی، ئامادەکردنی: ئارام عەلی سەعید، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر موحسین موحەمەد حسین: ٣٣.

(ئـیبن ئەسـیر) هـەموو ئـەم قسـانەی لـە پـای ئـەوەدا کـردووە، کـە نووسـەرێکی دەربـاری دەسـتەڵات بـووە و نەیویسـتووە ئـەو نـان و خوانـەی لەکیسبچـێت. هـەر لەبەرئـەوە بـە ویسـتی ئـەوان دژ بـە نەتەوەکـەی خـۆی و کەسـایەتییەکی وەك (صەلاحەدین) هاتووەتەدەنگ.

(ئیبن ئەسیر) چۆن دان دەنێت بـە موجاهیـدێتیی و قارەمـانێتیی سـەرکردەیەکی کەموێنـەی وەك (صـەلاحەدین)، کـە هـەموو ژیـانی خـۆی لـە ڕزگـارکردنی خـاکی ئیسـلامییەتدا تـەرخانکرد. (ئـیبن ئەسـیر) خـۆی و براکـانی و بـاوکی لـە لایـەن (ئەتابەگ)ییـەکانی (موسـڵ)ەوە زەویـوزار و گونـد و شـوێنی زۆریـان لەسـەر تەرخانکرابوو. چۆن دەچێت ئەو ژیانە خۆشە لـە خـۆی تاڵدەکات و ڕاستییەکانی سـەردەمی (صـەلاحەدین) باسـدەکات، کـە دەیویسـت هـەموو نەخشـەی جیهـانی ئیسلامیی بکاتە یەك نەخشە و هەموو ئەو خاکانەی لە لایەن داگیرکەرانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، بیگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسـتەڵاتی مسـوڵمانان. هـەموو ئەمانـە وای کردووە بە چاوێکی سووك و نزم سەیری (صەلاحەدین)ی موجاهید بکات و نەتوانێت دان بـە ژیـان و جـەنگ و جیهادەکانیـدا بنێـت، کـە ئـەو بـەردەوام ڕووبـەڕووی دوژمنەکانی بووەتەوە و داکۆکیی لە ئازادکردنی خاکی مسوڵمانان کردووە[١٠٣].

هـەموو ئەمانـەش تـەنها لەبەرئـەوەی نـاوبراو لـەژێر سـایە و خێـر و بێـری (ئەتابەگ)ییەکانـدا ژیـاوە و مێژوونووسـی کۆشـکی فـەرمانڕەوا و دەسـتەڵاتدارێتیی (ئەتابەگ)ییەکان بووە؛ چونکە لە کاتی برسیەتیی دانیشتووانی (موصل) سامانێکی زۆریـان بـە ئـەم مێژوونووسـە بەخشـی، وەك بەخشـینی زەویـوزار لـە دەورووبـەری (موصـل). لەبەرئـەوە دەبایـە نرخـی ئـەوەی وەریگرتـووە بیـدات. دەسـتیکرد بـە

---

١٠٣- هەمان سەرچاوە: ٦٦.

هێرشــەکانی دژی (صــەلاحەدین) و بــە تێکــدان و شــێواندنی مێــژووی ئــەم سەرکردەیە[١٠٤].

هەر لەبەرئەوە ئەوان چۆنیان ویستبایە ئاوا مێژووی ژیانیانی دەنووسیەوە. بە ئاسانیی نەیدەتوانی واز لە ئەو خۆشیی و لەزەتەی لای (ئەتابەگ)ییەکان بهێنێت، کە بۆیان ڕەخساندبوو. ئیدی چۆن بچێتە لای (صــەلاحەدین) و پەسنیبکات! لــە (موصــل) دانیشــتبوو هەرچــی قســەبوو بــە (صــەلاحەدین)ی دەگــوت، ڕەخنــەی لێــدەگرت و دەیگــوت نــەدەبوو (صــەلاحەدین) وا بکــات، بــەڵکوو دەبــوو ئــاوای بکردایە. دەیگــوت: (صــەلاحەدین) مــاڵی هــەتیوو دەخــوات. ئەمانــەی لــە کتــێبی (الباهر في التأريخ الأتابكي)دا باسکردووە[١٠٥].

عەرەبەکانی سەردەمی (صەلاحەدین) هێندە دەمارگیربوون، تەنانەت نازناوی (ناصرەدین)یشیان پێ ڕەوا نەدەبینی. ئەوەتا خەلیفە نوێیەکەی ئەو کاتی (عەباسی)یەکان (ناصرەدین بیللا)، هات و موحاسەبەی (صەلاحەدین)ی کرد تۆ بە چ حەقێك ناوی خۆت ناوە (ناصر)؟

بە مەرجێك (صەلاحەدین) ئەم نازناوەی لە لایەن (عاضید)ی خەلیفەی (فاتمی)یەکانەوە وەرگرتبوو، کە ئەو مەلیك (ناصر)ە هێشتا هەر نەهاتبووە سەر دەستەڵات، بەڵام بیانوویان بە (صەلاحەدین) دەگرت. دوایی گوتی: باشە ئەگەر کێشە لەسەر ناوە ئەوە من نازناوی (ناصر صەلاحەدین) لادەبەم، بەڵام ئێوە بە ئەم شێوەیە هەڵسوکەوت نەکەن[١٠٦].

---

١٠٤ ـ (صەلاحەدین) بدوێنین، یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین: ١٢١ ـ ١٢٢.

١٠٥. بڕوانە/ (صەلاحەدینی ئەیوبی) گەورەتر لە ڕەخنەگرانی: ٦٣.

١٠٦. هەمان سەرچاوە: ٥٧.

(عەباسی)یەکان پێیان ناخۆشبوو (میصر) پێشتر لەژێر دەستەڵاتی عەرەبی (فاتیمی)دا بووە و ئێستاش کەوتووەتە دەستی کەسێکی وا، کە ئەوان چارەیان ناوێت. (ئال عەباس) لەکوێ و (ئەیوبی)یەکان لەکوێ؟ ئەوان لەسەر بنەمای تەشریفات کاریاندەکرد[١٠٧].

(معین بسیسون) کە شاعیرێکی (فەلەستینی)ە، دەربارەی ئەم دەمارگیریی و ڕەگەزپەرستییەی عەرەب، دەڵێت:

صلاحُ الدّين صار عربيا حين انتصر فلو كان هزم لصار جاسوسا كرديا[١٠٨].

واتە: (صەلاحەدین) مادام سەرکەوتووە عەرەبە، خۆ ئەگەر هاتبا و سەرنەکەوتبایە، ئەوا جاسوس و ناپاکێکی کورد دەبوو.

ئەمە دیدگا و تێڕوانینی بەشێك لە عەرەبەکان بوو. ماوەتەوە بڵێین جێگەی داخە هەتا هەنوکەش لە ناوماندا خەڵکانێك ڕێز و شکۆی عەرەب دەدەن بەسەر خۆماندا و بە باشترین و چاکترین نەتەوەیان لە قەڵەم دەدەن. بە بیانووی دابەزینی سروش و نیگای ئاسمانیی لە ناو ئەواندا و بە زمانی ئەوان، کە ئەمە پێوەرێکی نازانستیی و ناواقیعییە؛ چونکە هەناردنی پەیام و پەیامبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بە زمانی عەرەبی و بۆ ناو دوورگەی عەرەبی، بەڵگەی چاکیی و پاکییان نییە.

خۆ ئەگەر شانازیی بە ئەوەوە بکرێت دوورگەی عەرەبی شوێنی دابەزینی نیگایە، لە هەمان کاتدا بەڵگەشە لەسەر ئەوەی گەلێکی هەتا ئاستێك دواکەوتوو و بەدخوو و نالەباربوون. وەك لەم فەرمایشتەی (میقداد)دا خراوەتەڕوو: «وَاللَّهِ لَقَدْ حَضَرَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْوَامٌ أَكَبَّهُمُ اللَّهُ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ فِي جَهَنَّمَ لَمْ يُجِيبُوهُ

---

١٠٧- بڕوانە/ (صەلاحەدینی ئەیوبی) گەورەتر لە ڕەخنەگرانی: ٥٩.

١٠٨- (صەلاحەدین) بدوێنین، یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، پرۆفیسۆر موحسین محەمەد حوسێن: ١١٦. (صەلاحەدینی ئەیوبی) گەورەتر لە ڕەخنەگرانی: ٩٠ - ٩١.

وَلَمْ يُصَدِّقُوهُ أَوَلَا تَحْمَدُونَ اللَّهَ إِذْ أَخْرَجَكُمْ لَا تَعْرِفُونَ إِلَّا رَبَّكُمْ مُصَدِّقِينَ لِمَا جَاءَ بِهِ نَبِيُّكُمْ قَدْ كُفِيتُمْ الْبَلَاءَ بِغَيْرِكُمْ، وَاللَّهِ لَقَدْ بَعَثَ اللَّهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَشَدِّ حَالٍ بُعِثَ عَلَيْهَا نَبِيٌّ مِنْ الْأَنْبِيَاءِ فِي فَتْرَةٍ وَجَاهِلِيَّةٍ مَا يَرَوْنَ أَنَّ دِينًا أَفْضَلُ مِنْ عِبَادَةِ الْأَوْثَانِ فَجَاءَ بِفُرْقَانٍ فَرَقَ بِهِ بَيْنَ الْحَقِّ وَالْبَاطِلِ وَفَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدِ وَوَلَدِهِ حَتَّى إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيَرَى وَالِدَهُ وَوَلَدَهُ أَوْ أَخَاهُ كَافِرًا وَقَدْ فَتَحَ اللَّهُ قُفْلَ قَلْبِهِ لِلْإِيمَانِ يَعْلَمُ أَنَّهُ إِنْ هَلَكَ دَخَلَ النَّارَ فَلَا تَقَرُّ عَيْنُهُ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ حَبِيبَهُ فِي النَّارِ وَأَنَّهَا لَلَّتِي قَالَ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾»[١٠٩].

واته: (میقدادی کوڕی ئەسوەد –خودا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: سوێند بە خودا، خودا پێغەمبەری لە ناو گەلێکدا هەنارد، وەلامیان نەدەدایەوە. بڕوایان پێ نەدەهێنا. سوێند بێت، خودا پێغەمبەری بۆ گەلێك هەنارد، لەچاو گەل و هۆزی پێغەمبەرانی تردا خراپترین بوون. گەلێك کە بتپەرستییان پێ چاکتر بوو لە تاکپەرستیی.

هەروەها گەورەزانا، (قەتادەی سەدوسی) دەفەرموێت: «قال قتادة بن دعامة السَّدوسي، رحمه الله، في قوله تعالى: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ﴾ قال: كان هذا الحي من العرب أذل الناس ذُلا وأشقاه عَيْشًا، وأجوعه بطونًا، وأعراه جلودا، وأبينه ضلالا مكعومين على رأس حجر، بين الأسدين فارس والروم، ولا والله ما في بلادهم يومئذ من شيء يحسدون عليه، من عاش منهم عاش شقيًا، ومن مات منهم رُدِّيَ في النار، يؤكلون ولا يأكلون، والله ما نعلم قَبيلا من حاضر أهل الأرض يومئذ كانوا أشر منزلا منهم، حتى جاء الله بالإسلام فمكن به في البلاد، و وسع به في الرزق، وجعلهم به ملوكا على رقاب الناس. وبالإسلام أعطى الله ما

---

١٠٩ ـ رواه أحمد، برقم: ٢٣٨١٠. و ابن حبان، برقم: ٦٥٥٢. والطبراني في المعجم الكبير، برقم: ٦٠٠. والبخاري في الأدب: ٨٧.

رأيتم، فاشكروا لله نعمه، فإن ربكم مُنْعِم يحب الشكر، وأهل الشكر في مزيد من الله تعالى»[110]. به كورتيى واته: خەڵكى عەرەبى ئەم شارە لە هەموو كەس ڕيسواتر و بەدبەختتر بوون، برسييترين و ڕوت و ڕەجاڵترين بوون. گومڕاترين بوون. بەسترابوونەوە لە نێوان فارس و ڕۆمدا. لە وڵاتياندا شتێك نەبوو چاوى لەسەربێت و ئيرەييان پێببرێت، كەس لە ئەوان خراپتر نەبوو، ژيانيان پڕ لە مەينەتيى بوو. مردووييان بۆ دۆزەخ دەچوو، خەڵك نانى پێوە دەخواردن، هەتا ئيسلام هات، ئاوەدانيى هێنا بۆيان. ڕێزى زۆرى بۆ فەراهەمكردن، كردنى بە پاشا بەسەر خەڵكەوە. ئيسلام هەموو ئەوانەى پێبەخشين، كە تۆ دەيبينيت.

هەر سەبارەت بە عەرەب، گەورەزانا و مێژوونوسى بەناوبانگ (ئيبن خەلدون) لە (موقەديمە)[111]كەيدا و لەسەر باسێكى تايبەتدا باس لە دواكەوتوويى و ستەم و كاولكارى و وەحشيگەريى عەرەب دەكات و دەڵێت: ((أن العرب إذا تغلبوا على أوطان أسرع إليها الخراب، والسبب في ذلك أنهم أمة وحشية باستحكام عوائد التوحش وأسبابه فيهم فصار لهم خلقا وجبلة وكان عندهم ملذوذا لما فيه من الخروج عن ربقة الحكم وعدم الانقياد للسياسة وهذه الطبيعة منافية للعمران ومناقضة له فغاية الاحوال العادية كلها عندهم الرحلة والتغلب وذلك مناقض للسكون الذي به العمران ومناف له ... وأيضاً فطبيعتهم انتهاب ما في أيدي الناس، وأن رزقهم فى ظلال رماحهم، وليس عندهم في أخذ أموال الناس حد ينتهون إليه، بل كلما امتدت أعينهم إلى مال أو متاع أو ماعون انتهبوه. فإذا تم اقتدارهم على ذلك بالتغلب والملك بطلت

---

١١٠ ـ تفسير ابن كثير: ٤/ ٤٠. تفسير الطبري: ٧/ ٨٧ ـ ٨٨. الدر المنثور، للسيوطي: ٤/ ٤٧ ـ ٤٨. الكشف والبيان، للنيسابوري: ٤/ ٣٤٥ ـ ٣٤٦. فتح القدير، للشوكاني: ٢/ ٤٣٩. التفسير الوسيط، للطنطاوي: ١٨٠٧.

١١١ـ مقدمة ابن خلدون: ١٤٩ _ ١٥٠.

السياسة في حفظ أموال الناس وخرب العمران. .. فإنهم ليست لهم عناية بالاحكام وزجر الناس عن المفاسد ودفاع بعضهم عن بعض، إنما همهم ما يأخذونه من أموال الناس نهبا أو غرامة فإذا توصلوا إلى ذلك وحصلوا عليه أعرضوا عما بعده من تسديد أحوالهم والنظر في مصالحهم وقهر بعضهم عن أغراض المفاسد وربما فرضوا العقوبات في الاموال حرصا على تحصيل الفائدة والجباية والاستكثار منها كما هو شأنهم وذلك ليس بمغن في دفع المفاسد وزجر المتعرض لها)). واته: عەرەب کە زاڵدەبن بەسەر شوێنێکدا خێرا وێران و خاپوریدەکەن. هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەوان گەلێکی وەحشیین و یاسای وەحشییگەری پەیڕەودەکەن، تالانچیی و داگیرکار و چاولەدەستی خەڵکن...

هەروەها زۆر شتی تر دەربارەی حەقیقەت و سروشتیان دەڵێت، جا هەر کەس دەیەوێت زیاتر بزانێت لە ئەم بارەیەوە با بگەڕێتەوە سەر کتێبی ناوبراو.

لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، دەگەڕێینەوە خزمەت گەورەترین سەرچاوەکانی فەرموودە و بە گوزارشتی گەورەترین زانای فەرموودەزان پێشەوا (بوخاری)، کە لە صەحیحەکەیدا سەرەبابێکی بە ناونیشانی (باب قصة زمزم وجهل العرب) هێناوە و تێیدا ئەم فەرموودەیەی حەزرەتی (ئیبن عەباس)ی خستووەتەڕوو، کە فەرموویەتی: «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِذَا سَرَّكَ أَنْ تَعْلَمَ جَهْلَ الْعَرَبِ فَاقْرَأْ مَا فَوْقَ الثَّلَاثِينَ وَمِائَةٍ فِي سُورَةِ الْأَنْعَامِ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ إِلَى قَوْلِهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾»[112].

لێرەدا وەك دیارە (ئیبن عەباس) -کە لە ڕەسەنترین ڕیشە و ڕەچەڵەکەکانی عەرەبە-، بە ئاشکرا باس لە جەهالەت و نەفامیی عەرەب دەکات و ڕێنوومایی

---

١١١. صحيح البخاري، باب قصة زمزم وجهل العرب، الرقم: ٣٣٣٤.

هەموو لایەکیش دەکات بۆ ئاشنابوون بە ئەم جەهالەتە بگەڕێنەوە سەر قورئانی پیرۆز. هەر لەبەرئەوە پێشەوا (بوخاری) دەستەواژەکەی کردووەتە ناونیشانی یەکێك لە سەرباسەکانی ناو کتێبە فرە بەهادار و گرنگەکەی.

سیمای دیار و حاڵ و گوزەران و ژیریی عەرەب ئەوە بووە، وەك خۆیان دانیانپێداناوە، کەچی جێگەی داخە زاناگەلێك، عەرەبیان بە باشترین و بەڕێزترین گەل ئەژماردووە. بۆ نمونە کەسێکی وەك (شێخ ئیبن تەیمیە) -کە بە ڕەچەڵەك کوردە-، دەمارگیرییەکی سەیری بۆ عەرەب هەیە و دەڵێت: ((فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم عبرانيهم وسريانيهم رومهم وفرسهم وغيرهم وأن قريشا أفضل العرب وأن بني هاشم أفضل قريش وأن رسول الله صلى الله عليه و سلم أفضل بني هاشم فهو أفضل الخلق نفسا وافضلهم نسبا. وليس فضل العرب ثم قريش ثم بني هاشم بمجرد كون النبي صلى الله عليه و سلم منهم وإن كان هذا من الفضل، بل هم في أنفسهم أفضل وبذلك ثبت لرسول الله صلى الله عليه و سلم أنه أفضل نفسا ونسبا وإلا لزم الدور. ولهذا ذكر أبو محمد حرب بن إسماعيل بن خلف الكرماني صاحب الإمام أحمد في وصفه للسنة التي قال فيها هذا مذهب أئمة العلم وأصحاب الأثر وأهل السنة المعروفين بها المقتدى بهم فيها وأدركت من أدركت من علماء أهل العراق والحجاز والشام وغيرهم عليها فمن خالف شيئا من هذه المذاهب أو طعن فيها أو عاب قائلها فهو مبتدع خارج عن الجماعة زائل عن منهج السنة وسبيل الحق وهو مذهب أحمد وإسحاق بن إبراهيم بن مخلد وعبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور وغيرهم ممن جالسنا وأخذنا عنهم العلم، فكان من قولهم أن الإيمان قول وعمل ونية وساق كلاما طويلا إلى أن قال ونعرف للعرب حقها وفضلها وسابقتها ونحبهم لحديث رسول الله صلى الله عليه و سلم حب العرب

إيمان وبغضهم نفاق ولا نقول بقول الشعوبية وأراذل الموالي الذين لا يحبون العرب ولا يقرون بفضلهم فإن قولهم بدعة وخلاف))[١١٣].

به کورتیی واته: ڕەگەزی عەرەب لە جگە خۆیان باشترن، ئەمەش لەبەرئەوە نا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) عەرەبە، بەڵکوو هەر لە بنەڕەتدا خۆیان باشترینن. دواتر دەڵێت: هەر کەسێکیش تانە لە ئەم قسەیە بدات و ڕەخنەی لێبگرێت و، پێچەوانەی ئەمە باوەڕی بێت، ئەوە بیدعەچییە و لە کۆمەڵی مسوڵمانان و ڕێبازی پێغەمبەر دەرچووە.

دواتر شێخ درێژە بە گوتەکانی دەدات و دەڵێت: ((وذهبت فرقة من الناس إلى أن لا فضل لجنس العرب على جنس العجم وهؤلاء يسمون الشعوبية لانتصارهم للشعوب التي هي مغايرة للقبائل كما قيل القبائل للعرب والشعوب للعجم، ومن الناس من قد يفضل بعض أنواع العجم على العرب، والغالب أن مثل هذا الكلام لا يصدر إلا عن نوع نفاق إما في الاعتقاد وإما في العمل المنبعث عن هوى النفس مع شبهات اقتضت ذلك ولهذا جاء في الحديث: «حب العرب إيمان وبغضهم نفاق». مع أن الكلام في هذه المسائل لا يكاد يخلو عن هوى للنفس ونصيب للشيطان من الطرفين وهذا محرم في جميع المسائل))[١١٤].

لێرەدا شێخ خەسڵەتی دووڕوویی و ئارەزووپەرستیی دەداتە پاڵ ئەو کەسانەی جگە عەرەب لە عەرەب بە باشتر دەزانن[١١٥]. قسەکانی شێخ (ئیبن تەیمیە) تەواوبوو.

---

١١٣ ـ اقتضاء الصراط المستقيم: ١٤٧.

١١٤ ـ المصدر السابق: ١٤٨.

١١٥ـ شێخ ئیبن تەیمییە لە شوێنێکی تر و بەدیاریکراویش لە (مجموع الفتاوى)دا دیدی خۆی وردتر و دروستتر دەخاتەڕوو. وەک دەڵێت: ((لكِنَّ تَفْضِيلَ الْجُمْلَةِ عَلَى الْجُمْلَةِ لَا يَسْتَلْزِمُ أَنْ يَكُونَ كُلُّ فَرْدٍ أَفْضَلَ مِنْ كُلِّ فَرْدٍ فَإِنَّ فِي غَيْرِ الْعَرَبِ خَلْقًا كَثِيرًا خَيْرًا مِنْ أَكْثَرِ الْعَرَبِ وَفِي غَيْرِ قُرَيْشٍ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْ أَكْثَرِ

هەرچەند لە بنەڕەتدا نەگونجاوە هیچ گەلێك فەزڵی بدرێت بەسەر گەلێکی تردا، بەڵام ئەمە ناگاتە ئەو ئاستەی کەسێك وا بیریکردەوە ئیتر دووڕووە و شوێن ئارەزووەکانی کەوتووە.

ماوەتەوە بڵێین: ئەم جۆرە جەدەل و کێشمەکێشمانە کە شوێنەواری خراپیان دوای خۆیان بەجێهێشتووە، بە پلەی یەکەم زانایانی جوڵێنەر و پاڵنەری ئەو بیرە لێی بەرپرسن کە ئایینیان وەك پاڵنەر و کەرەستەی ئەم بابەتە بەکارهێناوە، لە دنیادا هاوبەشی تاوانی دەرهاویشتە و کاردانەوەکانیانن و دواڕۆژیش دەبێت وەڵامگۆی لێپرسینەوەی خوایبن دەرهەق بە ئەو هەموو تۆمەتە ناڕەوا و ناڕاستانە.

لەبەرئەوە پێویستە ئەم تێگەشتنانە ڕاستبکرێنەوە و بێبنەمایی ئەو سیما شێوێنراوە ئاشکرابکەین، کە بیانییەکان و بە تایبەتییش نەژادپەرستانی عەرەب وێنایانکردووە.

ئەم دید و تێڕوانینە ئەگەر لایەنێکی پەیوەندیی بە دەمارگیریی نەتەوەییەوە هەبێت، لایەکەی تری پەیوەستە بە بیری یەکتر سڕینەوە و هەژاریی ئاستی ڕۆشنبیریی و لاوازیی گیانی پێکەوەژیان و یەکتری قبوڵکردن.

لە هەمانکاتدا بەدحاڵیبوونە لە ئەو ئایینە پاك و جوانەی کە هەموو مرۆڤێك وەك یەك تەماشادەکات و جیاوازیی چینایەتیی و ڕەگەزایەتیی وەلادەنێت و ڕەگی دەمارگیریی دەبڕیت و هەمووان دەخاتە تای تەرازوویەك و بە برای یەکدیمان دەکات.

---

قُرَيْشٍ وَفِي غَيْرِ بَنِي هَاشِمٍ مِنْ قُرَيْشٍ وَغَيْرِ قُرَيْشٍ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْ أكْثَرِ بَنِي هَاشِمٍ..)). مجموع الفتاوى: ١٩/ ٢٩ ـ ٣٠.

چونكه ئێمه گەلێكین، نەتەوە و خاكمان بەڕێز و پیرۆزە و چەندین بەڵگە ئاراستە و ئاماژەن بە بوون و كیان و ئاشتیخوازیی و پیرۆزییمان -وەك لە بەشەكانی داهاتوودا ئەمە ڕووندەكەینەوە- هەروەها مێژوویەكی دێرین و خاوێنمان هەیە، هەروەك زانا و ئەكادیمای ڕوسیی (ن.یا.مار)، كە توێژەرە لە كاروباری كورد و (قەوقان)، وەسفی كورد دەكات بە: ((قردێلەی سەری مێژوو! چونكه ئەوەندە دیار و بەرچاوە لە مێژوودا))[116].

خوای بەرز و باڵا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. سورة الحجرات، الآية: ١٣. لە هەمان سورەتداو، لە ئایەتەكانی (١٠ و ١١)دا دەفەرموێت:﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.

پێغەمبەری پێشەوایش (درودی خوای لەسەربێت) لە وتاری ماڵاواییدا فەرمووی: «أيُّهَا النَّاسُ، ألاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، ألاَ وَإِنَّ أبَاكُمْ وَاحِدٌ، ألاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلاَ أسْوَدَ عَلَى أحْمَرَ، وَلاَ أحْمَرَ عَلَى أسْوَدَ، إلاَّ بِالتَّقْوَى»[117]. واتە: هیچ گەورەییەك بۆ عەرەب بەسەر عەجەم و عەجەم بەسەر عەرەبەوە نییە، مەگەر بە تەقوا، ڕێزدارترینتان لای خودا تەقوادارترینتانە.

لەسەر ئەم بنەما و پێوەدانگە دادوەرییانەیە، دەبینین (ئەبولەهەب) لەگەڵ ئەوەی مامی پێغەمبەری خودایە و لە ڕەگەزی عەرەبە، كەچی خوای گەورە

---

١١٦ ـ مێژووی كوردستان: لازاریف.ن، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵا سەنگاوی: ١٩.

١١٧ ـ رواه أحمد، برقم: ٢٣٥٣٦. والبيهقي في الشعب، برقم: ٥١٣٧. والطبراني في الكبير، برقم: ١٤٧٢٤.

نەفرەتی لێکردووە و وەبەر خەشمی خۆی خستووە. بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای ڕیشە و ڕەچەڵەك و نەتەوەیدا. وەك دەفەرموێت: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾. لە ئەولاشەوە (سەلمان)ێکی عەجەمی فارسی، کە هیچ پەیوەندییەکی نەتەوەیی و ڕەگەزییان لە نێواندا نییە، پێغەمبەری پێشەوا (درودی خوای لەسەربێت)، بە ئەندامێکی خێزانی خۆی هەژماردووە و پێیفەرمووە: (سەلمان) لە ئێمە و لە ئال و بەیتی ئێمەیە. «سلمان منا أهل البيت»[118].

شاعیریش ئەم تابلۆیەی بە جوانیی لە دوو بەیتدا ڕێکخستووە، کە دەفەرموێت:

لعمرك ما الإنسان إلا بدينه فلا تترك التقوى اتكالا على النسب

لقد رفع الإسلام سلمان فارس وقد وضع الشرك النسيب أبا لهب[119].

ئەم دەقە شەرعییانە ئەوەمان بۆ بەیاندەکەن، کە هیچ مرۆڤێك لە ئەوی تر باشتر و ڕێزدارتر نییە، مەگەر لە خوداناسییدا. هەروەها دەریدەخەن کە شێواندن و لەکەدارکردنی هیچ نەتەوە و هۆزێك، تەنانەت هیچ مرۆڤێکیش دروست نییە، بەڵکوو ناڕەوا و نەگونجاوە.

ئەوەی خستمانەڕوو نە دەمارگیریی کوێرانەیە، نە بوهتانکردن، نە بێڕێزیی و ناوزڕاندنە، بەڵکوو نیشاندانی هەندێك بۆچوونی ناڕاست و سەرپێییانەی بەشێك لە زانایانن بەرانبەر ئێمەی کورد، کە قابیلی هەڵسەنگاندن و هەڵوێستە لەسەر کردنە. بێگومان ئەمانە نە فەرمایشتی خودان، نە هی پێغەمبەر، بەڵکوو قسەی مرۆڤن. زانراویشە جگە لە زاتی مەزنی خودا و پەیامبەرەکەی (درودی خوای لەسەربێت)، هیچ کەس و بۆچوونێك پیرۆز و پارێزراو و بێهەڵە نییە و هەر ئەو دووەش سەرچاوەی ڕوون و ڕەوانی شەرعی خودان.

---

١١٨ ـ رواه الحاكم في مستدركه، برقم: ٦٥٣٩. والطبراني في الكبير، برقم: ٦٠٤٠.

١١٩ـ جامع العلوم والحكم، أبو الفرج عبد الرحمن بن أحمد بن رجب الحنبلي: ٣٤٨.

ڕەخنە و سەرنجیشمان لەسەر ئەو بۆچوونە ناڕەوایانەی سەرەوە، بە پشتبەستن و لەسەر بنەمای ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) خستەبەرچاو، کە ئیلهامبەخشی بەرگرییکردنێکی دروست و ژیرانەن لە هەر نەتەوەیەك، بەڵام بەبێ زیادەڕەویی و پیاهەڵدانی بێبنەما. وەك دەفەرمووێت: «عَنْ فُسَيْلَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ مِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِينَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ»[120]. واتە: باوكی (فوسەیلە) لە پێغەمبەری پرسی:

– ئایا مرۆڤ هۆزەكەی خۆی خۆشبوێت بە دەمارگیریی هەژمارە؟

– فەرمووی: نەخێر، بەڵكوو دەمارگیریی ئەوەیە مرۆڤ یارمەتییدەر بێت بۆ هۆزەكەی لەسەر تاوان و ستەم.

هەروەها دەفەرمووێت: «خير القوم المدافع عن قومه ما لم يأثم»[121]. واتە: باشترینی ناو هۆز ئەو كەسەیە بەرگریی لە هۆزەكەی خۆی دەكات، بە مەرجێك توشی تاوان نەبێت لەسەری.

دیسان دەفەرمووێت: «انصر أخاك ظالما أو مظلوما. فقال رجل: يا رسول الله أنصره إذا كان مظلوما، أفرأيت إذا كان ظالما كيف أنصره؟ قال: تحجزه أو تمنعه من الظلم فإن ذلك نصره»[122]. واتە: براكەت ئەگەر ستەمكار بوو، یارمەتیی بدە بە ئەوەی دەست لە ستەم هەڵبگرێت، ئەگەر ستەملێكراو و مافخوراویش

---

١٢٠ـ رواه أحمد، برقم: ١٧٤٧٢. والطبراني، برقم: ٩٥٥. والبيهقي في شعبه، برقم: ٧٦٧٥. وابن ماجه، برقم: ٣٩٤٩.

١٢١ـ أخرجه الطبراني في الكبير، برقم: ٤١٣٠. وأبونعيم في المعرفة، برقم: ٢٢٢٤.

١٢٢ـ رواه البخاري، الرقم: ٦٥٥٢.

بوو، ئەوا دەستبارییە بۆ ئەوەی ستەمەکەی لەسەر هەڵبگریت و مافەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

کۆتایی ئەم باسە بە ئەم ڕووداو و وەڵامە بە پێزانەی خوارەوە دەهێنم، کە لە کۆڕی زانایانی عەرەبدا و بە ئامادەیی کەڵەزانایانی کورد، هەجووی نەتەوەکەمان کراوە، بەڵام دڵسۆزیی و بوێریی مەردەکانمان، وەك هەمیشە ڕێگربووە لەبەردەم وتە نابەجێ و ناڕەواکانیاندا:

**نموونەی یەکەم/** پێشەوا (ئالوسی) لە زانایانی متمانەدارەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ((وما ألطف ما حكاه لي بعض الثقات، مما حاصله أن أمير المؤمنين فى الحديث "الشيخ علي أفندي السويدي" رحمة الله تعالى عليه، قال يوما لحضرة مولانا المجدد المجددي سيدي وسندي "الشيخ خالد النقشبندي" قدس سره، يا مولانا بئس ما يفعله أكثر علماء الأكراد اليوم من الإشتغال بالفلسفة وهجر علوم الدين، كالتفسير و الحديث، على عكس ما يفعله علماء العرب. فقال قدس سره: كلا الفريقين طالب بعلمه الدنيا الدنية، وطلبها بقال الله، قال رسوله صلى الله عليه وسلم، أقبح من طلبها بقال أفلاطون، قال أرسطو، فإن الدني إن طُلب طُلِب بدنيّ مثله.

نعم، لو كانوا طالبين الآخرة فياحبذا ما يفعله أكثر علماء العرب. فسكت "الشيخ علي أفندي السويدي"، وصار في ذلك المجلس عليه الرحمة، لايعيد ولايبدي. ولله تعالى درّ الشيخ قدس سره، ما أغيره! وما أغوره! فتأمل))[١٢٣]. واتە: ڕۆژێکیان[١٢٤]

---

١٢٣- غرائب الإغتراب ونزهة الألباب، لأبي ثناء شهاب الدين السيد محمود أفندي الآلوسي الحسيني: ٩١.

١٢٤- مامۆستا شێخ (موحەمەدی خاڵ) ئەم ڕووداوەی لە سەرگوزەشتەکەیدا هێناوە و دەفەرمووێت: ئەو کۆڕە تەعزییەکی زۆر گەورە بووە، لە تەعزێکەدا شێخ (عەلی سویدی) وەعز دەخوێنێت بۆ دانیشتووانی تەعزێکە، خەلقەکە هەموو ڕوویانتێکردووە و گوێیان بۆ گرتووە. کاتێك کە (مەولانا) دەردەکەوێت، هەموو هەڵدەستن

پێشەوای فەرموودەزان (شێخ عەلی ئەفەندی سویدی)، بە شێخ (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) گوت: گەورەم شتێکی زۆر ناشیرین و ناباوە، کە زۆرێك لە زانا کوردەکان ئەمڕۆ دەستیان لە زانستە ئایینییەکان هەڵگرتووە و سەریانکردووەتە فەلسەفە و خۆیان پێوە سەرقاڵکردووە! بە پێچەوانەی زانایانی عەرەب، کە سەرقاڵی زانستە دینییەکانن.

شێخ (مەولانا)یش لە وەڵامیدا فەرمووی: هەرکام لە ئەو دوو دەستەیە سەرقاڵی دنیادارین و بە زانستەکەیان شوێنی دنیای بێنرخ کەوتوون، بەڵام دنیادارییی بە ناوی خودا و پێغەمبەرەوە خراپتر و قەبیحترە لە دنیادارییی بە ناوی (ئەرستۆ) و (ئەفلاتون)ەوە؛ چونکە شتی بێنرخ دەبێت بەبێ نرخێکی وەك خۆی وەدەستبخرێت.

جا ئەگەر زاناکانی عەرەب ڕاستیانبکردایە و مەبەستیان خودا و قیامەت بایە، کارێکی چەند جوان و چاك دەبوو! لە ئەو کاتەدا شێخ (عەلی ئەفەندی) دەمکوت و بێدەنگ بوو، لە کۆڕەکەدا خۆی دەرنەدەخست و قسەکەی دووبارە نەکردەوە.

شێخی (ئالوسی) دەرحەق بە ئەم هەڵوێستەی مەولانا، دەفەرمووێت: تۆ سەرنج بدە چەند بە غیرەتە و چەند وەڵامێکی قووڵە!

**نموونەی دووەم/** مامۆستا (شێخ محەمەدی خاڵ) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ((جارێکیان "موفتی زەهاوی" لای والیی بەغداد دادەنیشێت، سەرینێك لە ناوەندی هەردوکیاندا دەبێت، لە ئەو دەمەدا کوڕی "حەسەن قولی خانی" والیی لوڕستان دەچێتە لای والیی بەغداد بۆ قسەکردن لە بابەت سنووری "ئێران – عێراق"ەوە. وا دەردەکەوێت کە والیی بەغداد لە قسەکانی کوڕی والیی لوڕستان

---

لەبەری و ڕووردەکەنە ئەو. ئیتر (شێخ عەلی) ئەمەی پێ ناخۆش دەبێت، لەبەرئەوە دەیەوێت شێخ (مەولانا خالید) بشکێنێت، ئەو قسەیەی لەڕووردەدات. بڕوانە/ لە سەرگوزەشتەکانی ژیان، شێخ موحەمەدی خاڵ: ٣٣.

خۆشنود نابێت، لەپاش هەستانی کوڕی والی، ئەمە فەرامۆشدەکات کە "موفتی زەهاوی" کوردە. دەڵێت: "موفتی ئەفەندی" توخودا پێمناڵێیت فەرق چییە لە بەینی کورد و کەرا؟

ئەمیش خێرا دەڵێت: فەرق لە بەینیاندا ئەم سەرینەیە. والی کە بیریدەکەوێتەوە موفتی کوردە، زۆر شەرمەزاردەبێت. داوای لێبوردن لە موفتی دەکات. هەر لەبەر ئەمە موفتی دەست لە هاتووچۆی والی هەڵدەگرێت، مەگەر لە ڕەسمیاتدا نەبێت.

ڕۆژێك والی لە ڕووی گلەییەوە کاغەزێکی بۆ دەنووسێت، ئەم ئایەتەشی تێدا دەنووسێت کە دەفەرمووێت: ﴿أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنْتَ مِنَ الْعَالِينَ﴾. واتا: ئایا فیزت کرد، یان خۆت لە یەکێك لە بڵندپایەکان ژمارد. موفتیش لە داوێنی کاغەزەکەی والی بۆی نووسییەوە: (لا و لا). واتە: نە ئیستیکبارە و نە خۆبەگەورەتردانانە.

موفتی بە دیمەن وەڵامی ئایەتەکە دەداتەوە، بەڵام لە دڵدا ئاماژە بۆ ئەو نیوە شیعرەی دەدات کە دەڵێت: (لا أرى القرد، ولا القرد يراني). واتە: نە دەمەوێت مەیمون ببینم و نە مەیمون بمبینێت))[125].

**نمونەی سێیەم و کۆتایی/** شیاوی ئەم شوێنەیە، ئەم ڕووداوەی مامۆستای (مودەڕیس)یش بخەینە بەرچاو، کە چۆن لە کۆڕێکی جەنجاڵی زانایانی عەرەبدا، باسی خراپە و بەدیی کورد کراوە و مامۆستایش بوێرانە لێیان هاتووەتەوەڵام:

لە شاری (بەغداد) لە کۆبوونەوەیەکی زۆر بەرفراواندا، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ئایینیی بانگکراون. مامۆستای مەزنیشمان (واتە مودەریس) یەکێك بووە لە ئامادەبووان، کە سەیری کردووە و گوێیگرتووە، زۆر پەست و بێزار بووە، سەری لە ئەو هەموو قسەلۆك و بوختانە نابەجێیانە سوڕماوە کە لە زاری بەناو زانایانی

---

١٢٥. لە سەرگوزەشتەکانی ژیان، شێخ موحەمەدی خال: ٢٠ ـ ٢١.

ئایینییەوە دەرچوون. لە ناوبڕێکی کۆتاییدا داوا لە مامۆستا کراوە وتەیەك پێشکەشبکات، کە چووەتە سەر سەکۆکە و لە میکرۆفۆنەکە نزیکبووەتەوە، ئاماژەی بە وتەی چەند زانایەکی پێشخۆی کردووە. پاشان هەڵوێستەیەکی کورتی کردووە، زیاتر سەری هەڵبڕیوە و فەرموویەتی: ((بەندە گوێم لە وتارەکان و ئەو ئایەتە پیرۆزانەش گرت، کە خودای گەورە دژ بە دوژمنانی ئیسلام ناردوویەتییە خوارەوە، بەڵام زۆرتر بە ئەوە سەرسامبووم کە ئاماژەتان بە ئایەتێك نەکرد، کە دژی میللەتی کوردە! لە ئەو کاتەدا ئامادەبووان واقیانوڕما؛ چونکە شتی وا لە قورئانی پیرۆزدا نییە! پاشان مامۆستا هەلەکەی قۆستەوە و فەرمووی: بۆچی سەرتان سوڕماوە؟ ئەی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێت: "الأكراد أشدّ كفرا ونفاقا!" هەر کە ئەوەی گوتووە هاتووەتە خوارێ. لە ئەو کاتەدا چەندین زانا لە دەوروبەری کۆبوونەتەوە و ستاییش و سوپاسیان کردووە بەرانبەر بە ئەو هەڵوێستە بورکانئاسایەی. ئیتر لە ئەو ڕۆژەوە ناوبانگی پتر بووە و لەسەر ئاستێکی بەرز و بەرین ناوی زۆر درەوشاوەتەوە))[١٢٦].

ماوەتەوە بڵێم و بە پێویستیشی دەزانم ئەم ڕاستییە بدرکێنم: کە ئێمە ناتوانین ئەم نمونانەی سەرەوە بکەینە زمانحاڵی هەموو گەلانی عەرەب و تورك و فارس و گەلانی دیکە.

بەڵکوو خستنەڕوویان بۆ ئەوەبوو بزانین کاتێك لە ناو ئێمەی کوردیشدا کەسانێکی شۆفێنیی و نەتەوەپەرست و دەمارگیر هەن. ئەم جۆرە فکرانە مایەی بێزاریی و دەردیسەریی و لێکترازان و ئاڵۆزیی و لەناوبردنی گیانی پێکەوەیی و

---

١٢٦ ـ پێشەنگی هەردەم لەیاد: عوسمان محەمەد هەورامی، لا: ٢٤٩ ـ ٢٥٠. -توێژینەوەیەکە لەگەڵ چەند بابەتێکی تردا لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناوی (دیداری مەلا عبدالكريمی مودەڕیس/ ٢٠١٦) بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی و هونەریی سلێمانیی، تایبەت بە ئەو دیدارە لەچاپیداوە-.

برایەتییە لە نێوان گەلانی جیاوازدا و نابێت ئێمەش ئەزموونی هەڵەی خەڵکانی تر دووپاتبکەینەوە و بە هەمان ئاراستەی پێچەوانەدا بڕۆین، بەڵکوو دەبێت ئەم نمونانە وامان لێبکەن بەخۆداچوونەوەیەك بکەین و لە هەڵەی کەسانی تر پەندوەربگرین. نەك نمونە نەرێیەکان زەقبکەینەوە و کاردانەوە و پەرچەکردار (بەرتەك) بنوێنین.

بەڵکوو دەبێت هەمیشە دڵگەورە و سینەساف و بێکینە بین بەرانبەر بە ئەوانی تر و هەر ئەوەشمان لێ چاوەڕواندەکرێت و بە ئەوەشەوە گەورە و جوانین. کەواتە بۆ ئێمە گرنگە نەکەوینە ژێر کاریگەریی ئەو نووسەرانەی سەربارەت بە کورد و کوردستان ڕاستییان بەلارێدابردووە؛ چونکە کورد گەلێکی ڕەسەن و دیار و بەرچاو و کاریگەرە و زمان و ڕەنگ و دەنگ و نیشتیمانی بە ویستی خودای باڵادەست ئافرێنراوە و هەرچییەك و هەرچۆنێك هەین حیکمەتی پەروەردگار وای خواستووە، کە بەدڵنیاییەوە گەورەیی و شانازییمان بە ئەو تایبەتمەندییانەوە بەند. خودای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. سورة الحجرات، الآية: ١٣.

وەك دواخاڵی ئەم تەوەرەیش ئەم دەقە شیعرییەی (ئەحمەد موختار بەگی جاف) دەخەمە بەرچاو، کە بە جوانیی وێنا و نمایشی دۆخ و گوزەرانی نەتەوەی کوردی بە دەست گەلانی ترەوە تێدا کردووە و دواتریش دێتەسەر باسی پێشکەوتن و گەشەسەندنی بزاوتی کوردیی و دیسانەوە وێنای دەوڵەت و هێز و قەوارەی کوردیی دەکات. دەڵێت:

"دێتە گوێم دەنگێ بــە سۆز و شیوەن و گریانەوە

نالەی دڵمە لــە حەسرەت خاکــی کوردستانەوە

لانەواز و بێ کەس و مەزڵومن ئێستە قەومی کورد

گا بە دەستی تورکەکان و گا بە دەستی ئێرانەوە

ئیسمی ویجدان و عەدالەت بێ موسەممایە و درۆ

بــۆ سیاسەت ئەم قــسە کەوتۆتە سەر لێوانەوە

ڕاستە گەر ئیسمی عەدالەت، بۆچی مندالانی کورد

وێڵ و سەرگەردان بسوڕێنۆ بـــەسەر کــێوانەوە

حاڵی کورد ئێستا لە بەینی تورك و ئێران و عێراق[127]

بێـچـــووە تـەیـرە کەوتـۆتـە داوی مـنــدالانــەوە

ئەم قەراری عوسبەتە وا خەڵکی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ

هەر قسەی ڕووتە و قـــسە ناچێتە نـاو گێرفانەوە

ئەمڕۆ بـا وابــێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کـورد

دێنەوە مەیدان بــە عیلم و سنــعەت و عیرفانەوە

نەوجوانانی وەتەن تەوحید ئـەکـەن ئەم میللەتە

هەر لـــە کرماشان هەتا ورمێ و سنە و بۆکانەوە

ڕێك ئەخەن وەزعیەتـی وان و جـــزیرە و باشقەڵا

عەقرە و زاخۆ دەبەستـن ڕێك بـــە قەد بۆتانەوە

خانەقین و مەندەلی، خـاکی لوڕستان یەك بە یەك

---

١٢٧ـ وشەی (عێراق) لە دەقی دیوانەکەدا نەهاتووە، بەڵام من لە شوێنێکدا بە ئەو شێوازە دیومە و پێم وایە دروست و گونجاو بێت! چونکە چلۆن کوردانی باکوور قوربانیی دەستی تورکیا و کوردانی ڕۆژهەڵات قوربانیی دەستی سیاسەتی ئێرانن، ئاوهاش کوردانی باشوور قوربانی دەستی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقن. لەبەرئەوە زۆر جێگەی خۆیەتی عێراقیش بخرێتە ڕیزی ئێران و تورکیاوە.

وەك وەسا ئەدروون بــە بالآی مەنتیقەی بابانەوە

لەشکرێکی مونتەزەم بۆ سەندنی حەق ڕیك ئەخەن

جوان و ڕازاوە بــــە تۆپی لاکەلـــی ئەڵمانەوە

بەچکەشێرانی عەشایەر بــــۆ قڕانی دوشمنان

هەروەکو ڕۆستەم ئەکەونە هاتوچــۆ و جەولانەوە

پاش قڕانی موددەعی دەس پێئەکەن تەعمیری مولْك

ڕێگەی ئاســن ئەچێتە شاخــــی هەورامانەوە

کێو و کەژ گشتی ئەبێتە باغ و جادە و قەیسەری

بۆ تەماشای دەستە دەستە دێن لە ئینگلستانەوە[١٢٨].

هیوادارم قۆناغە سەختەکانمان بڕیبێت و کەوتبینە قۆناغ و دەستپێکێکی نوێوە و چیدی سەرقاڵی شتی لاوەکیی نەبین و هەنگاوەکانمان بۆ پێشەوە ڕێگە بگرێتەبەر.

---

١٢٨ـ دیوانی ئەحمەد موختار جاف، لێکدانەوە و پێشەکیی: د. عیزەدین مستەفا ڕەسول: ١٤٥ ـ ١٤٦.

## بەشی دووەم
## كوردستان و نیشتیمانی كوردان، له ئاراسته و ئاماژەكانی قورئاندا

ئەم بەشە لە چەند باسێك پێكهاتووە، بە ئەم چەشنەی خوارەوە:

**باسی یەكەم/ سنوور و جوگرافیای كێوی ( جودی ).**

**باسی دووەم/ پیرۆزیی كێوی ( جودی ) و خاكی كوردستان.**

**باسی سێیەم/ نهێنیی قورئان لە پەیوەندیی نێوان كورد و شاخەكاندا.**

## باسی یەکەم

## سنوور و جوگرافیای کێوی ( جودی )

سنووری جوگرافیای کێوی (جودی)، قسەی زۆری لەسەرکراوە، لەبەرئەوە منیش بە پێویستم زانی لێرەدا بەسەریدا گوزەر نەکەم، بەڵکوو ڕوونکردنەوەی پێویستی لە بارەوە بخەمە ڕوو؛ چونکە ئەمیش وەکو باقی بابەتە پەیوەستەکان بە نەتەوەی کورد، هێنان و بردنی زۆری پێ کراوە. بەڵام دواجار ئەوەی هەقیقەت و ڕاستییە ڕوون دەبێتەوە.

سەبارەت بەم کێوە، (مەلای گەورە) دەڵێت: ((مەعلومە چیای "جودی" لەناو کوردانە. حەتا ئەڵێن: بەقایای لەوح و بزماری سەفینە، لەسەر کێوەکە ماوە))[129].

وە زۆرێك لە ڕاڤەکارانی کۆنی قورئانی پیرۆز، کێوی (جودی)یان خستووەتە ناو سنووری ویلایەتی (موصل)ی ئەوکاتەوە. وەك هەریەکە لە (قورتوبی)[130] و، (نەیسابوری)[131] و، (بەغەوی)[132] و، (شەوکانی)[133]و، ژمارەیەکی تر فەرموویانە:

---

١٢٩ ـ تفسير القرطبي: ٩/ ٤١.

١٣٠ـ تفسير القرطبي: ٩/ ٤١.

١٣١ـ الكشف والبيان، أبو إسحاق أحمد بن محمد بن إبراهيم الثعلبي النيسابوري: ٥/ ١٧١.

((الجودي جبل بقرب الموصل)).

بەڵام هەندێکی تریان ناونیشان و شوێنی شاخەکە نزیك و ڕوونتر کردووەتەوە.

وەك (ئیسماعیل حەقی) دەڵێت: ((الجودي هو جبل بالجزيرة بقرب الموصل أو بالشام أو بآمد))[134].

(ئەبوحەیانی ئەندەلوسی)ش دەڵێت: ((الجودي: علم لجبل بالموصل، ومن قال بالجزيرة أو بآمد، فلأنهما قريبان من الموصل))[135].

هەریەکە لە (ئەبوحەفصی دیمەشقی)[136] و، (خازن)[137] و، (نەیسابوری)[138]یش گوتوویانە: ((استوت السُّفينة على جبلٍ بأرضِ الجزيرةِ بقرب الموصل يقال له الجُودي)).

کورتەواتای ئەو بۆچوونانەی سەرەوە ئەوەیە: کە کێوی (جودی) لە نزیك (موصل)ە. هەندێکیش گوتوویانە لە (جزیرە)، یان لە (ئامەد)ە؛ چونکە ئەوانیش لە (موصل)ەوە نزیکن.

وەك دیارە لێرەدا، مەبەست لە (جەزیرە) کە زانایان شاخی (جودی)یان خستووەتە ناو بازنەی سنووریەوە، خاکی باکووری کوردستانە، ئەمەش حەقیقەتێکە و هەموو سەرچاوەکان سەلماندوویانە؛ چونکە لە ئەو کاتەدا

---

١٣٢ـ معالم التنزيل، محيي السنة أبو محمد الحسين بن مسعود البغوي: ٤/ ١٧٩.

١٣٣ـ فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير، محمد بن علي الشوكاني: ٢/ ٧٢٣.

١٣٤ـ تفسير روح البيان، إسماعيل حقي بن مصطفى الإستانبولي الحنفي الخلوتي: ٤/ ٨٣.

١٣٥ـ تفسير البحر المحيط، محمد بن يوسف الشهير بأبي حيان الأندلسي: ٥/٢٢.

١٣٦ـ اللباب في علوم الكتاب، أبو حفص عمر بن علي ابن عادل الدمشقي الحنبلي: ١٠/ ٤٩٩.

١٣٧ـ تفسير الخازن المسمى لباب التأويل في معاني، علاء الدين علي بن محمد بن إبراهيم البغدادي الشهير بالخازن: ٣/ ٢٣٤.

١٣٨ ـ تفسير النيسابوري: ٤/ ٣٠٤.

کوردستان لە سێ هەرێمی سەرەکیی پێکهاتبوو: ((هەرێمی جەزیرە، هەرێمی شارەزوور، هەرێمی شاخەکان))[139].

هۆکاری دەستنیشانکردنی شاخی (جودی)ش بە نزیکی (موصل)، بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١. لە ئەو سەردەمەدا ویلایەتی (موصل) ناوبانگێکی زۆری هەبووە و ناونیشانێکی ناسراو بووە.

٢. سنووری نێوان (جزیرە) و (موصل) لێك نزیکبوون.

٣. (موصل) لە ئەو کاتەدا سەر بە خاکی کوردستان بووە[140]؛ چونکە کوردستانی گەورە پێش پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) یەکپارچە بووە و سنووری ئیداریی شارەکانیشی بە پێی کات لە سەر یەکبار نەبووە. جاری وا هەبووە (دیاربەکر) بەرەو خوار کشاوە و جاری واش هەبووە (موسل) بەرەو ژوور کشاوە. لەبەرئەوە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوە جێگیربووە کە (جودی) وا لە نزیك (جەزیرە) و هەتا ئێستاش چیایەکی کوردستانییە[141].

هەروەك زانایانی چینی نوێ و هاوچەرخ و ئەوانەش کە بە ویژدان و زانستێکی باش و دوای ئاشنابوون و شارەزاییان لە سنووری کوردستان، نووسیویانە ناونیشانی کێوەکەیان وردتر و نزیکتر بەدەستەوەداوە. وەك (موحیبی) دەڵێت: ((والجزري نسبة إلى جزيرة ابن عمر من بلاد الأكراد وبها كان أجداده ولهم فيها

---

١٣٩ـ بڕوانە/ کوردستان، تأريخها، و أرضها، عاصمتها أربيل، وجبلها الجودي، دراسة قرآنية تأريخية تحليلة: د. حسن خالد مصطفى محمود المفتي، مجلة التجديد، العدد: ١١، ص: ١٢٦.

١٤٠ـ ينظر/ المصدر السابق: ١٢٥ ـ ١٢٦.

١٤١ـ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولڕەحمان سدیق، لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.

المكانة والجاه))[142].

گەریدەی بەناوبانگ (ئیبن بەتوتە)یش کە سالّی (779ک) مردووە، دەڵێت: ((ثم رحلنا من الموصل ونزلنا قرية تعرف بعين الرصد وهي على نهر عليه جسر مبني وبها خان كبير. ثم رحلنا ونزلنا قرية تعرف بالمويلحة ثم رحلنا منها ونزلنا جزيرة ابن عمر وهي مدينة كبيرة حسنة محيط بها الوادي ولذلك سميت جزيرة وأكثرها خراب ولها سوق حسنة ومسجد عتيق مبني بالحجارة محكم العمل وسورها مبني بالحجارة أيضاً وأهلها فضلاء لهم محبة في الغرباء ويوم نزلنا بها رأينا جبل الجودي المذكور في كتاب الله عز وجل الذي استوت عليه سفينة نوح عليه السلام وهو جبل عال مستطيل))[143]. بە کورتیی واتە: لە (موصل)ەوە ڕۆیشتین بۆ (جزیرەی ئیبن عومەر)، کە شارێکی گەورەی جوان بوو، بازاڕێکی چاکی هەبوو، مزگەوتێکی کۆنی لێبوو، خەڵکەکەی ڕێزداربوون و کەسانی ڕێبوار و نامۆیان خۆشدەویست. لە ئەو شارەدا شاخی (جودی)مان بینی کە لە قورئاندا باسی هاتووە و کەشتییەکەی (نوح)ی بەسەرەوە نیشتووەتەوە.

(یاقوتی حەمەوی)یش دەڵێت: ((زوزان –بفتح أوله وثانيه ثم زاي أخرى وآخره نون– كورة حسنة بين جبال أرمينية وبين أخلاط وأذربيجان وديار بكر والموصل وأهلها أرمن وفيها طوائف من الأكراد قال صاحب الفتوح لما فتح "عياض بن غنم" الجزيرة وانتهى إلى قردى وبازبدى أتاه بطريق الزوزان فصالحه عن أرضه على إتاوة وذلك في سنة ٩١ للهجرة وقال ابن الأثير: الزوزان ناحية واسعة في شرقي دجلة من جزيرة "ابن عمر" وأول حدوده من نحو يومين من الموصل إلى أول حدود خلاط وينتهي حدها إلى أذربيجان إلى أول عمل سلماس وفيها قلاع كثيرة حصينة

---

١٤٢. خلاصة الأثر في أعيان القرن الحادي عشر، المحبي: ١/ ٣٦٧.

١٤٣. رحلة ابن بطوطة، ابن بطوطة: ١/ ١١٠.

وكلها للأكراد البشنوية والبختية فمن قلاع البشنوية قلعة برقة وقلعة بشير وللبختية قلعة جرذقيل وهي أجل قلعة لهم وهي كرسي ملكهم وآتيل وعلوس وبإزاء الحراء لأصحاب الموصل ألقي وأروخ وباخوخه وبرخو وكنكور ونيروه وخوشب))[144].

(یانەی جیهانی گەنجانی ئیسلامی)ش بەبێ پێچوپەنا دان بە ڕاستییدا دەنێن و دەڵێن: ((جودي هو الجبل الذي رست عليه سفينة نوح عليه السلام وموطنه كردستان، وهو يعد مهد البشرية الثاني بعد الطوفان حيث انطلقت البشرية من سفوحه لتعمر شتى بقاع الأرض))[145].

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ((تعد كردستان مهد البشرية في الجودي، بعد الطوفان))[146].

گەورەزانای سەردەمیش، (ئیبن عاشور) لە تەفسیرە بە پێزەکەیدا دەڵێت: ((وقد اختلف الباحثون في تعيين جبال أراراط ، فمنهم من قال: إنه اسم الجودي، وعينوا أنه من جبال بلاد الأكراد في الحد الجنوبي لأرمينيا في سهول ما بين النهرين))[147].

بە ئەوەی ڕابوورد دەردەکەوێت، (جودی) شاخێکە لە ناو خاکی کوردستانی باکووردایە و سەر بە شاری (جزیرەی ئیبن عومەر)ە، کە (جەزیرەی بۆتان)یشی پێدەگوترێت. هۆکاری ناونانیشی بە (جودی) وەك مامۆستا (مەلا سەعیدی زمناکۆیی) لە تەفسیرەکەیدا -کە لە (جەمال بابان)ەوە وەریگرتووە-، دەڵێت: ((ئەو کێوە کە ناونراوە بە جودی لەبەرئەوەیە گەلی کورد ناوبراون بە "گۆتی" لە

---

١٤٤- معجم البلدان، ياقوت الحموي: ٣/ ١٥٨.

١٤٥- الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، الندوة العالمية للشباب الإسلامي: ٣/ ٣٨.

١٤٦- الموسوعة الميسرة في المذاهب والأحزاب المعاصرة: ٣٨/١.

١٤٧- التحرير والتنوير، الشيخ محمد الطاهر بن عاشور: ٢٠: ٢٢٣.

کۆندا دانیشتووی دەوری ئەو کێوە بوون))[١٤٨].

١٤٨ـ تەفسیری زمناکۆیی، مەلاسەعیدی زمناکۆیی: ٧/ ١٦٠.

## باسی دووەم

## پیرۆزیی کێوی (جودی) و خاکی کوردستان بە گشتیی

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئامارەی بۆ شوێنی بەرچاو و هەڵکەوتووی کوردستان کردووە و وەك خاکێکی پڕخێر و بەرەکەتی نەبڕاوە، کە شایانی ئەوە بووە ببێتە شوێنی ڕزگاربوونی پێغەمبەر (نوح) و خانەوادە و شوێنکەوتە بڕوادارەکانی. هەروەها بوونی بە لانکەی دووەمی مرۆڤایەتیی لە دوای تۆفانی سەردەمی (نوح)ەوە (سەلامی خودای لەسەربێت) هەتا کۆتایی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە، لەبەرئەوە کوردستان لە ئەو ڕۆژەوە لە ڕوانگەی بڵاوبوونەوەی مرۆڤ بەسەر ئەم گۆی زەوییەدا، بووەتە چەق و سەنتەری دیمۆگرافیی بازنەی ژیانی مرۆڤایەتیی[١٤٩].

ئەم پیرۆزبوونەش زۆرێك لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستانی گرتووەتەوە:

یەکەم/ باکووری کوردستان و بە دیارییکراویش کێوی (جودی) کە شوێنی ڕزگاربوونی (نوح) و خانەوادە و شوێنکەوتووەکانیەتی.

دووەم/ باشووری کوردستان، لە پارێزگای (کەرکوك) و، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای پارێزگای (سلێمانی)، بە دیارییکراویش گوندی (هۆرێن) لە ناحیەی (مەیدان)ی سەر بە قەزای (دەربەندیخان)، کە (حەواری)ەکانی پێغەمبەر (عیسا -سەلامی خودای لەسەربێت)ی تێدا ژیاوە.

لە ڕۆژئاوایشەوە گوندی (شوش)ی سەر بە قەزای (ڕانیە)، کە شوێنی لەدایکبوون و ژیانی پێغەمبەر (ئیبراهیم)ە (سەلامی خودای لەسەربێت).

یەکەم/ کوردستانی باکوور:

---

١٤٩ـ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولرەحمان سدیق.

لـه قورئـانی پـرۆزدا بەشـێك لـه خـاك و نیشـتیمانی كـوردان باسـكراوه، بـه دیـارییكراویش كوردسـتانی بـاكوور، كـه لـه لایـەن خـودای گـەورەوە و بـەپێ و قـەدەمی حـەزرەتی (نـوح) پیرۆزكـراوە. وەك لـه نزاكـەی سـەر زاری پێغەمبـەر (نوح)ەوە، دەفەرموێت: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلًا مُبَارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ﴾. سـورة المؤمنون، الآية: ٢٩.

پێشەوا (قورتوبی) دەفـەرموێت: ((ويقـال: أكـرم الله ثلاثـة جبـال بثلاثـة نفـر: الجودي بنـوح، وطـور سيناء بموسـى، وحـراء بمحمـد صـلوات الله وسـلامه علـيهم أجمعين))[١٥٠]. واته: دەگوترێت خودا سێ شاخی بە هۆی سێ پێغەمبەرەوە پیرۆز و رێزدار كردووە. شاخی (جـودی) بـه هـۆی (نـوح)ەوە، (تـوری سـینا) بـه هـۆی (موسا)وە، هەروەها شاخی (حەرا) بە هۆی پێغەمبـەرەوە. درود و سـەلامی خـودا لەسەر هەموویان بێت.

خودای گەورە خـۆی داوا لـه (نـوح -سـەلامی خـودای لەسـەربێت) دەكـات كـه خوازیاری ئـەوە بێـت لـه شـوێنێكی پڕبەرەكـەت و خێـر و نیعمـەتی هەتاهـەتایی دایبەزێنێت، لەبەرئەوەی ئـەم ویسـتە، ویسـتێكی خودایيـە، ئەنجامەكـەی هـەروا بوو، دواتـر خـوای گـەورە نـزای ئـەم پێغەمبـەرە (ئولولعـەزم)ەی گیراكـرد و، لـه خـاكی پـیرۆزی كوردسـتاندا و بـه دیـارییكراویش لـه شـاخی (جـودی)دا گیرساندییەوە. بـه ئەمـەش كوردسـتان بـوو بـه لانكـەی دووەمـی مرۆڤایـەتیی و سەرچاوەی ژیانی سەر ڕووی زەوی. پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلَا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَنْ رَحِمَ وَحَالَ

---

١٥٠ـ تفسير القرطبي: ٩/ ٤٢.

بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾. سورة هود، الآيات: ٤١ _ ٤٤.

کەواتە کوردستان چ وەك نیشتیمان و چ وەك نەتەوە، خاوەنی خێر و بەرەکەت و فەڕی هەمیشەییە. هەر وەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلامٍ مِنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ﴾. سورة هود، الآية: ٤٨. واتە: ئەی (نوح) وەرە خوارەوە و لە کەشتییەکە دابەزە بۆ دەشتایی. بێوەیی و سەلامەتیی لە لایەن ئێمەوە بۆ خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن.

ئەو ڕێز و شکۆیەش بۆ ئەو خاکەڕایی و خۆبەکەمگرتنەی کورد و پێکهاتەی خاکەکەی دەگەڕێتەوە، کە وەك خەسڵەتێکی جوان و شیرین، زۆربینەی کورد هەڵگرینی. بە پێچەوانەی خەڵکی شوێنەکانی ترەوە، کە بە هۆی کیبر و لوتبەرزییانەوە، خودای گەورە نەویی و نزمی کردوونەتەوە. زانای موفەسیری تابیعی (موجاهید) دەفەرموویێت: ((أن الله حين غرّق الأرض، جعلت الجبال تشمخ، فتواضع الجوديّ، فرفعه الله على الجبال، وجعل قرار السفينة عليه))[١٥١]. واتە: کاتێك خودای گەورە زەوییە نزمەکانی توشی خنکان و نغرۆبوون کرد، کێوەکان لوتبەرزییان نوواند، جگە لە کێوی (جودی) کە تەوازوعی نوواند، لەبەر ئەمە خودای گەورە پلەی بەرزکردەوە بەسەر کێوەکانی تردا و کردی بە مەنزلگەی کەشتییەکەی (نوح -سەلامی خودای لەسەربێت).

---

١٥١ـ تفسير الطبري: ٢٢/ ٥٨٢ ـ ٥٨٣.

هەروەها پێشەوا (قورتوبی) دەفەرموێت: ((لما تواضع الجودي وخضع عز، ولما ارتفع غيره واستعلى ذل، وهذه سنة الله في خلقه، يرفع من تخشع، ويضع من ترفع))[152].

کێوی (جودی) کە بەشێکە لە خاکی کوردستان، تەنانەت هێندە پیرۆز و ڕێزدارە، یاوەری گەورە ڕاڤەکاری قورئان (ئیبن عەباس) گوتوویەتی خودای گەورە سوێندی پێخواردووە. وەك دەفەرموێت: «قوله: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ يعني مسجد نوح الذي بني على الجوديّ، والزيتون: بيت المقدس»[153]. واتە: مەبەست لە ﴿وَالتِّينِ﴾ مزگەوتەکەی (نوح) پێغەمبەرە کە بەسەر شاخی (جودی)ەوە بیناکراوە.

تەنانەت هەندێك لە زانایان دەڵێن: (ئادەم -سەلامی خودای لەسەربێت) بەشێك لە بینای (کەعبە)ی لە تاشەبەردەکانی کێوی (جودی) پێکهێناوە. هەروەك گەورەیانی تابیعین (عەتا) و (سەعید) و جگە لە ئەوانیش، ئەم بۆچوونە پشتڕاستدەکەنە و دەفەرموون: ((فبنى البيت من خمسة أجبل: من طور سيناء، وطور زيتون، ولبنان، والجودي))[154].

زیاد لە ئەمانە، تەنانەت بۆچوون لەسەر ئەوەش هەیە، کە کێوی (جودی) یەکێکە لە شاخەکانی بەهەشت. لە ئەم بارەیەوە پێشەوا (قورتوبی)، دەفەرموێت: ((ويقال: إن الجودي من جبال الجنة، فلهذا استوت عليه))[155].

جگە لە شاخی (جودی)، لە چەند فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) چەند سەرچاوەیەکی ئاوی بە پیرۆز هەژماردووە و ئەوەی

---

١٥٢ـ تفسير القرطبي: ٩/ ٤٢.

١٥٣ـ تفسير الطبري: ٢٤/ ٥٠٣.

١٥٤ـ تأريخ الطبري: ١/ ٨١. تفسير القرطبي: ٢/ ١٢١. تفسير ابن كثير: ١/ ٤٢١. روح البيان: ١/ ١٨٤.

١٥٥ـ تفسير القرطبي: ٩/ ٤٢.

درکاندووه، که ناوی (فورات، نیل، سەیحان، جەیحان) سەرچاوەکانیان له بەهەشتەوەیە. وەك دەفەرموویت: «فُجِّرَتْ أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ مِنْ الْجَنَّةِ الْفُرَاتُ وَالنِّيلُ وَسَيْحَانُ وَجَيْحَانُ»[156]. هەروەها له (تەوارت)یشدا هەمان ئەم ڕووبارانه ناویان هاتووه بە هەمان واتای فەرموودەکە. ئاشکرایشه که سەرچاوەی هەریەکه له ڕووباری (دیجله) و، (فورات) و (سەیحان)، له خاکی کوردستاندایە[157].

کەواته خاکی کوردستان خاکێکی بەهەشتئاسای پیرۆزه و سەرچاوەی ژین و ژیانەوەن له هەموو سەردەمێکدا و بۆ هەموو نەتەوەیەك.

هەر لەبەر ئەمەشه هەر شتێك، یان هەر شوێنێك خێر و نیعمەتی لەڕادەبەدەری لێببێت، ناوی (موبارەك)ی بەسەردابڕاوه. لەبەرئەوه لێرەوه (راغیبی ئەصفەهانی) دەڵێت: ((ولما كان الخير الإلهي يصدر من حيث لايحس، وعلى وجه لايحصى ولايحصر، قيل لكل ما يشاهد منه زيادة محسوسة هو مبارك، وفيه بركة))[158].

له ڕوانگەی ئەو ئایەت و فەرموودە و فەرمایشتانەی سەرەوە، ئەوە ڕووندەبێتەوە، که ئەو نیعمەت و بەرەکەتەی خودای گەورە بە کوردستانی بەخشیوه هەمیشەیی دەبێت! چونکه وشەی (البركة) وەك (راغیبی ئەصفەهانی) دەڵێت: ((ثبوت الخير الإلهي في الشيء))[159]. واته: بەرەکەت بریتییه له جێگیربوونی خێرێکی خودایی له ئەو شتەدا. هەروەها له تەفسیری ئایەتی: ﴿ربِّ أنزِلني مُنزلا مُباركا﴾دا، دەڵێت: ((أي حيث يوجد الخير الإلهي))[160]. واته: خودایه له شوێنێکی وا دامبەزێنه که نیعمەتێکی خودایی هەمیشەیی و نەبڕاوەی پێبەخشرابێت.

---

156ـ رواه أحمد، برقم: ٧٥٤٤. والطبراني في الأوسط، برقم: ٧٦٧٣.

157ـ تأريخ الكرد في العهود الإسلامية، د. أحمد محمود الخليل: ٢١.

158 ـ مفردات ألفاظ القرآن: ١/ ٨٤.

159 ـ مفردات ألفاظ القرآن: ١/ ٨٣.

160 ـ المصدر السابق، ١/ ٨٤.

## دووەم/ پیرۆزیی باشووری کوردستان، ئەم خاڵەش لە (سێ) بڕگەدا دەخەینەبەردەست:

١ـ پارێزگـای (کـەرکوك) و پارێزگـای (سـلێمانی)، بـە دیـارییکراویش گونـدی (هـۆرێن) لــە ناحیــەی (مەیــدان)ی ســەر بــە قــەزای (دەربەنـدیخان) و قــەزای (دوزخورماتوو)، کە (حەواری)یەکانی پێغەمبەر (عیسا)یان تێدا ژیـاوە (سـەلامی خولهایئەلەبلاوبیئتوه):گەورەزانا و هەڵکەوتووی کورد، مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مـودەریس)، لــە تەفسـیرە بــە پێزەکەیـدا (مواهــب الـرحمن)، دەربـارەی (حەواری)ەکان، کە بڕواداراني شوێنکەوتووی حەزرەتی (عیسا)ن، دەفـەرمووێت: ((وحواريو عيسى عليه السلام كانوا اثنى عشر رجلا. وقد تفرقـوا بعـد رفعـه عليـه السلام في الأطراف، والمشهور أن بعضا مـنهم جاؤوا إلى ناحيـة "ميـدان" التابعـة لقضـاء "خـانقين" والناحيـة المشـهورة بـ"هوريّـن" المخففـة لحـواريين، وبعضـهم سكنوا في "كركوك" و واحد منهم يسمى بمتـى سـكن في محـلّ يسـمى الآن بــ"طوز خور ماتو" التابعة لمحافظة "صلاح الدين"، والمحل فيه "ملح" والإسم مركـب مـن ثلاث كلمات هي: "طوز، حـواري، متـى". أي: الملـح المنسـوب للحـواري المسـمى باسم متى، والله تعالى أعلم))[١٦١].

واتە: حەوارییەکانی پێغەمبەر (عیسا –سەلامی خـودای لەسـەربێت)، (دوازدە) کەس بوون، لەدوای بەرزکردنەوەی پێغەمبەرەکەیان بۆ ئاسمان، بڵاوەیـانکرد بـە زەویدا و وا بەناوبانگە هەندێکیان هاتوونەتە ناحیەی (مەیدان)ی سـەر بـە قـەزای (خانەقین) و ناحیەی (هۆرێن)، کە وشەی (هۆرێن) لە بنەڕەتدا (حـەواری) بـووە، دواتــر بەســەر زمانــەوە ســووککراوە و بــووە بــە (هــۆرێن). هەنـدێکی تـر لــە

---

١٦١ـ مواهب الرحمن في تفسير القرآن، للشيخ عبدالكريم المدرس: ٧/ ٢٣١.

(حەواری)یەکان نیشتەجێی (کەرکوك) بوون. یەکێکیشیان کە ناوی (مەتا) بووە لە شوێنێکدا گیرساوەتەوە، کە ئێستا پێیدەگوترێت (دوز خورماتوو)، سەربە پارێزگای (صەلاحەدین)ە. ئەو شوێنە (خوێ)ی لێبووە، لەبەرئەوە ناوەکەش لە سێ وشە پێکهاتووە: (دوز، خورر، ماتوو). واتە: ئەو (خوێیەی کە هی مەتا)یە، (مەتا)یش یەکێك بووە لە حەوارییەکان.

مامۆستای (مودەڕیس)، بە زمانی شیرینی کوردیش، لە (سەرچاوەی ئایین)دا دەفەرموێت: ((مەشهورە دێی "هۆرێن" لە ناحیەی "میدان"ی تابعی قضای "خانەقین"، بەناوی "حەوارییین" ناوبراوە، لە زمانی کوردییدا بووە بە "هۆرێن". حەتا لە بەعضی ئەهلی کەشف لە عەهدی حەضرەتی شیخ المشائخ "عمر ضیاء الدین"[162] قدس سره بیسراوە کە لە ئەو حەوارییینەی لە ئەو مەوقیعەدا بە "موکاشەفە" بینیوە))[163].

جگە لە ئەمە، پارێزگای (کەرکوك) خاوەنی پیرۆزییەکی ترە، ئەویش لەخۆگرتنی جەستەی پیرۆزی هەرکام لە حەزرەتی (عوزەیر) و (دانیال)ە، سەلامی خودایان لێبێت، کە گوایە لە ئەوێدا پەیامبەرێتییان کردووە و ژیاون و هەر لە ئەوێش وەفاتیانکردووە و نێژراون. وەك دەگوترێت مەزارەکەی لە ناو قەڵاکەدایە و هەتا ئێستاش خەڵك بە ئەو ناوەوە سەردانیدەکەن[164].

٢ـ پارێزگای (دهۆك) و بە دیارییکراویش گوندی (شوش)ی سەر بە قەزای

---

١٦٢ـ شێخ (عومەری زیائەدین)، ناسراو بە (شێخ عومەری بیارە)، یەکێکە لە پیرانی تەرقەت، هەروەك جەنابی (مامۆستای مودەریس) بە: (شیخ المشائخ) وەسفیکردووە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینی، لە (تەوێڵە)ی ناوچەی (هەورامان) لەدایکبووە و لە ساڵی ١٩٠٠ لە (بیارە) کۆچی دواییکردووە.

١٦٣- سەرچاوەی ئایین، مەلا عبدالکریمی مدریس: ١١٣.

١٦٤ـ هەرچەندە ئەم قسەیە دەگوترێت و باسدەکرێت، بەڵام دڵنیانیم چەسپاوە، یان نا، بەندەش سۆراغم کرد، بەڵام جگە لە قسەی دەماودەم، هیچم چنگ نەکەوت.

(ئاكرێ). هەروەها ڕۆژئاوای پارێزگای (سلێمانی)، ئەمیش بە دیارییکراوی قـەزای (ڕانیە) دەگرێتەوە، کە شوێنی لەدایکبوون و ژیانی پێغەمبەر (ئیبراهیم -سـەلامی خودای لەسەربێت) بووە.

لە ئەم بارەیەشەوە دیسان مامۆستای (مودەڕیس) دەفەرموێت: ((وفي روايـة ولد في "شرقات"، وأخـرى فـي "شـوش" قريـة قـرب قضـاء "عقـرة"، مـن أعمـال الموصل، وذلك لأن أهل ذلك العصر كانوا غالبا يصطافون في بعض بقـاع الشـمال. ومن المشهور أن محل النار التي ألقوه عليه السلام فيها بين قضاء "رانية" وقضاء "قلعة دزة". وقيل: إن محلها بلدة "أورفة" من كردستان تركيا، والله أعلم))[١٦٥].

واتە: لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە (ئیبراهیم) لـە گونـدی (شـوش)ی نزیـك (ئاکرێ) لـەدایکبووە؛ چـونکە خـەڵکی ئەوسـەرمە بـە زۆریـی هاوینـان بـۆ ناوچـە شاخاوییەکانی باشوور دەچوون. وایش بەناوبانگە کە ئـەو شـوێنەی ئاگرەکـەیان تێـدا کـردەوە و (ئیبراهیم)یـان خسـتە ناویـەوە لـە نێـوان قـەزای (ڕانیـە) و (قەڵادزێ)دایە. هەندێکیش دەڵێن لە (ئورفە)ی کوردستانی (تورکیا)یـە. خـوداش زاناترە.

٣- پادشای گەورە و بەهێز و خاوەندەستەڵات (زولقەرنەین)، کە وا بەناوبانگـە نـاوی (ئەسـکەندری مەقـدۆنی)ە. یـەکێك بـووە لـە ئـەو (چـوار) پادشـا و فەرمانڕەوایانەی حوکمی هەموو زەویی کردووە و مسـوڵمان بـووە. «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: لَمْ يَمْلِكَ الأَرْضَ كُلَّهَا إِلاَّ أَرْبَعَةٌ: مُسْلِمَانِ وَكَافِرَانِ، فَأَمَّا الْمُسْلِمَانِ: فَسُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُد، وَذُو الْقَرْنَيْنِ، وَأَمَّا الْكَافِرَانِ فَبُخْتَ نُصَّرَ، وَالَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ»[١٦٦].

بۆچوونی ئەوە لەئارادایە ناوبراو گڵکۆی پـیرۆزی لـە خـاکی شـیرین و بەفـەڕی

---

١٦٥- مواهب الرحمن: ١/ ١٨٧.

١٦٦- رواه ابن أبي شيبة في مصنفه، برقم: ٣٢٥٧٩.

کوردستاندایه و به دیاریبیکراویش له ناوچەی (شارەزوور) و ناحیەی (خورماڵ).

مامۆستای (مودەڕیس) لە هەردوو تەفسیرە بە پێزەکەیدا، ئەم تێڕوانینەی خۆستووەتە بەردەست و دەفەرمووێت: ((والمشهور أنه مات في العراق، قيل في قلعة مركز ناحية كولعنبر "خورمال"))[167].

واتە: ((لە ئەنجامدا ئەسکەندەر لە گەڕانەوەیدا لە خورماڵدا نەخۆشکەوت و مرد). هەندێك زانای مێژوو دەڵێن: هەر لە قەڵاکەی خورماڵدا لە شارەزوور نێژراوە))[168].

هەروەها زانای ناوداری وڵاتی شام (سوکەری)، کە دەتوانین وەك گەڕیدەیەك بیناسێنین، لە کتێبە بە پێزەکەیدا (سمير الليالي) دەڵێت: ((وبقضاء "كلعنبر" خرائب "مدينة شهرزو" كانت قديما مقر حكومة الأكراد. وعلى مقربة منها قبة خربة، يقال: إنها من آثار اسكندر الكبير. وبهذا القضاء "قلعة كلعنبر" وهي من آثار السلطان سليمان بن السلطان سليم))[169].

واتە: لە قەزای گوڵعەبەر (خورماڵ)دا پاشماوەی (شاری شارەزوور) هەیە، کە لە پێشدا بنکەی حکومەتی کوردان بووە. وە لە نزیك شارەکەوە گومبەتێکی ڕووخاو هەیە، دەگوترێت: لە شوێنەوار و دەستکردی (ئەسندەری گەورە)یە. هەر لەو قەزایەدا (قەڵای گوڵعەنبەر) هەیە، کە ئەمەیان دروستکراوی (سوڵتان سلێمانی کوڕی سوڵتان سەلیم)ە.

بێگومان بوونی کەسێکی لە ئەم چەشنە لە خاکی کوردستاندا، لە ماوەی ژیانیدا،

---

١٦٧. مواهب الرحمن: ٥/ ٢٠٥.

١٦٨. تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس: ٥/ ٦٨.

١٦٩. سمير الليالي، محمد أمين صوفي السكري: ١/ ١٢٢.

یاخود دوای بەخاکسپاردنی، جێگەی بایەخە! چونکە بەڵگەی ئەوەیە نەتەوە و نیشتیمانی کورد جێگەیەکی ئارام و ئەمین بووە بۆی و بەلایەوە گونجاوترین و لەبارترین شوێن بووە بۆ کورسی دەسەڵاتەکەی –بە زیندوویی–، هەروەها بۆ پاراستن و پشوودانی ڕۆحی –بە مردوویی–.

بە ئەوەی خستمانە ڕوو، دەردەکەوێت کە خاکی کوردستان –بە هەر چوارپارچەکەیەوە–، شوێنێکی پیرۆز و پڕخێرە و بە درێژایی مێژووش پەناگەی پێغەمبەران و گەورەهەڵکەوتووان بووە. هەبوونی ئەو هەموو زانایانەی کە پێشەنگبوون لە بواری زانست و ئاییندا، بەڵگەی ئەوەن کە کاریگەریی پێغەمبەران و بانگەوازەکەیان بەسەر نەتەوەکەمانەوە دیار و بەرچاو بووە.

لە لایەکی ترەوە بە ئامانجگرتنی کوردستان لە لایەن ناحەزانمانە و دابەشکردنی بەسەر نەیارەکانماندا بەڵگەی زیندوون لەسەر ئاستی مەترسییان لە یەکگرتوییمان، کە زامنی پێشکەوتن و سەروەریی زیاترمانە.

بێگومان لەگەڵ ئەو هەموو خێر و بەرەکەتەی کە خودای گەورە بە خاکەکەمانی بەخشیوە، ئەگەر یەکگرتوو و یەکپارچە بین ئەوکات بەرچاوتر و بەهێزتر دەبین، بەڵام دیارە دوژمنانی زلهێز، پەرتەوازەیی و دوورەپەرێزییمان بە ڕێگر داناوە لەبەردەم هەموو جوڵە و چالاکیی و پێشوەچوونەکانمان.

داوام لە قاپی یەزدانی مەزنە کە خەڵك و خاك و دەنگ و ڕەنگ و سەنگمان یەکبخات و لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و یەکپارچەدا، شکۆ و هێز و وزەی زیاترمان پێبدات. بۆ بەرگرییکردن و پاراستنی دینی پیرۆزی ئیسلام و سەرجەمی مسوڵمانان و ستەمدیدەکانی سەر ڕووی زەوی.

## باسی سێهەم

## نهێنیی قورئان، له پەیوەندیی نێوان کورد و شاخەکاندا

له ناو کوردەکاندا وتەیەك وەك پەندی پێشینان دەگوترێتەوە که دەڵێت: (تاکە دۆستی کورد چیاکانن).

مێژووی ئەم نەتەوەیەش ئەوە پشتڕاستدەکاتەوە کە چیاکان ئەو قەڵا سەختانەبوون که کوردەکان له ڕۆژانی تەنگانە و لێقەوماندا پەنایان بۆ بردووە و هەزاران ساڵە ئەم نەتەوەی له تیاچوون و توانەوە پاراستووە.

پەیوەندیی کورد و چیا بەجۆرێك له مێژینە و دێرینە تەنانەت ئەو ئەفسانە و چیرۆکانەشی که بۆ مەبەستی دۆزینەوەی بنەچە و سەرهەڵدانی ئەم ڕەگەزە (کورد) هۆنراونەتەوە خاوەنەکانیان نەیانتوانیوە کورد و چیا له خەیاڵدانیاندا لێك جیابکەنەوە[170].

له مێژووی کورددا شاخەکان فەزڵ و چاکەی زۆریان بەسەر نەتەوەی کوردەوە هەیە و له زۆرێك له ڕۆژگارە سەخت و دژوارەکاندا تاکە پشت و پەنا بوون و له ئەو هێرش و لەشکرکێشییانەی دەکرایە سەر کورد، قەڵای قاییم و سەنگەری ڕووبەڕووبوونەوە بوون.

هەر لەبەرئەوە میللەتی کورد هەمیشە شاخی خۆشویستووە، له هەر شوێنێك کورد هەبووبێت، دەبینیت له پەنای شاخێکدا لەنگەریگرتووە و شارۆچکە، یان گوند و لادێ و ئاوەدانیی بنیاتناوە. دیارترین نیشانەکانیشی بنیاتنانی هەریەکە له شارۆچکەکانی (ڕەواندز، ئامێدی، بەدلیس، قەڵاچوالان و هتد..). کە له هەمان کاتدا مەڵبەندی سیاسیی و هەم شوێنی نیشتەجێبوون بوون.

ئاوێتەبوونی کورد و چیا هەتا ئاستێکە هەر منداڵێك کاتێك دەیەوێت وێنەیەك

---

١٧٠ـ کورد و چیا، محمد بەکر: ٥٨.

بکێشێت، وێنەی شاخ و خۆر و گوندێکیش لە بناریدا دەکێشێت.

یان دەبینین لە نەورۆزدا ئاگری ئەو جەژنە دەبەنە سەر لووتکەی چیاکان، ئەمەش وەك هێمایەك بۆ بەستنەوەی سەرکەوتنەکان بە شاخ و چیاکانەوە و بەرزنرخاندنی رۆڵیان.

لەبەر ئەوەشە دەیان شاعیرمان بە بالای کێوەکاندا شیعریان گوتووە و کردوویانە بە هەوێنی شیعریان و پەیوەندیی نێوان و کورد و شاخەکانیان پێکەوە گرێداوە.

ئەم خۆشویستن و پەیوەستبوونەش بە شاخەوە دوور نییە لە پیرۆزیی چیای (جودی)ەوە سەرچاوەیگرتبێت، کە خودای گەورە کردوویەتی بە لانکەی دووەمی مرۆڤایەتیی و خاکی کوردستانی پێ پیرۆزکردووە.

هەر ئەم پەیوەندییەشە وای لە گەڕیدە و کوردناسان کردووە کاتێك باس لە کورد دەکەن یەکسەر بیبەستنەوە بە شاخەکانەوە. بۆ نمونە (ڕێنیە موریس) دەڵێت: ((چیا بۆ کورد دروستبووە و کوردیش پاژێکە لە چیا و لێی جیا نابێتەوە. کورد وەك دیمەنی چیا جوان و بەرزە، چیا هاوڕێ و پارێزەری کوردە))[171].

(میجەر نوئێل)یش دەڵێت: ((کورد نەتەوەیکی کێونشینە و هەموو شێوازەکانی دانیشتووانی شاخ لە ئەواندا هەیە. وەك: شەیدای ئازادیین و شانازیی و بەخ دەکەن بە شکۆ و بەرزیی نەتەوایەتییانەوە..))[172].

(مینورسکی)ش دەڵێت: ((بە گشتیی دەتوانین بڵێین کورد و چیا لێك جیا نابنەوە، هەر کە دەشتایی دەستپێدەکات ئەوا کورد زەوییەکە بۆ عەرەب و

---

١٧١ـ کورد و چیا: ٦٠.

١٧٢ـ چەردەباسێك لە بارەی کوردانەوە، میهرداد ئیزەدی: ٤٢٧. وەرگیراو لە/ کورد و چیا: ٨٣.

فارس و تورك بەجێدەهێڵێت، لە دەوروبەری وانیش بۆ ئەرمەنەکان))[١٧٣].

کورد هەرکات دوژمـن پـەلاماری دابێـت پـەنای بـۆ چـیاکان بـردووە، بـە وێنـەی مرۆڤێـك لـە چـۆڵەوانییدا گـورگێگ پـەلاماری دەدات و درەختێکـیش لـە نزیکیـەتی ڕاسـتەوخۆ دەچـێتە سـەر درەختەکـە بـۆ ئـەوەی گورگەکـە لـە ناوینـەبات، ئـەو درەختە هەمان ڕۆڵی چیا دەبینێت، هەروەك چۆن مرۆڤەکە نایـەوێت لـە درەختەکـە دووربکەوێتەوە[١٧٤].

لە هەموو سەرچاوە مێژووییەکانیشدا ئەوە چەسپاوە، کە خـاکی کـورد لـە ڕووی بەڕێوەبردنــەوە بەســەر (چــوار)، یــان (ســێ) هــەرێمی ســەرەکییدا دابەشــبووە، ئەوانیش: هەرێمی (جزیرە) و هەرێمی (ئازەربایجان و ئـەرمینیا و ئـاران) و هـەرێمی (خوزستان) و هەرێمی (چیاکان/ کوێستان و شارەزوور).

لەبەرئەوەی کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە و چەند زنجیرەچـیایەکی بڵنـد و درێـژ دەگرێتــەخۆ و زۆرییـنــەی ڕووبەرەکــەی لــە چــیای بڵنــد و ســەخت پێکهــاتووە، لــە سەردەمانی پێش ئیسلامەوە ناوی کورد بە (چیا)وە لکاوە. دوای پرۆسـەی فـەتحی ئیسلامیش، کوردستان یەکەم وڵاتی چیایی بوو لە بەرەی ڕۆژهەڵاتـەوە کـە عەرەبـە مسوڵمانەکان پێیان نایە ناویەوە. لەبەر ئەم هۆیە و لـە ژێـر کاریگـەریی ئـەدەبیاتی (ساسانی) و وەك وەرگێڕانێك بۆ ناوی (قوهسـتان – کوێسـتان)، نیشـتیمانی کـورد لای عەرەبەکان پتر بە (جبال الأکراد) دەناسرا[١٧٥].

شاعیر (بەشار بن بەرد) لە شیعرێکدا دەڵێت:

---

١٧٣- مینورسکی و نووسینەکانی لە بارەی کورد (لە سەردەمی ئیسلامەتیی هەتا سەردەمی خەلافەتی عوسمانی)، تاریق محمد عەبدولرەحیم: ١٠٤. وەرگیراو لە/ کورد و چیا: ٢٠٩.

١٧٤- کورد و چیا: ٢١١.

١٧٥- کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئسلامییدا، د. زرار سەدیق: ٤٣.

جُونَ الرُّبَى مِثْلَ جِبَالِ الْكُرْدِ

مُنْبعقِ الْقصْفِ هَزِيم الرَّعْدِ[176].

له شیعرێکی (ئەبو میقداد)یشدا هاتووه:

جبال بها الأكرد صمّ صخورها[177].

هەروەها له دابەشكردنی گۆی زەوی بەسەر هەرێمەكاندا، كوردستان كەوتووەتە هەرێمی (چوارەم) سەربە بورجی (گا)، كە بە (الأكراد الجبليون) ناوبانگیان دەركردووه. هەروەها لە كتێبی تەرەوه مێژوونووسان و جوگرافیاوان و گەڕۆكانی مسوڵمانیش بە هەمان چەشن كوردستانیان بە (جبال الأكراد– جبل الكرد) وەسفكردووه.

له دوای دەركەوتنی ناوی كوردستانیش و هەتا سەردەمی (مەملوكی) و سەدەكانی دواتر، سەرچاوه (مەملوكییەكان) هەر (جبال الأكراد)یان بەكاردەهێنا[178].

جێگەی باسیشه بەرزترین شاخەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست له خاكی كوردستاندایە، ئەوانیش شاخەكانی (زاگرۆس) و (ئەرارات)ن.

سەرەڕای ئەوەش، ئەوەتە شاخەكانی كوردستان هەمیشە مەڵبەندی خۆڕاگریی و پشوودرێژیی و خەباتی كوردایەتیی بوون. لە هەمان كاتدا سەرچاوەی زانست و ڕۆشنگەرییش بوون، ئەمەش بە هەڵێنجان له ئایەتی پیرۆزی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾. سورة الفاطر، الآية: ٢٧

---

١٧٦. ديوان بشار بن برد: ٤٨٥.

١٧٧. معجم البلدان، ياقوت الحموي: ٢/ ٤٩٢.

١٧٨. كورد و كوردستان له ڕۆژگاری خیلافەتی ئسلامییدا: ٤٣ ـ ٤٤.

و ٢٨.

حەتمەن بەبێ هۆ نییە لێرەدا خودای میهرەبان لەگەڵ باسکردنی شاخەکاندا دێتەسەر باسی زانست و زانایان.

بە بۆچوونی بەندە، دەبێت پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان شاخ و زانستدا هەبێت، هەر وەك چۆن هەتا هەنوکەش لە ناوچە شاخاوییەکاندا زانای گەورە و دیار هەڵکەوتوون و لە ناوچە شاخاوییەکاندا هەمیشە حوجرە و فێرگەی ئاینیی هەبووە و هەیە. بۆ نمونە حوجرەکانی (هەورامان و، قەرەداغ و، بەرزنجە) و .. هتد کە سەرجەمیان لە ناوچە شاخاوییەکاندان.

ئەمەش هیچ نامۆییەکی تێدا نییە؛ چونکە خودای گەورە کێوەکانی بە سەرچاوەی زانست و ئیلهام داناوە. وەك لە سورەتی (الکهف)دا دەبینین یارانی ئەشکەوت بۆئەوەی میهر و ڕێنوێنیی پەروەردگار وەدەستبێنن، چوونە ناو ئەشکەوتی شاخەکانەوە. خودای گەورە لە ئەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقًا﴾. سورة الكهف، الآية: ١٦.

گەورە و سەروەریشمان (موحەمەد -دروود و سەلامی خودای لەسەربێت) لە کاتی خۆسازدان و ئامادەکارییدا بۆ دابەزینی نیگای ئاسمان، دەچووە ئەشکەوتی شاخەکان و لە ئەوێوە خۆی ڕێکدەخست و پەرستشی بیرکردنەوە (تفکُر)ی ئەنجامدەدا.

کەواتە دەرکەوت شاخەکان چ لە ڕووی پاراستنی کیان و قەوارەوە، چ لە ڕووی زانست و پێشکەوتنەوە ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە بزاوتی نەتەوەییدا، ئەمەش بەشێکە لە بەزەیی پەروەردگار، کە پەناگایەکی وەهای بۆ فەراهەمکردووین.

لەبەرئەوە پێشینانی کورد زۆر ژیرانە و هۆشیارانە بناری شاخەکانیان

دەستنیشانکردووە بۆ نیشتەجێبوون و بە لەبەرچاوگرتنی سوودە زۆرەکانی ئەوێیان هەڵبژاردووە. دوژمنانی کوردیش هەمیشە ویستوویانە کورد لە هاوڕێیەتیی و هاونشینیی شاخەکان دابڕن.

بۆ نمونە ڕژێمی لەناوچووی (بەعس) کۆمەڵگە زۆرەملێکانی لە دەشت و ناوچە تەختەکاندا بنیاتنا و دواتر گوندنشینەکانی بناری شاخەکانە بۆ ڕاگواست، کە بێگومان ئەمە سیاسەتێکی داڕێژراوی دژ بە کورد بوو.

دەگێڕنەوە کە (صەدام حسین) گوتوویەتی: ((ئەگەر بمانتوانیایە چیاکان بە شۆفڵ تەخت بکەین، ئیدی شتێك نەدەبوو بە ناوی کێشەی کورد))[١٧٩].

ژیان لە دامێنی چیاکاندا گەلێك کەڵك و سوودی فرەچەشنی هەیە. لە ئەوانە:

١. شاخەکان دیمەنێکی جوان و سەرنجڕاکێشیان هەیە و تام و چێژێکی تایبەت بە ژیان دەبەخشن.

٢. ناوچە شاخاوییەکان گژوگیای زۆری لێدەڕوێت، لە ئەم ڕووەشەوە جێگەی بایەخە بۆ کورد؛ چونکە کورد زۆرێکی سەرقاڵی ئاژەڵدارییە و بوونی گژوگیا و پوش و پاوەنیش زەرووریی و پێویستە بۆ ئالیکی ئاژەڵ.

٣. کێوەکان بە هۆی بارانی زۆرەوە، بڕێکی باش ئاوی بەفر و باران گلدەدەنەوە، لەبەرئەوە دەبینین پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) داوای بارانی بەردەوامی بۆ شاخ و گردەکان کردووە و فەرموویەتی: «اللهم على رؤوس الجبال والآكام وبطون الأودية ومنابت الشجر»[١٨٠].

٤. ناوچە شاخاوییەکان دوورن لە کارەساتی سورشتیی و بومەلەرزە؛ چونکە خودای گەورە کێوەکانی وەك مێخ داکوتیوە بۆ پاراستن و دامەزرانی زەوی لە

---

١٧٩- کورد و چیا، محمد بەکر: ٦٠.

١٨٠- رواه البخاري في صحيحه، برقم: ٩٧١.

جوڵـه و لـەرزە. وەك دەفـەرمووێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾. سـورة النبأ، الآيـة: ٦ و٧. هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾. سـورة النازعـات، الآية: ٣٢.

٥. شاخەكان ژینگەیەكی سازگار و ئاو و هەوایەكی خـاوێنی هەیـە، ئـەویش بـە هۆی بوونی سەوزایی و دار و درەخت.

هەر لەبەرئەوە خودای میهرەبان فەرمانی بە (مێشهەنگ) كردووە، بە شـاخەكاندا بگەڕێت و بـژی و لـە بـەروبومی شـاخەكان بخـوات، بـۆ ئـەوەی بەرهـەمی جـوان و بەسوود بە دەستەوەبدات، كە مایەی چارەسەری و شیفایە.

وەك دەفـەرمووێت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾. سورة النحل، الآية: ٦٨ و ٦٩.

٦. كێوەكان سەنگەر و قەڵای قایمن، بە تایبـەتیی لـە ڕۆژگـاری ڕابـردوودا و بـە درێژایی مێژوو، بۆ ئێمەی كـورد پشـت و پـەنا بـوون. خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا﴾. سورة النحل، من الآية: ٨١

٧. نیشاندەری هێز و دەستەڵاتی پەروەردگارن و مایەی تێڕامـان و تێفكـرینن لـە دروسـتكراوەكانی. دیسـانەوە پـەروەردگارمان سـەبارەت بـە ئـەم خاڵـەش دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ﴾. سورة الغاشية، الآیات: ١٧_١٩.

ئەمانە و گەلێك سوودی تر كە لە ژیانی بناری شاخەكاندا هەستی پێدەكرێت و دەزان

# بەشی سێیەم
# جابانی کوردیی
# ژیان و ڕۆڵ، کەسایەتیی، نەوە و هۆزەکەی

بەشی سێیەم ئەم باسانەی خوارەوە دەگرێتەخۆ:

**باسی یەکەم/ ژیان و ڕۆڵ و کەسایەتیی.**

**باسی دووەم/ جابانی کوردیی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا.**

**باسی سێیەم/ ( جابانی کوردیی ) فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە.**

**باسی چوارەم/ هۆکاری ناڕۆشنیی ژیانی ( جابانی کوردیی ).**

**باسی پێنجەم/ سەرگوزەشتەی گەیشتنی ( جابانی کوردیی ) بە پێغەمبەر و بڕوا پێهێنانی.**

**باسی شەشەم/ ( جابانی کوردیی ) پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان دەستی بە جیهاد و کاری بانگەواز کرد.**

**باسی حەوتەم/ هۆزی ( جاوان/ گاوان ) و نەوەکانی ( جابانی کوردیی ).**

## باسی یەکەم
## ( جابانی کوردیی )
## ژیان و ڕۆڵ و کەسایەتیی

کاتێك باس لە مێژووی هاوەڵان و پیاوە مەزنەکانی ئیسلام دەکەین، دەبینین لە ناو تیرە و هۆز و نەتەوە و ناوچە جیاوازەکاندا کەسانی هەڵکەوتوو و ناودار هەیە، کە بە ناوی تیرە و هۆز و ناوچەکانیانەوە ناسراوبوون ناو و ناوبانگیان دەرکردووە. نمونەش وەك: (ئەبوبەکری قورەیشی، بیلالی حەبەشی، سەلمانی فارسی، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، حارسی کوڕی موعاویەی کوفی، صوهەیبی ڕۆمی[١٨١]، بەرائی کوڕی عازبی ئەوسی، بیشری کوڕی سەعدی خەزرەجی، ئەبوموسای ئەشعەری، موسەنای کوڕی حاریسەی شەیبانی، خەبابی کوڕی ئەرەتی تەمیمی، و .. هتد) خودا لێیان ڕازیبێت.

لە ناو نەتەوەی کوردیشدا بە درێژایی مێژوو دەیان و سەدان و زێدەڕەوییش نییە ئەگەر بڵێین هەزاران پیاوی مەزن و خاوەنسەنگ هەبوون و هەن.

یەکێك لە ئەو کەڵەپیاوانەی ناوێکی مەزن و مێژوویەکی پرشنگدار و پرسەروەریی هەبووە و هەمیشە بە شکۆوە باسکراوە و دەکرێت، هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) حەزرەتی (جابانی کوردیی)ـە (خودا لێی ڕازیبێت)، کە بوونی پیاوێکی وەها جێگەی فەخر و شانازییە بۆ مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان بە گشتیی و نەتەوەی کورد بە تایبەتیی.

## ( جابانی کوردیی ) کێیە؟

بەداخەوە زانیارییەکان سەبارەت بە ژیان و کەسایەتیی ئەم هاوەڵە بەڕێزە زۆر کەم و هەژارە. ئەوەی زانایانی پێشوو لەسەریان نووسیوە و تۆماریان کردووە، زۆر کەمە و لە چەند دێڕێك تێپەڕ ناکات، تەنها ئەوەندە هەیە ناوی (جابان)ـە و بە

---

١٨١ـ ئەم هاوەڵە بەڕێزە کە نازناوی (ئەبو یەحیا)یە، لە بنەڕەتدا ڕۆمی نییە، بەڵکو عەرەبە. بەڵام لەبەرئەوەی کۆیلەی ڕۆمەکان بووە و لەلایان دیلبووە، وە زۆر لەنێویاندا ماوەتەوە، دواتر بە (ڕۆمی) ناوبانگی دەرکردووە.

(جابانی کوردیی) ناسراو بووە و، بە (والد میمون/ باوکی مەیمون) ناوبانگی دەرکردووە. ناوبراو یەکێکە لە یارەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (درووودی خوای لەسەربێت) و -وەك دواتر ڕوونیدەکەینەوە- بۆ ماوەیەکی زۆر هاونشینی پێغەمبەری کردووە و هۆگریبووە. سەبارەت بە مێژووی لەدایکبوونیشی هیچ زانیارییەکی دڵنیابەخش لەبەردەستدا نییە، تەنها ئەوەندە هەیە لە سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامدا و لە سەدەی (یەکەم)ی کۆچییدا ژیاوە.

هەرچیش پەیوەستە بە کات و شوێنی مردنییەوە، بەهەمان شێوە زانیارییەکی پشتڕاستکراوەمان بەردەست نییە، تەنها ئەوەندە نەبێت لە (تکریت) گۆڕستانێکی لێیە، لە ئەو گۆڕستانەدا گۆڕی صەحابەیەك بە ناوی (جاکیر کوردی) بەناوبانگە، هەندێك پێیان وایە ئەوە گۆڕی (جابانی کوردیی) بێت و بە هۆی گۆڕانی زمانەوانییەوە کراوە بە (جاکیر)؛ چونکە بەپێی گێڕانەوە دەماودەمییەکان ئەو هاوەڵە لە کاتی ئازادکردنی ناوچە کوردییەکاندا لە ساڵی (١٦)ی کۆچیی چاوساغی سوپای مسوڵمانان بووە، دواتر هەر لە ئەوێدا شەهیدبووە.جا هە ندێکجار لە بری ناوی (جابان)، دەگوترێت (کاوان، کابان، گاوان، جاوان، کافان)، بەڵام هیچکام لە ئەم ناوانە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا نەهاتوون، بەڵکوو تەنها (جابان) هاتووە، کە ناوە ڕاستەکەیەتی. بەشێکیش لە زانایانی کورد، بە (کابان)، یان (گاوان) ناوی دەهێنن. بە بیانووی ئەوەی لە بنەڕەتدا (گاوان) بووە، بەڵام لەبەرئەوەی پیتی (گ) لە زمانی عەرەبییدا نییە، بە ئەو چەشنە نووسراوە. هەروەك مامۆستا (هەژار) دەڵێت: ((عەرەب گافی نییە و بە "جاوان" نووسراوە، ئێمە بردمانەوە سەر دەقی پێشووی))[١٨٢].

---

١٨٢ـ مۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان، د. مصطفی جواد، وەرگێڕانی: هەژار، پەراوێزی ژمارە (١)، لاپەڕە: ١٣.

## باسی دووەم

## جابانی کوردیی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

گەلێك سەرچاوەی مێژوویی باس لە ئەم هاوەڵە بەڕێزە دەکات، -بەڵام هەموویان هاوشێوە و چونیەکن-. لە بەشێکیشیاندا بە ڕوونیی و ڕاشکاویی کوردبوونی ئاماژەی پێدراوە. لێرەدا ئاماژە بە چەند سەرچاوەیەك دەکەین:

١. گەورەزانای بەناوبانگ (ئەبونەعیمی ئەصفەهانی)، دەفەرموێت: «أبو ميمون قيل: إن اسمه جابان، سمع النبي صلى الله عليه وسلم غير مرة..»[١٨٣].

٢. (ئیبن ئەسیر)ی مێژوونووس، دەڵێت: «جابان أبو ميمون، روى عنه ابنه ميمون أنه قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم غير مرة ..»[١٨٤].

٣. ئیمامی (زەهەبی)یش کە فەرموودەناس و مێژووزانێکی دیارە، دەفەرموێت: «عن أبي خلدة سمعت جابان والد ميمون روى بن مندة من طريق أبي سعيد مولى بني هاشم عن أبي خالد سمعت ميمون بن جابان الصردي عن أبيه أنه سمع النبي صلى الله عليه و سلم غير مرة ..»[١٨٥].

هەروەها لە (ميزان الإعتدال)یشدا لە زنجیرە (٨٩٦٢)دا ناوی هێناوە و دەفەرموێت: «ميمون بن جابان عن أبى رافع الصائغ، عن أبى هريرة مرفوعا: الجراد صيد البحر، ومرة رواه عن أبى رافع، عن كعب قوله..»[١٨٦].

٤. گەورەڕاڤەکاری فەرموودە، شێخ (ئیبن حەجەری عەسقەلانی)، لە (الإصابة)دا بە ئەم چەشنە ناوی (جابان) دەهێنێت و دەفەرموێت: «عن أبي خلدة سمعت

---

١٨٣ـ معرفة الصحابة، أبو نعيم الأصبهاني: ٢١/ ٨٩.

١٨٤ـ أسد الغابة، لابن الأثير: ١/ ٣٧٠.

١٨٥ـ تجريد أسماء الصحابة، للذهبي: ١/ ٧١.

١٨٦ـ ميزان الإعتدال، للذهبي: ٤/ ٢٣٣.

جابان والد ميمون روى بن مندة من طريق أبي سعيد مولى بني هاشم عن أبي خالد سمعت ميمون بن جابان الصردي عن أبيه أنه سمع النبي صلى الله عليه و سلم غير مرة ..»[١٨٧].

٥. گەورەڕاڤەکاری قورئانی پیرۆز (ئالوسی)، لە تەفسیرە بەناوبانگەکەیدا (روح المعاني) دەفەرمووێت: «عن أبي خلدة سمعت ميمون بن جابان الكردي عن أبيه أنه سمع النبي صلى الله تعالى عليه وسلم غير مرة ..»[١٨٨].

ئەمانە و گەلێك سەرچاوەی تری جۆراوجۆر، کە حەقیقەتی ئەم هاوەڵە ڕێزدارە و کوردبوونیمان بۆ دەچەسپێنن.

بەڵام وەك دیارە لە هەندێك سەرچاوەدا لە بری (جابان الكردی) نووسراوە (جابان الصردی)، ئەمەش پێدەچێت هەڵەیەکی چاپی و ئیملائی بێت[١٨٩]، کە لە بری وشەی (كرد) نووسیویانە (صرد).

دەشگونجێت (جابان الصردی) هەڵە نەبێت و بە ئەو ناوەش ناسرابووبێت. بە ئەم پێیەش نازناوەکەی بە واتای (جابانی کوێستانی)، یان (جابانی کێوی) دێت؛ چونکە وەك زانراوە پێکهاتەی بەشێك لە خاکی کوردستان ناوچەی شاخاوییە، ئەو ناوچانەش بە هۆی زۆریی ڕێژەی بارینی بەفر و بارانەوە، ساردن و بە ناوچەی کوێستانیی ناسراون.

ئەم گریمانەیەشمان لە فەرهەنگەکانەوە دەستکەوتووە، کە وشەی (صرد)یان بە هەردوو واتای (سارد) و (شاخ) لێکداوەتەوە. وەك زانای (لوغەوی) زماناس

---

١٨٧ـ الإصابة في تمييز الصحابة، للعسقلاني: ١/ ٤٩٢.

١٨٨ـ روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، للآلوسي: ٢/ ٢١.

١٨٩ـ بڕوانە/ حياة الأمجاد من العلماء الأكراد، طاهر ملا عبدالله البحركي: ١/ ١٨٤. الصحابي الكوردي جابان (أبو ميمون رضي الله عنه): د. فرست مرعي، مجلة رسالة العلماء، العدد: ٨٠، ص: ٥٦.

(جەوهەری) ئەم بۆچوونەمان بۆ نزیکدەکاتەوە و دەڵێت: ((والصَرْدُ: البَرْدُ، فارسيٌّ مُعَرَّبٌ))[190]. واتە: (صرد) وشەیەکی فارسییە و عەرەبێنراوە، بە واتای (سەرما) دێت.

(جەوهەری) کە دەڵێت وشەیەکی فارسییە، دوور نییە لە بنەڕەتدا (سارد)ی کوردی بووبێت و عەرەب نەیتوانیبێت وەك خۆی دەریببڕێت و دواتر کردبێتیان بە (صرد) و دواجاریش وەك زۆربەی وشە و زمان و فەرهەنگ و شتەکانی تر، ئەم وشەیەش لە زمانی کوردی داڕێنرابێت و کرابێت بە فارسی.

بە هەمەحاڵ، نازناوی (جابان) خۆی لە بنەڕەتدا (سارد) بووبێت، یان لە واتادا (سارد) بێت، هەر لە بازنەی گریمانەدان، بەڵام ئێمە واتای وشەکە (صرد) بە وتەی ئەم زانایانە زیاتر پشتئەستوور دەکەین. (ئیبن مەنزور) دەڵێت: ((الصَّرْدُ، والصَّرَدُ: البَرْدُ، وقيل شِدَّتُهُ))[191].

(مورتەزا زوبەیدی)یش هەمان واتای دەکات و دەڵێت: ((عن أبي عَمْرٍو، الصَّرْد: مَكَانٌ مُرْتَفِعٌ من الجِبَالِ، وهو أَبْرَدُهَا))[192].

(صاحیب بن عەباد)یش دەڵێت: ((والصرَدُ: مَصْدَرُ الشَّيْءِ الصرِدِ، من البَرْدِ، صَرِدْتُ أَصْرَدُ صَرَداً، وقَوْمٌ صَرْدى. والصُرَادُ: البَرْدُ، وكذلك الصَّرد))[193].

جگە لە ئەمانە گریمانیەکی دیکەش لە ئارادایە[194]، ئەویش ئەوەیە (صردی) لە بنەڕەتدا (سردی) بووبێت و نیسبەت بێت بۆ لای شاری (سردَرُوذ) کە گوندێکی

---

190- الصحاح في اللغة، الجوهري: ٣٨٤، مادة: (صرد).

191- لسان العرب، محمد بن مكرم بن منظور الأفريقي المصري: ٣/ ٢٤٨، مادة: (صرد).

192- تاج العروس من جواهر القاموس، مرتضى الزَّبيدي: ٨/ ٢٧١، مادة: (صرد).

193- المحيط في اللغة، الصاحب بن عباد: ٢/ ٢١٤، مادة: (صرد).

194- هەرچەند بە بۆچوونی بەندە ئەمە هەتا ڕادەیەك لە واقیعەوە دوورە.

کوردی سەر بە هەرێمی جیاکانە لە (هەمەدان). جا کاتێك کەسێك بە (سردَرُوذ)ی لەقەڵەم بدرێت، واتە بیکەی بە (ئیسمی مەنسوب)، دەڵێین: (سَردِيّ)، پاشگری (روز)ەکەی لێ لادەبەین، بەپێی ئەم گریمانەیەش دواتر پیتی (س) کراوە بە (ص) و سەرئەنجام بووە بە (صردیّ)[195].

---

١٩٥- بڕوانە/ تأريخ الكرد في العهود الإسلامية: ١٤٥.

## باسی سێیەم

## ( جابانی کوردیی ) فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە

هاوەڵی بەڕێز (جابانی کوردیی) ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەربێت) دوو فەرموودەی ڕیوایەت کردووە. کە ئەمانەن:

**فەرموودەی یەکەم/** «عَنْ أبي خَلْدَةَ، قالَ: سَمِعْتُ مَيْمُونَ الْكُرْدِيَّ وَهُوَ عِنْدَ مَالِكِ بن دِينارٍ، فَقالَ لَهُ مالِكُ بنُ دِينارٍ: ما لِلشَّيْخِ لا يُحَدِّثُ عَنْ أبيهِ؟ فإنَّ أبَاكَ قَدْ أدْرَكَ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم وَسَمِعَ مِنْهُ. فَقالَ: كانَ أبي لا يُحَدِّثُنا عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم مَخَافَةَ أنْ يَزِيدَ أوْ يَنْقُصَ، وَقالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: (مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[196].

واتە: (مەیمونی کوردیی) لە لای (مالیکی کوڕی دینار) دانیشتبوو، (مالیك) بە (مەیمون)ی گووت: مامۆستا، ئەوە بۆچی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لە باوکی خۆتەوە بۆ ئێمە ناگێڕیتەوە؟ خۆ تۆ باوکت بە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) گەیشتبوو، لە پێغەمبەریشەوە گوێبیستی فەرموودە بووە. (مەیمون)یش فەرمووی: (جابان)ی باوکم زۆر حەدیسی بۆ نەدەگێڕاینەوە، لە ترسی ئەوەی نەوەك لە حەدیسەکەدا زیاد، یان کەم بکات. باوکم فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێك بە مەبەست لە زمانی منەوە درۆبکات، با شوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخدا ئامادەبکات.

**فەرموودەی دووەم/** «عَنْ مَيْمُونِ الْكُرْدِيِّ عَنْ أبِيهِ، قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم غير مرة حتى بلغ عشرا يقُولُ: أيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأةً عَلَى مَا قَلَّ مِنَ الْمَهْرِ

---

١٩٦ـ رواه الطبرانيّ في الأوسط، برقم: ٦٢١٣. وابونعيم في المعرفة، برقم: ٦٤٧٤. والهيثمي في المجمع، برقم: ٦٥٨. وقال: إسناده حسن إن شاء الله.

أَوْ كَثُرَ لَيْسَ فِي نَفْسِهِ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَيْهَا حَقَّهَا خَدَعَهَا فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهَا حَقَّهَا لَقِيَ اللهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَهُوَ زَانٍ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ اسْتَدَانَ دَيْناً لا يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَ إِلَى صَاحِبِهِ حَقَّهُ خَدَعَهُ حَتَّى أَخَذَ مَالَهُ، فَمَاتَ وَلَمْ يُؤَدِّ إِلَيْهِ دَيْنَهُ لَقِيَ اللهَ وَهُوَ سَارِقٌ»[١٩٧].

واته: (مەیمونی کوردیی) دەڵێت: (جابان)ی باوکم فەرموویەتی: (دە)جار گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بووە، دەیفەرموو: هەر پیاوێك ژنێك مارەبکات، لەسەر مارییەکی کەم، یان زۆر، لە نیەتیشیدا نەبێت ماف و مارەیی ژنەکەی بداتەوە و فێڵی لێبکات، جا مێردەکە مرد و مافەکەشی نەدایێ، ئەوە کە لە ڕۆژی قیامەت دەگاتە دادگای خودا. ئەو پیاوە بە زیناکەر دادەنرێت. هەر پیاوێکیش قەرزێك وەربگرێت و نەیەوێت مافەکە بداتەوە بە خاوەنقەرزەکە و فێڵی لێبکات هەتا ماڵەکەی لێوەربگرێت، ئەگەر قەرزدارەکە مرد و قەرزەکەی نەدایەوە، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە دەگاتە دادگای خودا بە دز دادەنرێت.

لە ئەم (دوو) فەرموودەیەدا ئەگەر کورتە هەڵوێستەیەك بکەین، (دوو) مەبەستی سەرەکیی وەدەستدەهێنین:

یەکەم/ کە (جابان) فەرموویەتی: هەتا دە جار گوێم لە پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لەسەربێت). ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حەزرەتی (جابانی کوردیی — خودا لێی ڕازیبێت) لە ئەو ماوەیەی لە (مەدینە)دا بووە، کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداوە و زۆر بە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) گەیشتووە و پێغەمبەریش زۆر ڕێزی لێناوە و ڕاستەوخۆ لە ئایینی ئیسلام شارەزای کردووە.

دووەم/ لە ئەم فەرموودەیەدا، کە (مەیمون) فەرمووی: باوکم دەترسا نەوەك لە حەدیسەکەدا زیادبکات، یان کەمبکات. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (جابانی

---

١٩٧ـ رواه الطبراني في الكبير، برقم: ١٨٧٢. والهيثمي في المجمع، برقم: ٦٦٥٤. وأبونعيم في المعرفة، الرقم: ٦٤٧٥. قال الحافظان المنذري والهيثمي: رجاله ثقات.

کوردیی –خودا لێی ڕازیبێت) صەحابەیەکی لەخواترس بووە و خۆی لە (شوبوهات) پاراستووە و بەبێ گەردانە ئەرکەکانی ئایینی ئیسلامی ئەنجامداوە و بە چاکییش شارەزای ئیسلام بووە. پاشان لە (مەدینە) گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، بە زانستی ئایینیشەوە گەڕاوەتەوە[١٩٨].

بەدەر لەم (دوو) ئامآژەیە، نهێنییەکی دیکەی گرنگ لە فەرمودەی دووەمدا هەیە، کە دەکرێت وەکو کەرامات و تەنەبوئێك بۆ حەزرەتی (جابان) بژمێررێت، کە لە داهاتوودا گەلەکەی بەم گوناهەوە تێوەدەگلێن. یاخود دەکرێت وەکو ئامۆژگاری و ترساندنێك گەلەکەی بێدارکردبێتنەوە و فەرمودەکەی ریوایەت کردبێت، تاوەکو لە ڕێگەیەوە گەلەکەی هۆشیاربکاتەوە لە مەترسی خواردنی ماڵی قەرز و مارەیی ئافرەت، کە ئێستا ئەمە دوو ڕەفتاری باو و بڵاوی ناپەسەندی نێو کوردە. هەروەك (مەلای گەورە) فەرمویەتی: ((سوبحانەڵا! کورد دائیر بە مارەیی ژنان و قەرد دانەوە، زۆر بێ موبالاتن))[١٩٩]. لە جێگەیەکیتردا دەفەرموێت: ((سوبحانەڵا! ئەو لەئامەتە ئەلئانیش دەوام ئەکا، ئەگەرچی زۆر ئەبی، ژن جەفا ئەدا، تەنگە نەفەسی ئەکا، تا هەرچی پێی دراوە، لێی بسەندرێتەوە))[٢٠٠].

بێگومان ئەم بێ باکی و خەمساردییەش، لە بەرامبەر ماف و مارەیی ژنان، ڕیشەیەکی کۆنی لە ناو کورددا هەیە[٢٠١]، هەروەك شێخ (ئیبن تەیمییە) سەبارەت

---

١٩٨- مێرگ و گوڵزاری بەهار بۆ گەشتیارانی ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار: ٢٠٧ ـ ٢٠٨.

١٩٩- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ٦٠٣.

٢٠٠- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ١/ ٣٧٧.

٢٠١- هەرچەند لەناو کوردیشدا لێرە و لەوێ خەڵکانێك هەبوون و هەن لەبەرامبەر ئەم مافەی ژناندا گەردنکەچ و پارێزگارن، لەوانەش کوردە (قیمەرییەکان) لە (دیمەشق). وەك (ئیبن قەسلان) –کە ئەدیب و مێژوونووسێکی (شامی)یە و، لە ساڵی (١١٦٠ ز) کۆچی دوایی کردووە– دەگێڕێتەوە: ((حكى لي شجاع الدين محمد بن شهري رحمه الله ما معناه: أن الأمير سيف الدين المذكور رحمه الله، كان تزوج ابنة الأمير عز الدين بن المحلي رحمه الله

بەم خووە خراپە، دەڵێت: ((وإن كانت عادتهم يسمون مهرا ولكن لا يستوفونه قط، مثل عادة أهل الجفاء مثل الأكراد وغيرهم فوجوده كعدمه))[202]. واتە: نەریتی هەندێك خەڵك وایە، لە نێو گرێبەستەکەدا مارەیی ناو دەبەن و دیاری دەکەن، بەڵام هەرگیز نایدەن و تەسلیمی ژنەکانیان ناکەن، نمونەی ئەو جۆرە کەسانەیش وەکو خەڵکە دڵڕەق و کوردەکان و جگە لەوانیش، کە هەبوون و نەبوونی مارەیی ژنان لەلایان وەکو یەك وایە.

---

على صداق كبير، وجهزت بجهاز كثير، واستصحبها معه إلى الديار المصرية، فتوفيت هناك عن غير ولد، فلما ملك الملك الناصر صلاح الدين يوسف بن محمد رحمهما الله تعالى دمشق والشام، حضر الأمير سيف الدين من الديار المصرية إلى خدمته، وأخذ قماش زوجته المتوفاة وجهازها ومالها من الفضيات والمصاغ وغير ذلك، وحمله على عشرين بغلاً، و وزن باقي صداقها ومائتي ألف درهم، وجعلها في صناديق وحملها على البغال وسير الجميع إلى الأمير نور الدين علي بن المحلي بحكم أنه وارثها مع زوجها، فلما وصل ذلك إلى الأمير نور الدين، أنكره غاية الإنكار، ورده، وقال لرسوله: الأكراد ما جرت عادتهم يأخذون صداقاً ولا ميراثاً. فلما عاد ذلك إلى الأمير سيف الدين، قال: هذا شيء خرجت عنه وما يعود إلى ملكي. وصرفه جميعه في بناء المارستان وأوقافه وتصدق به)). ذيل مرآة الزمان: قطب الدين موسى بن محمد اليونيني: ١/ ١١٦. واتە: (میر سەیفەدینی قەیمەری) لەگەڵ کچێکی (میر عیزەدین مەحەلی) هاوسەرگیری کرد لەسەر مارەییەکی زۆری شاهانە، پاشان کچەکە هاوژینەکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ (میصر)، لەوێ زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد، بەبێ ئەوەی منداڵیان لێ پەیدابێت. دواتر کە (سوڵتان صەلاحەدین) چووە (دیمەشق و شام) و بوو بە فەرمانڕەوای ئەوێ، (میر سەیفەدین) لە (میصر)ەوە هاتە خزمەتی و، لەگەڵ خۆیشیدا پۆشاك و گشت زێڕ و زیو و جیهاز و کەل و پەلەکانی خستە صندوقەوە، لەگەڵ (دوو سەد هەزار درهەم) کە هی هاوژینە کۆچکردووەکەی بوو، لەوێوە بە باری (بیست) وڵاخەوە ناردیەوە بۆ (دیمەشق) بۆ باوانی میراتبەری هاوژینەکەی. کاتێك نوێنەر و کاروانەکە گەیشتنەجێ، (میر نورەدین مەحەلی –مامی ژنەکە– "کە دیارە باوکی لەو کاتەدا نەمابوو") ڕەتی کردەوە و زۆر توڕەبوو، گوتیشی: کوردان نەیانکردووە بە عادەت ماڵی میراتی و مارەیی بخۆن. دواتر کە نوێنەرەکە گەڕایەوە بۆلای (میر سەیفەدین)، (میر) گوتی: ئەمانە شتانێکن لە ماڵی من دەرچوون و، تازە ناگەڕێنەوە بۆ موڵکی من و منیش وەریانناگرمەوە. دواجار هەمووی خەرج کرد لە بنیاتنانی نەخۆشخانە و ئەوقاف و کاری خێریدا.

٢٠٢ـ الفتاوى الكبرى: ٥/ ٤٦٨.

لەگەڵ ئەوەی بوونی هاوەڵێکی کورد بە ئەم ناوەوە حەقیقەتێکی سەلمێنراوە، لەهەمان کاتدا نکوڵیی لە ئەوەش ناکرێت کە ژیان و کەسایەتیی ئەم زاتە گەورە، —بە بەراود بە هاوەڵە ناودار و ناسراوەکانی تر—، وەك پێویست تۆمار نەکراوە و زانیارییەکانی پەیوەست پێیەوە بە درێژیی زانراو و ناسراو و بەردەست نییە.

هۆکاری ئەمەش وەك توێژەرانی کورد باسی لێوەدەکەن بۆ (دوو) خاڵ دەگەڕێتەوە، کە ئەمانەن:

**بۆچوونی یەکەم/** خاوەنی ئەم بۆچوونە پێی وایە: ئەو هاوەڵانەی ناوبانگیان زۆرە و زیاتر ناسراون، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوان هەر لە (مەدینە)دا و لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێت) ماونەتەوە هەتا کاتی وەفاتیان، بەڵام (جابانی کوردیی) لە (مەدینە) نەماوەتەوە و پاش ماوەیەك گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان. ئەمەش بۆچوونی زانایانی پایەبەرزی کورد، مامۆستا (عەبدوڵا هەرتەلی)[203] و، مامۆستا مەلا (تاهیری بەحرکەیە)[204] خودای گەورە بیانپارێزێت.

**بۆچوونی دووەم/** خاوەنانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە: هۆکاری دەرنەکەوتن و نەناسراویی ئەم هاوەڵە بەڕێزە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە زۆر واریع و زاهید بووە و حەزی بە دەرکەوتن نەکردووە، بەڵکو خۆی بەدوورگرتووە لە گێڕانەوەی فەرموودە، لە ترسی ئەوەی نەوەك توشی هەڵە، یان لەبیرچوون ببێتەوە[205].

بە تێڕوانینی بەندە پێدەچێت ئەم بۆچوونە چەسپاوتر و دروستتر بێت — خوداش زاناترینە—. وەك لە ئاماژەکانی دەقی ئەو فەرموودانەدا دەردەکەوێت کە

---

٢٠٣ـ بڕوانە/ مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٤.

٢٠٤ـ بڕوانە/ مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر عبدالله بەحرکەیی: ١/ ٢٣٩.

٢٠٥ـ بڕوانە/ تأريخ الكرد في العهود الإسلامية، د. أحمد محمود الخليل: ١٤٦.

(جابان) خۆی ڕیوایەتی کردوون و تێیدا بە ڕوونیی باسی ئەوەی کردووە گێڕانەوەی فەرموودە ئەرکێکی قورس و گرانە بەلایەوە. ئەمەش لە پێناو خۆدوورگرتن لە گریمانەی کەوتنە ناو هەر هەڵەیەکەوە لە بواری گێڕانەوەی فەرموودەدا. ئەمە لە لایەك.

لە لایەکی دیکەشەوە دروستیی ئەم بۆچوونە لە ئەوەدا دەردەکەوێت، (جابان) ئەوەندە لە خزمەت پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێت) و لە شاری (مەدینە)دا ماوەتەوە، هەتا بە باشیی فێری زمانی عەرەبیی بووە و چەندین فەرموودەشی لە پێغەمبەرەوە بیستووە، هەتا ئەو ئاستەی تابیعینەکان داوا (مەیمون) بکەن لە (جابان)ی باوکیەوە فەرموودەیان بۆ بگێڕێتەوە.

هەموو ئەمانە، بەڵگەی ئەوەن کە (جابان) لە شاری (مەدینە)دا زۆر ماوەتەوە. هۆکاری دەرنەکەوتنیشی هەمیشە لە کاتی توێژینەوە و سۆراغکردنی ژیان و کەسایەتییدا، (بەندە) ئەوەم بە خەیاڵدا دەهات و مەزندەم وابوو، ناوبراو ڕەنگە لە ناوەڕۆکدا –نەك بە ناو– ڕەوتێکی سۆفییگەرانەی هەبووبێت[٢٠٦] و پیاوێکی کەنارگیر و بێدەنگ بووبێت و زۆر خۆی بواردبێت لە ناوبانگ و شۆرەتپەیداکردن؛ چونکە هەر

---

٢٠٦- هەرچەندە نە ڕێبازی (تەصەوف) و نە هیچ ڕێباز و ئایینزایەکی تر، لە سەردەمی پێغەمبەردا بە ئاشکرا نەبووە، هەتاکو جیابکرێنەوە لە کۆی مسوڵمانان و بە تایبەت بناسرێن. بەڵام نکوڵیی لە ئەوەش ناکرێت کە تەصەوف وەك ناوەڕۆك لە ناو هاوەڵان و چینی دواتردا بەرجەستەکراوە. هەروەك پێشەوا (زەهەبی) دەفەرموێت: ((فما أحلى تصوف الصحابة والتابعين)). واتە: ئای چەند جوان و شرین بووە سۆفێتیی هاوەڵان و شوێنکەوتووان. سير أعلام النبلاء: ١٨/ ٥١٠. ئەمە بەدەر لە یاوەرانی (أصحاب الصفة)، کە بە ڕیشەی سۆفیگەرێتی دادەنرێت لەلایەن زۆرێك لە زانایانی ئەو ڕەوتەوە.

خودی ناوی (جابان) لە زمانەوانییدا، بە واتای: (نهێنیی و شاراوە)، یاخود (پلەبەرز) دێت[٢٠٧].

ئەم بۆچوونەم پشتئەستوور دەکەم بە ئەم فەرمایشتەی گەورەزانای ڕەسەن و خۆمالێی، مامۆستا مەلا (تاهیر بەحرکەیی)، کە دەفەرمووێت: ((لەبەر خۆپیشان نەدانی جابان بە خەڵکان، مانەوەی چەند هەفتە لە شاری مەدینەی پیرۆز، لە بری چەند مانگ، نەزانرا کە چ ڕۆژ باریکرد و گەڕایەوە کوردستان. هەر وەك نەزانرا چ ڕۆژێك تەشریفی بۆ مەدینە مات))[٢٠٨].

هەروەها دکتۆر (عەبدوڵا نەقشبەندی)ش بۆچوونی خۆی لە ئەم بارەیەوە دەخاتەڕوو و دەڵێت: ((جابان حەزی نەدەکرد خۆ دەربخات، بەس دەیویست دەرفەتوەربگرێت بە تەنها لە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) دابنیشێت، لەبەرئەوە بەختەوەر بوو بە گێڕانەوەی فەرموودەیەك، یان دوو، گەڕایەوە بۆ کوردستان، بەبێ ئەوەی کەس هەستبکات چی بوو لە نێوان ئەو و خۆشەویستی خودا دروودی خوای لەسەربێت))[٢٠٩].

جا هەرچۆنێك بێت، لێرەدا گرنگە ئێمەی کورد سوپاسگوزاری خودا بین و هەم شانازییش بە ئەوەوە بکەین، کە ئێمەش صەحابەیەکمان هەیە و لە خزمەت پێغەمبەردا ژیانی گوزەراندووە! چونکە ئەمە شتێکی سادە و ڕۆتین نییە، هەر وەك دیسان مامۆستای (بەحرکەیی) دەفەرمووێت: ((کۆبوونەوەی خۆشەویستی خودا (دروودی خوای لەسەربێت) لەگەڵ "جابانی کوردیی"دا خەڵکی کوردستان،

---

٢٠٧- حياة الأمجاد من العلماء الأكراد، ملا طاهر البحركي: ١/ ١٨٥. وهو أخذه عن/ الدكتور عبدالله النقشبندي، في كتابه: أمجاد الأكراد.

٢٠٨- مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر عبدالله بەحرکەیی: ١/ ٢٣٩.

٢٠٩- وەرگیراو لە/ مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر عبدالله بەحرکەیی: ١/ ٢٣٩.

شتێکی گرینگی نهێنیی لە ژێردابووە. فەرماندانێکی دەستنیشانکراو بووە و نەخشەکێشان بووە بۆ سەرکەوتن، کە ڕۆژی خۆی هات ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە))[٢١٠].



---

٢١٠- مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر عبداللە بەحرکەیی: ١/ ٢٣٩.

## باسی پێنجەم

## سەرگوزەشتەی گەیشتنی ( جابانی کوردیی ) بە پێغەمبەر و بڕوا پێهێنانی

سەبارەت بە ئەم باسە بۆچوونی جیاواز و جۆراوجۆر لەئارادایە. لێرەدا بە کورتیی هەندێکیان دەخەینەڕوو:

مامۆستا مەلا (عەبدوڵای هەرتەلی) دەڵێت: (جابانی کوردیی) لە (شارەزوور)ەوە چووەتە شاری (مەدینە)ی پیرۆز و لە ئەویٚ لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێت) موسوڵمان بووە[٢١١].

مامۆستا (حەسەن مەحمود حەمە کەریم)یش هەمان بۆچوونی هەیە و دەڵێت: ((هێشتا بانگەواز لە قۆناغی مەککەدا دەبێت، کورد جابانی کوردیی بە نوێنەر دەنێرێت بۆ مەککە و مەدینە و هەواڵی کورد دەگەیەنێت بە ئیسلام و هەواڵی پێغەمبەر و ئیسلام بۆ کورد دەهێننەوە))[٢١٢].

دکتۆر (عەبدوڵا موستەفا)یش لە کتێبی (أمجاد الأکراد)دا موسوڵمانبوونی (جابانی کوردیی) باسکردووە و جەخت لەسەر ئەم بۆچوونە دەکاتەوە و دەڵێت: ((لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) پیاوماقوڵێکی کورد –کە ناوی جابان بوو– هاتە مەدینەی پیرۆز و لە سەر دەستی پێغەمبەر موسوڵمان بوو. "جابان –خودا لێی ڕازیبێت" لە ئەو ماوەیەی لە مەدینەدا مایەوە، بە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) دەگەیشت و گوێی لە فەرموودەکانی دەگرت))[٢١٣].

---

٢١١- مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٤.

٢١٢- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامییدا، حەسەن مەحمود حەمەکەریم: ٣٩.

٢١٣- مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٤.

بەڵام دکتۆر (ئەحمەد مەحمود خەلیل) چەند گریمانەیەك لەسەر چۆنێتیی گەیشتنی (جابانی کوردیی) بە پێغەمبەر باسدەکات و دەڵێت:

ڕەنگە (جابان) هەر لە شاری (مەککە)دا بووبێت و لە دوای مسوڵمانبوونیەوە کۆچیکردبێت بۆ (مەدینە)،دا؛ چونکە کۆچەرییە (فارس) و (ڕۆم) و (صابیئە) و (حەبەشی)یەکان لە شاری (مەککە)دا، لەبەر چەند ئامانجێکی سیاسیی و ئابووریی و تەبشیریی دەمانەوە. پێدەچێت (جابان)یش یەکێك بووبێت لە ئەو کۆچەرییانە؛ چونکە لە ئەو کاتەدا کورد لە ڕووی سیاسیی و ڕۆشنبیرییەوە زیاتر شوێنکەوتەی فارسەکان بوون.

یان پێدەچێت بە هۆی شەڕی نێوان (فارس) و (بیزەنتی/ ڕۆمەکان)ەوە (جابان) بە دیل گیرابێت و دواتر لە بازاڕی کۆیلەفرۆشیدا فرۆشرابێت. پاشان دەستاودەست گەیشتبێتە (مەککە)، یان (مەدینە) ! چونکە ئەو (دوو) شارە لە ئەو کاتەدا سەنتەری بازرگانیی بووە لە نێوان (عێراق) و (شام) لە لایەك و (یەمەن) و (نیمچەدوورگەی عەرەبی) لە لایەکی ترەوە[٢١٤].

هەروەها گریمانەیەکی تر لەئارادایە، ئەویش ئەوەیە: دەکرێت (جابانی کوردیی) یەکێك بووبێت لە بەرهەڵستکارەکانی دەوڵەتی (ساسانی فارسی) و بۆ خۆ ڕزگارکردن لە زوڵم و ستەمی ئەوان پەنای بردبێتە بەر شاری (مەککە)، یان (مەدینە) و لە ئەوێ لەژێر دادگەریی پێغەمبەر و ئیسلامدا حەسابێتەوە.

دەشکرێت خۆی هەر لە بنەڕەتدا لە شاری (مەدینە)دا بووبێت و لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری ئیسلام و پەیامی پێغەمبەردا بڕوای هێنابێت و مسوڵمان بووبێت.

---

٢١٤ـ بروانە/ تأريخ الكرد في العهود الإسلامية: ١٤٦.

هەموو ئەمانە لە بازنەی گریمانەدان و بۆ چەسپاندنی هیچ یەکێکیان بەڵگەی یەکلاکەرەوەمان چنگ نەکەوت، بەڵام بۆچوونی یەکەم ئەگەری زیاتر و لەپێشتری هەیە -خوداش زاناترینە-.



## باسی شەشەم

## ( جابانی کوردیی ) پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان دەستی بە جیهاد و کاری بانگەواز کرد

حەزرەتی (جابان -خودا لێی ڕازیبێت) کە گەڕایەوە بۆ کوردستان، بە لێهاتوویی خۆی توانی خۆی بگەیەنێتە ناو هێزە تایبەتییەکەی (کیسرا)ی پاشای (فارس) و بیانکاتە مسوڵمان؛ چونکە ئەم هێزە تایبەتییەی (کیسرا) هەموویان کورد بوون و ژمارەیان (پێنج هەزار) سەرباز بوو، (دێلم) سەرکردایەتیی دەکردن. جا لەبەرئەوە (کیسرا) ئەو کوردانەی کردبوونە پاسەوانی تایبەتی خۆی؛ چونکە متمانەی بە فارسەکان نەدەکرد.

پاشان کە لە ساڵی (١٥)ی کۆچیی لەشکری ئیسلام بە سەرکردایەتیی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص -خودا لێی ڕازیبێت) لە (قادسیە)دا ڕووبەڕووی لە شکری بێباوەڕانی (فارس) بوونەوە- کە (ڕۆستەم) سەرکردەیان بوو-، لە ناکاو (سەعد) بینی هێزێکی فارسی دەیەوێت بە دەورەی لەشکری ئیسلامدا بسوڕێتەوە، یەکسەر فەرمانیدا هێزێکی سوارچاکی ئیسلام بەرەو ئەو لەشکرە بچێت. پاشان کە هێزەکەی ئیسلام گەیشتە لای هێزە فارسییەکە، ئەوان زۆر بە گەرمیی سەلامیان لێکردن و گوتیان: ئێمە برای ئێوەین و ماوەیەکی زۆرە موسوڵمان بوین و چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەمان دەکرد. ئێوە سەبربگرن هەتا بە تەواویی دەسوڕێینەوە، پاشان دەبینن چی بە سەر لەشکری (ڕۆستەم) دەهێنین!

ئیتر ئەم هێزە بە دەورەی لەشکری (ڕۆستەم)دا سوڕایەوە و لە هەموو لایەکەوە بە هەموو جۆرە چەکێك لە لەشکرەکەیان دا و تێکیانشکاند و بوونە پاڵپشتی لەشکری ئیسلام.

ئەم هێزە تازەیە، هێزە تایبەتییەکەی (کیسرا) بوو –کە هەموویان کورد بوون–. (کیسرا) نەیدەزانی ئەو هێزە موسوڵمان بووە، لەبەرئەوە بە سەرکردایەتیی (دێلم) بۆ پاڵپشتی (ڕۆستەم) ناردبوویە جەنگی (قادسیە)، بەڵام لە ئەنجامدا (ڕۆستەم) کوژرا و لەشکری (فارس)یش تێکشکا. (کیسرا)ش بەرەو (ئێران) هەڵهات.

دواتر ئەم هێزە کوردییە تێکەڵێ هێزی ئیسلام بوو، پێیاندەگوت (حەمرائو دێلم). پاشان لەشکری ئیسلام –بە کورد و عەرەبەوە– هێزی فارسەکانیان ڕاونا و هەرێمەکانیان لە ژێردەستی ئەوان ڕزگارکرد. هەتا (مەدائین) و (جەلەولا) و (حولوان)یان هەموو ڕزگارکرد[٢١٥].

دواتر (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) موژدە و چۆنیەتیی ئەو سەرکەوتنانەی بۆ ئیمام (عومەر) ناردە (مەدینە)، ئیمام (عومەر)یش فەرمانیدا (سەلمانی فارسی) بکرێتە فەرمانڕەوای (مەدائین/ سەلمان پاك). هەروەها فەرمانی کرد (دوو) پیاوی کورد لە لەشکرەکەی (حەمرائو دێلم) بکرێنە فەرمانڕەوای هەرێمە کوردییەکان، یەکێکیان لە (جەلەولا)، ئەویتریان لە (حولوان).

هەموو ئەمانەش دەستکەوت و بەرهەمی (جیهاد)ی نهێنیی بوو، کە (جابانی کوردیی) و (دێلمی تابیعی) سەرکردایەتییان کردبوو. خودای گەورە لێیان ڕازیبێت[٢١٦].

---

٢١٥- مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٤ ـ ٢٠٥.

٢١٦- مێرگ وگوڵزاری بەهار: ٢٠٥ ـ ٢٠٦.

ئەوەی خوێندتەوە گرنگترین ئەو زانیارییانە بوون، لەسەر ئەم هاوەڵە بەڕێزە گوتراوە و نووسراوە و دەستی ئێمە کەوتووە. بە ئەو هیوایەی بەرچاوڕوونییەکمان بە تۆی خوێنەری ئەزیز بەخشیبێت.

ئەوەی ماوەتەوە بیلێین ئەوەیە، کە ڕەنگە چەند صەحابەیەکی تری کورد هەبوون، جگە لە (جابان)، بەڵام ناو و ناوبانگ و ژیانیان، ناسراو و زانراو نییە و لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیان پێنەدراوە. هەروەك شێخی موفەسیر (ئالوسی) لە تەفسیرەکەیدا (روح المعاني)[217]، سەبارەت بە نەتەوەی کورد دەفەرموێت: ((قد كان منهم كثير من أهل الفضل بل ثبت لبعضهم الصحبة)). واتە: کوردەکان خاوەنی گەلێك کەسایەتیی مەزنن و چەند هاوەڵێکی پێغەمبەریشیان تێدا هەبووە.

تەنانەت لە پێش هاتنی پێغەمبەری کۆتازەمانیش حەزرەتی (موحەمەد - درودی خوای لەسەربێت)، کورد هەر لە هەواڵپرسین و سەرەداوی هاتنی کۆتاپێغەمبەردا بووە و بەدوایداگەڕاوە. هەروەك (حەسەن مەحمود) دەڵێت: (("پیروەت کوڕی بارام" کە زانا و ژیرێکی کورد بووە لە ناوچەی "مەرگە"، لە بۆسەدا بووە کە ئەو پێغەمبەرە سەرهەڵبدات کە ئاوێستا و زەردەشت و پیرشالیار مژدەیان پێداوە، هەموو جار لە کوردستانەوە لە ناوچەی مەرگە -پارێزگای ئەمڕۆی سلێمانی- توێشووی دەپێچایەوە و دەکەوتەڕێ بۆ شام بۆ لای ڕاهیبە گاور و جولەکەکان، بۆ هەواڵزانینی پێغەمبەری نوێ و ڕاگۆڕینەوە لەسەر مژدەکانی ئاوێستا و ئینجیل و تەورات بەرانبەر پێغەمبەری چاوەڕوانکراو. جا کە سوپای ئیسلام گەیشتە ئازەربایجان، پیروەت بە خۆی و دانزە کەس لە ماقوڵان و سەرۆکەکانی کورد دەچن بۆ بارەگاکەیان لە سیناجیان. ئەوانیش دەیانبەن بۆ لای

---

٢١٧ـ روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، شهاب الدين الألوسي: ٢٦/ ١٠٣.

سەرکردەی سوپاکە. "پیرۆەت" دەڵێت: ئارەزووی ئیسلامبوون دەکەین.
سەرکردەی سوپاکەش -کە ڕەنگە "عوتبە" بێت- زۆری پێ خۆشدەبێت،
هەموویان مسوڵمان دەبن))[218].

لە ئەم سۆنگەیەوە دەتوانین وردتر بڵێین: نەتەوەی کورد زۆر تامەزرۆی
دیداری حەزرەت (درودی خوای لەسەربێت) بوون و بە تاسەوە چاوەڕوانی
وادەی هاتنیان کردووە و هەوڵی خۆپێگەیاندنیان بۆ داوە و ڕێگەی دووریان بۆ
گرتووەتەبەر. بەڵام مەخابن بە دیارییکراوی ناوی ئەو کەسایەتییانە تۆمار
نەکراوە و بەردەست نەخراوە.

### ئەفسانەی (بەغدووز):

لە چەند سەرچاوەیەکدا باس لە ئەوە دەکرێت کە گوایە لە ناو کورددا هاوەڵێك
هەبووە بە ناوی (بەغدووز)، کاتێك چووەتە خزمەت پێغەمبەری خودا (درودی
خوای لەسەربێت)، نزای شەڕی لێکردووە!

(گیوی موکریانی) لە (فەرهەنگی کوردستان)دا دەڵێت: ((بەغدووز: کوردێك
بووە لەگەڵ دەستەیێکی چوونە لای پێغەمبەری، پێغەمبەر کە دیتی سامی
لێنیشت، لە پێش هەموو کەسێکی لە ئەوی پرسی تۆ چ کەسی؟ بەغدووز گوتی:
من کوردم. ئەوجا پێغەمبەر بێز و بۆی لێکرد و گوتی: خودا بکات تەنها لە
"شەهادە" نەبێت لە هەموو چتێکیدا ڕێکنەکەون! چونکە ئەگەر ببنە یەك،
جیهانی وێراندەکەن))[219].

---

٢١٨- بڕوانە/ کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامییدا: ١٧٥ ـ ١٧٦.

٢١٩- فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی: ٨٩.

بەڵام ئەم قسە و باسە هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروستی نییە، بەڵکوو دروستکراو و هەڵبەستراوی نەیاران و نەزانانە. بە ئەم چەند بەڵگەیەی خوارەوە پوچەڵدەکرێتەوە:

1. (گیو) خۆی بە گومانەوە باسیدەکات و دەڵێت: ((نازانم ئەو دەنگ و باوە هەتا چ ڕادەیەکی ڕاستە))[220].

2. زانای مەزن مامۆستا (هەژاری موکریانی) لە پێشەکیی (شەرەفنامە)کەی (شەرەفخان)دا ئەم هەواڵە بە ناڕاست لەقەڵەم دەدات و بە توندیی ڕەتیدەکاتەوە و دەڵێت: ((گەمەی لە هەمووان خۆشتر ئەمەیە: ئوغوزخانی تورکستانی، بووغدوزناوی کوردستانی ناردە لای پێغەمبەر، بوغدووز ئەوەندە ناشیرین و ڕەزاگران بوو، پێغەمبەر بێزی لە چڕ و چاوی هەڵقرچاوی هەستا و لە داخانی تووك و نەفرینی لە هەموو کوردی سەرزەمین کرد! ئاخر با بڕوانین ئەو نووسەرە ساویلکانەی لە دووژمنایەتیی کوردان و بۆ دراوی گیرفانیان ئەو چیرۆکەیان هەڵبەستووە و ئەم بوختانە گەورەیان بە پێغەمبەرەوە کردووە و دەناو ڕووپەڕی مێژوویان ئاخنیوە. ئەوەندەیان بە مێشك و دڵدا تێنەپەڕیوە کە ئەو هەویرە چەندی ئاو هەڵدەگرێت و لێکیان نەداتەوە کە گوناهێکی چەند گەورە ملیان دەگرێت و چۆن لە بەری دەردەچن؟ نەیانزانیوە کە پێغەمبەری خودا دەیزانی بنیادەمی دزێویش دەسکاری خودایە و ئەگەر کرێك لە بار و ڕێك نەهات لە کرگارەوەیە؟ لە لایەکی تریشەوە ئەگەر خوانەخواستە باوەڕ بە ئەو درۆیە بکەین، وای لێدێتەوە ئەگەر ئەو بوغدووزە کوردە بەدبەختە لاوێکی لووس و پووس و لەبار و بەرچاو و چاونەرم و بێشەرم بایە، دەبایە بە کۆڵێك نزای باشەوە بگەڕێتەوە کوردستان!

---

220. فەرهەنگی کوردستان: 89.

حاشا که پێغەمبەری خودا ئاکاری وا ناڵەباری بووبێت و ئەم درۆ پوچ و بەربادە لە دەمی ئەوانە زیادە کە بۆ لاکی مرداری دنیا ڕێکیانخستووە))[٢٢١].

٣. سەرەڕای ئەمە، ناڕاستیی ڕووداوەکە لە ئەوەشدا دەردەکەوێت کە لە هیچ سەرچاوەیەکی متمانەداری فەرموودە و مێژوودا ئەم باسە نەهاتووە و ساغ نەکراوەتەوە و تۆمار نەکراوە[٢٢٢].

٤. لە لایەکی ترەوە گەر سەرنجێك لە ناوەکەی بدەین، بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ناوی (بەغدون) لە ناو کورددا ناوێکی باو و بڵاو و ناسراو نییە. هێندەی منیش ئاگاداربم کەسێك نییە بە ئەو ناوەوە و ناوەکەی لە ناوی کوردیی ناچێت، بەڵکوو نامۆیە.

٥. لە لایەکی تریشەوە ڕەوشت و ڕەفتای پێغەمبەری خودا هەرگیز بە ئەو جۆرە نییە و قەت نەبووە پێشەوای مرۆڤایەتیی بە ئەو جۆرە لەسەر بنەمای ڕەنگ و ڕووخسار و ڕەگەز و هۆز، خەڵکان هەڵبسەنگێنێت.

یان قەت نەبووە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) نزای شەڕ و خراپ لە کەس بکات، ئەو تەنانەت نزای شەڕی لە سەرانی قورەیش نەدەکرد، چ جای کەسانی تر!

## باسی حەوتەم

٢٢١. شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی: بیستوچوار.

٢٢٢. بڕوانە/ التبشير أهدافه وسبل مواجهته، الدكتور بشير خليل حداد: ١٥٨ ـ ١٥٩.

## هۆزی (جاوان/ گاوان) و نەوەکانی (جابانی کوردیی)

هەر لە ئەم باس و خواسەدا، پێم باشبوو ئاوڕێکی کورت و خێرا، لە هۆزی (جاوان) یان (گاوان) بدەمەوە؛ چونکە شایەنی ڕێز و ناسینن. بەداخەوە ئەم هۆزە گەورە و هەڵکەوتووەی کورد، هەتا هەنوکەش زۆرێکمان نەماننناسیون و ئاگاداریان نین، کە کێن؟ بە ئەو هیوایەی ئەمە دەروازەیەك بێت بۆ ئاشنابوون پێیان؛ چونکە (جابان) لە نەوەی ئەم هۆزەیە. هەروەك (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەڵێت:

((جابانی باوکی مەیمون، یەکێکە لە یارەکانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێت، لە ئەو بەربابانەیە لە کوردان کە ناودەبرێن بە جاوانی))[٢٢٣].

دکتۆر (جەواد مستەفا)یش دەڵێت: ((هۆزی گاوان لە مێژووی عێراقی ڕۆژگاری ئیسلامەتییدا دەورێکی زۆر گرنگیان هەبووە. ئاکاری ئەوەندە بەرز و کاری ئەوەندە تەرز و هێژایان لە خۆ پیشانداوە، کە هەڵدەگرێت هیچ نەبێت بەشێك لە ئەوانە لەبیرنەکرێت و لە مێژووی عێراقدا بە گشتیی و لە مێژووی کوردەوارییدا جێگەی شایانی خۆی بۆ دیاریی بکرێت؛ چونکە خۆ لێبواردن و چاولێنوقاندنی دەبێتە مایەی کەمایەتیی و هۆی بێبەشبوون و نیشانەی بێنەکەمیی و پێنەزانین))[٢٢٤].

مامۆستای هێژا و پایەداری نەتەوەکەمان (هەژار)، دەربارەی ئەم هۆزە، دەڵێت: ((لە ڕۆژ و ڕۆژگارێکدا ئەو هۆزە کە هۆزی گاوان بووە، زۆر دیاردە و لەبەرچاوان بووە و لە سایەی ئازایی و میرخاسیی و گەڕناسیی کوردانەی خۆیەوە، لە لایەکی ئەم جیهانە پان و بەرییندا، ناو و ناوبانگێکی زۆر و زەوەندی پێکەوەناوە و لە لای

٢٢٣- مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر عبداللە بەحرکەیی: ١/ ٢٣٩.

٢٢٤- هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان: ١٣ - ١٤.

لاوەکیی و دەر و دراوسێ و ئاشنا و بیانییەوە، بە زیخ و بوێر و چاونەترس و شێر و ئابڕوومەند و جوامێر و ئاکارپەسەند و چاوتێر، نووسراوە و دۆستی خۆی شادکردوون و نەیاری بەربادکردوون و پاڵەوانی بەزداندوون و لەشکری ڕەتاندوون و لە چاخ و چەرخی خۆیدا گەلی کوردی وەك گەلێکی هەرە ئازا و بەکار، بە خەڵك ناساندووە))[٢٢٥].

(گاوانییەکان)، هۆزێك بوون فەرمانڕەواییان دەکرد، لە سەردەمی (چوارەم و پێنجەمی کۆچیی/ دەیەم و یازدەیەمی زایینی). میرنشینێکیان لە دەوروبەری (بەغداد) دامەزراند، هەتا گەیشتە ناوچەی (واست) لەسەر ڕووباری (دیجلە)، هەرچەندە زۆر دوور نەکەوتنەوە لە زێدی خۆیان، (میر ئەبولفەتح کوڕی وەرامی کوردی جاوانی) بەناوبانگترین میرەکانی بوو. پتر لە نیو سەدە (٤٠٣ _ ٤٥٥ك/ ١٠١٢ _ ١٠٦٣ز) فەرمانڕەوایی کردووە[٢٢٦].

ئەم هۆزە لە چەرخی (چوارەمی) کۆچییدا لە هۆزە هەرە ناوبانگەکانی کورد بوون[٢٢٧]. ئەوانیش هەروەك هۆزە کوردەکانی تر نیشتەجێی ناو چیا و بانووە ساردەکان بووە و ئەگەر لە ئەوێشەوە شوێنی داخزینەکەی هەڵبگرین، واتە کاتێك کە لە ئەو کەژ و کێوانەوە سەربەرەوخوار داکشاوە، لە لای ڕێگەی (خوراسان)ەوە توشیدەبین، کە ئێستا ئەو مەڵبەندە بە لیوای (دیالە) ناودەبرێت[٢٢٨].

---

٢٢٥- هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان، پێشەکیی ل: ٣ _ ٤.

٢٢٦- بڕوانە/ (صەلاحەدین) بدوێنین، یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، د. موحسین محەمەد حوسێن: ٦٣ _ ٦٤.

٢٢٧- هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان: ١٦.

٢٢٨- هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان: ٢٤.

هۆزی (گاوانی) کورد لە دەورانی دەستەڵاتی خەلیفەکانی (عەباسی)دا ژیاوە و شانبەشانی بەرەی (ئەسەدی) عەرەب، شاری (حلە)ی ئێستای (عێراق)یان بنیانناوە. سەرەڕای ئەو شوێنەوارە ماوەشیان ماوەیەکی زۆر مەیدانی زۆرانبازیی و ڕێبازی پڕ لە شانازییان نێوانی (خانەقین) و (مەندەلی) ئێستا و (حلوان)ی ئەوسا و (بەدرە) و (جەصان)ی لای (کوت) و (عەمارە) بووە و گەلێك چیا و کەژ و ئاوی و بەژ و نەرمان و ڕەقەن و دەشن و بەندەنیان دەربەدەستدا بووە. کەس نەیوێراوە دەستیان بۆ بەرێت و هەرکەس خۆی لە قەرەداوون کردوویانەتە قەرەبروت و بۆ پوش و پەڵاشی گیانی نەویستنیان وەك بزوت بوون. دەگەڵ هەر پادشا و خونکارێکدا جووتبوون و بەرهەڵستی خۆی بە کەوی کۆڵیت و زانیوە و کەس نەیتوانیوە لەبەری بکۆخێت.

جا هەروەك لە بێباکێتیی و پەیتیی و خوتێدا شۆڕەسواری مەیدان بوون، لە نانبدەیی و دەهندەیی و ئەمەکداریی و چاکەکارییدا ناویان لە سەرووی ناوانەوە بووە. هونەر و هونەرپەروەر و بوێژ و زانا و پیر و پیاوچاکیشیان زۆر لێ هەڵکەوتوون و لە زۆر بارانەوە بۆ ئەوە شیاون کە گەلی هاوڕەگەزیان خۆیان پێوە رانێ و ئاکار و کردەوەیان لەبەرچاوی کورد نەبینان دانێت.[229]

ئەم هۆزە دەستڕۆیشتوو و فەرمانڕەوا بوون، بە تایبەت لە شاری (حلە) بڕیاربەدەست و قەڵەمڕەو بوون. هەروەك (ئیبن خەلەکان) دەڵێت: ((فسیر غلامە إلیه فلم یعرج علیه وشتم أستاذه، فشکاه إلی والي الحلة، وهو یومئذ ضیاء الدین مهلهل بن أبي العسکر الجاواني))[230].

(گاوانییەکان) چەندین زانا و کەسایەتیی دیاریان تێدا بووە. لە ئەوانە:

---

٢٢٩ـ هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان: ٤.

٢٣٠ـ وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان، لابن خلکان: ٢/ ٣٦٣. الوافي بالوفیات، الصفدي: ٥/ ٤٩.

(ئیبن ئەبی هەیجائ) ناوی تەواوی (محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدولای کوڕی ئەحمەدی جاوانی)یە. ساڵی (٤٦٨ك) لەدایکبووە. لە ساڵی (٥٦١ك) کۆچی کردووە[٢٣١]. واتە (٩٢) ساڵ ژیاوە. بە منداڵیی چووەتە شاری (بەغداد) و لە لای هەریەکە لە (غەزالی) و (ئیلکیا هەراسی) خوێندوویەتی هەتا پێگەیشتووە. لە هەریەکە لە (حومەیدی) و (قوشەیری) و (ئەبوبەکری شامی قازی) و کۆمەڵێکی تر لە زانایان گوێبیستی زانست بووە[٢٣٢]. هەتا بووە بە زانایەکی ناودار، تەنانەت (ئەبولفەواریس)ی فەرموودەناس لە (هەولێر) پێیگەییشتووە و دەرسی لە لا خوێندووە[٢٣٣].

ناوبراو چەند دانراوێکی هەیە. لە ئەوانە: (التبیان بشرح الکلمات المنتظم سلك الأدوات. الذخیرة لأهل البصیرة. شرح المقامات للحریری. عیون الشعر. الفرق بین الراء والغین. مسائل الامتحان. نزهة النفس وروضة المجلس فیما استعمله العوام من کلام العرب ولم یعرفوا حقیقته)[٢٣٤].

ئەمانە و چەندین زانا و کەسایەتیی دیار و بەرچاو، کە لە ناو هۆزی (گاوان)دا پێگە و ڕۆڵیان هەبووە، کە باسکردن و دووان لێیان لە باسەکەمان دووردەخاتەوە. بەڵام لێرەدا ئەو هەندەمان لەبەرئەوە باسکرد، هەتا بزانین نەوەکانی (جابان)ی کوردیی، خەڵکانێکی ئایینپەروەر و نەتەوەدۆست بوون. بەسەر خاکی کوردستان و عێراقەوە کیان و نفوزیان بەرچاوبووە.

---

٢٣١ـ هدیة العارفین، البابانی: ٤٩٤.

٢٣٢ـ تأریخ الإسلام ووفیات المشاهیر والأعلام، الذهبی: ٣٨/ ٣٦١.

٢٣٣ـ طبقات الشافعیة الکبری، الإمام العلامة تاج الدین بن علي بن عبد الکافي السبکي: ٦/ ١٥٢.

٢٣٤ـ هدیة العارفین، البابانی: ٤٩٤. تأریخ الإسلام و وفیات المشاهیر والأعلام، للذهبی: ٣٨/ ٣٦١.

بەڵام جێگەی داخە ئەم هۆزە ئێستا بوونیان نەماوە و لەناوچوون. هەروەك مامۆستا (هەژار) دەفەرمووێت: ((بەڵام ئێستا لەئارادا نەماوە))[٢٣٥].

جگە لە (جاوانییەکان) هەندێك زانا وەك (مەحمود شیت خەتاب) پێی وایە (باجەلانییەکان)یش کە لە (خانەقین) نیشتەجێن دەگەڕێنەوە سەر هۆزی (کاوان) و بە دیارییکراویش دەچنەوە سەر (جابانی کوردیی). بە ئەم پێیەش یاوەری بەڕێز (جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجەلی) کە ئازادکەری شاری (خانەقین)ە کوردە و لە نەوەی (جابانی کوردیی)ە، وشەی (بەجەلی)یش لە (باجەلانی)ەوە هاتووە و لە ئاڵوگۆڕی زمانەوانییدا وای لێهاتووە.

---

٢٣٥- هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان: ٣.

# بەشی چوارەم

## ئەم بەشە لە (چوار) باس پێکهاتووە، کە ئەمانەن:

**باسی یەکەم/ ( مەیمونی کوڕی جابان ) کەسایەتیی و ڕۆڵی لە گێڕانەوەی فەرموودەدا.**

**باسی دووەم/ ئەو فەرموودانەی ( مەیمون ) گێڕاونیەتییەوە.**

**باسی سێیەم/ منداڵەکانی ( مەیمونی کوردیی ).**

**باسی چوارەم/ وتەی زانایانی فەرمووده و ( جەرح و تەعدیل ) لەسەر ( سەنەدی ) هەریەکە لە ( جابان ) و ( مەیمون ).**

## باسی یەکەم

## (مەیمونی کوڕی جابان)

## کەسایەتیی و ڕۆڵی لە گێڕانەوەی فەرموودەدا

هەرچەندە (مەیمون) لە باوکی ناسراوتر و دیاتر بووە، بەڵام باس و خواس لەسەر ژیان و کەسایەتیی ئەمیش هێندە ڕوون و زانراو نییە، -بە هەمان شێوەی (جابان)ی باوکی-. ئەوەندە هەیە کوڕی هاوەڵی بەڕێز (جابان)ە و لە چینی شوێنکەوتووان (تابیعین)دایە و ((ڕەنگە لە کۆتایی چەرخی یەکەمی کۆچییدا ژیابێت))[٢٣٦]. یەکێك بووە لە کەسایەتییە دیار و زانستییەکانی ڕۆژگاری خۆی.

لە پاش گەڕانەوەی باوکی بۆ کوردستان ڕەنگە هەتا ماوەیەك لە شاری (مەدینە)دا مابووبێتەوە، پاشان لەگەڵ خێزانەکەیدا هاتوونەتە (بەصرە) و لە ئەوێ لەگەڵ گەورەپیاواندا ژیاوە.

لەبەرئەوە باوکی ناوینا (مەیمون)، لەبەر فەڕ و پیرۆزیی ئیسلام و بەرەکەتی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەربێت)، کە دواتر وەك ڕێز و خۆشەویستیی بۆ (جابان)، خەڵکی بە (باوکی مەیمون/ أبو میمون) بانگیاندەکرد و ناویاندەهێنا[٢٣٧].

(ئەبو بەصیر) نازناوی (مەیمون)ە، هەرچەندە بەشێك لە زانایان دەڵێن: (ئەبو نوصەیر)، بەڵام ئەمە هەڵەیەکی ڕێنووسیی و ئیملائییە. هەروەك (شەمسەدینی دیمەشقی) ڕوونیکردووەتەوە و دەڵێت: ((عن أبي بن كعب قال: وميمون الكردي يكنى أبا بصير، قلت ذكره مسلم في الكنى بالنون المضمومة والصاد المهملة المفتوحة فقال أبو نصير ميمون الكردي سمع أبا عثمان النهدي روى عنه حماد بن

---

٢٣٦- بڕوانە/ تأريخ الكرد فى العهود الإسلامية: ١٤٥.

٢٣٧- بڕوانە/ حياة الأمجاد من العلماء الأكراد: ١٨٥. مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٦.

زيد وديلم بن غزوان وكذلك ذكره ابن مندة بالنون المضمومة والصاد المهملة المفتوحة في حرف النون من الكنى وقال روى عنه يزيد بن هارون انتهى. ويزيد إنما روى عن ديلم بن غزوان عنه هكذا حدث الإمام أحمد في مسنده فقال حدثنا يزيد حدثنا ديلم حدثنا ميمون الكردي فذكر حديثاً من مسند عمر رضي الله عنه وأطلق أبي النرسي تقييد كنيته في تاريخ البخاري فوجدتها بخطة مغفلة وذكر القاضي أبو الوليد الكناني في كتابه عكس الرتبة وقلب المبنى أنه رآه في تاريخ البخاري كما قاله مسلم بالنون ويقويه أن ابن الجارود حكاه بالنون عن البخاري وقاله الدارقطني بالموحدة المفتوحة والصاد المهملة المكسورة وكذلك قاله عبد الغني بن سعيد وعزاه إلى الدارقطني فقال ميمون الكردي يكنى أبا بصير قاله لي علي بن عمر الحافظ وقيده ابن ماكولا كذلك وقال وصحف فيه مسلمٌ فقال أبو نصير بالنون))[٢٣٨].

ناوبراو (مەیمون) ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی لە هاوەڵان و خەلیفەکانەوە گێڕاوەتەوە، تەنانەت هەندێکیش لە فەرموودەناسان ڕیوایەتەکانی دەگەیەننەوە بە پێغەمبەری خودا. (دروودی خوای لەسەربێت) جێگەی متمانەی زۆرێك لە زانایانی بواری فەرموودەیە، وەك دواتر دەیخەینەڕوو.

سەرەڕای لێهاتوویی و زیرەکیی و بایەخدانی بە فەرموودە، لەگەڵ ئەوەشدا (مەوالی)[٢٣٩] بووە. وەك پێشەوا (ئیبن عەساکیر) کاتێك باسی ئەسەرێك دەکات کە

---

٢٣٨ـ توضيح المشتبه في ضبط أسماء الرواة وأنسابهم وألقابهم وكناهم، ابن ناصر الدين شمس الدين محمد بن عبد الله بن محمد القيسي الدمشقي: ٩/ ٥٦.

٢٣٩ـ مەوالی: وشەیەکی عەرەبییە و چەند واتایەکی جیاواز لەخۆدەگرێت. لە ئەوانە: کۆیلە، هاوپەش، زاوا و خەزور، چاکەکار، دراوسێ، هەروەها ئەگەر کەسێك لەسەر دەستی کەسێکی تر مسوڵمان بێت، پێیدەڵێن مەولای فلانە کەس.

له سەنەدەکەیدا (مەیمون)ی تێدایە. دەفەرمووێت: ((..الفضل بن عميرة حدثني ميمون الكردي مولى عبد الله بن عامر أبو نصير..))[٢٤٠]. بە ئەمەدا دەردەکەوێت، (مەیمون) مەوالی (عەبدوڵای کوڕی عامر) بووە.

شیاوی باسە کۆیلەبوونی ڕێگرنەبووە لەبەردەم چالاکبوون و برەودانی بە توانا زانستییەکانی. ڕەنگە هەبوونی لە ڕشتەی فەرموودەکاندا و وانەگوتنەوە و وانەوەرگرتنی لە سەر دەستی گەورەزانا و زاهیدەکانی سەردەمی خۆی دیارترین گەواهیدەری ئەم ڕاستییەبن.

(مەیمون) لە لای هەرکام لە زانایانی وەك: (جابان)ی باوکی و (ئەبو عوسمانی نەهدی) و (ئەبو رافیعی صائیغ) و (موسلیمی کوڕی یەساری بەصری) و (حەمادی کوڕی زەید) و چەندانی تر زانستی وەرگرتووە.

وانەشی بە چەندانی وەك: (فەزلی کوڕی عومەیرە) و (خالیدی کوڕی دینار) و (ئەبوسەعیدی بەصری) و (ئەبو غالبی بەصری) و چەندینی تر گوتووەتەوە.

(مەیمون) مامۆستای گەورەپیاوانی وەك (مالیکی کوڕی دینار) بووە، لە هەمان کاتیشدا هاوڕێی بووە. وایش دەردەکەوێت پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان پێکەوە هەبوبێت. وەك ئەوەی جارێك پێیگوتووە: «عَنْ أَبِي خَلْدَةَ، قالَ: سَمِعْتُ مَيْمُونَ الْكُرْدِيَّ وَهُوَ عِنْدَ مَالِكِ بن دِينارٍ، فَقالَ لَهُ مالِكُ بنُ دِينارٍ: ما لِلشَّيْخِ لا يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ؟ ..»[٢٤١]. واتە: (مالیکی کوڕی دینار) بە (مەیمون)ی گووت: مامۆستا، ئەوە بۆچی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لە باوکتەوە بۆ ئێمە ناگێڕیتەوە؟

---

٢٤٠- تأريخ دمشق، لابن عساكر: ٤٢/ ٣٢٣ ـ ٣٢٤.

٢٤١- رواه الطبرانيّ في الأوسط، برقم: ٦٢١٣. وأبونعيم في المعرفة، برقم: ٦٤٧٤. والهيثمي في المجمع، برقم: ٦٥٨. وقال: إسناده حسن إن شاء الله.

ئەگەر بە وردیی لە ئەم فەرموودەیە ڕابمێنین، دەگەینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١. (مالیکی کوڕی دینار)، (مەیمون)ی بە مامۆستای خۆی داناوە، هەر لەبەرئەوە پێیگوتووە: (شێخ). خۆ ئەگەر مامۆستاشی نەبووبێت، ئەوا لە پلەی مامۆستا کەمتر نەبووە لای.

٢. (مالیك) متمانەیەکی تەواوی بە (مەیمون) و (جابان)ی باوکی هەبووە، هەر لەبەرئەوە داوای گێڕانەوەی فەرموودەکانی لێکردووە.

٣. بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە (جابان) زۆر لە خزمەتی پێغەمبەردا بووە و فەرموودەی زۆریشی لێوەرگرتووە.

٤. دەرخەری ئەوەیشە کە (جابان) جگە لە (مەیمون) منداڵ تری هەبووە؛ چونکە (مەیمون) دەڵێت: (کان أبي لا یحدثنا)، کەواتە ئەگەر تەنها خۆی بایە دەیفەرموو: (کان أبي لا یحدثني).

[٥]. بەلگەیشە لەسەر ئەوەی (جابان) هاوەڵێکی پێغەمبەر بووە، ئەمەش ڕاستییەکی بێگومان و حاشاهەڵنەگرە و لای هەمووان ڕوون و چەسپاوبووە.

## باسی دووەم

## ئەو فەرموودانەی (مەیمون) گێڕاونیەتییەوە

لێرەدا دێینە سەر باسی (مەیمون) و لە ئەو فەرموودە و ئەسەرانە دەدوێین کە لە پێغەمبەر و هاوەڵانەوە گێڕاونیێتییەوە. جا پێشەوا (ئەبو عەبدولرەحمانی زمرلی) بە باسکردنی ژمارەی فەرموودە و ناونیشانی لاپەڕە و بەرگی کتێبەکانی فەرموودە، سەرجەمی ڕیوایەتەکانی خستووەتەڕوو و کۆیکردوونەتەوە، کە ئەمانەن: ((رواه أحمد: ١/ ٢٢-٤٤، وعبد بن حميد في المنتخب من المسند: (١١) ص: ٣٢، وابن أبي الدنيا في الصمت: (١٤٨) ص: ١٠٩-١١٠، وفي الغيبة: (٨) ص: ٢٤-٢٥، والبزار: (١٦٨) ١/ ٩٧ ، كشف الأستار: (٣٠٥-٣٠٦) ص: ١/ ٤٣٤-٤٣٥، والفريابي في صفة النفاق: (٢٢-٢٣) ص: ٦٨-٦٩، وابن عيدي في الكامل: ٣/ ١٠٤، والضياء في المختارة: (٢٣٥) ص: ١/ ٣٤٣-٣٤٤، والحارث في مسنده الزوائد: ١/ ٥٢٤، والبيهقي في الشعب: (١٧٧٧) ص: ٢/ ٢٨٤، وابن بطة في الإبانة: (٩٤٠-٩٤١) ص: ٢/ ٧٠١-٧٠٢، وأبو نعيم في صفة النفاق: ٢/ ١٣٩، والذهبي في السير: ١١/ ٤٤٥))[٢٤٢].

ئەمانەی خوارەوەش دەقی ڕیوایەتەکانن، کە بە کورتیی دەیانخەینە بەردەست:

یەکەم/ هەریەکە لە پێشەوایان (هەیسەمی) و (ئەحمەد) و (بەزار)، ڕیوایەت دەکەن: «حَدَّثَنَا يَزِيدُ أَنْبَأَنَا دَيْلَمُ بْنُ غَزْوَانَ الْعَبْدِيُّ حَدَّثَنَا مَيْمُونٌ الْكُرْدِيُّ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ إِنِّي لَجَالِسٌ تَحْتَ مِنْبَرِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَهُوَ يَخْطُبُ النَّاسَ فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ

---

٢٤٢. جامع بيان العلم وفضله، أبي عمر يوسف بن عبد الله النمري القرطبي: ٢/ ٣٧٢.

عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ»[٢٤٣]. واته: (مەیمونی کوردی) لە (ئەبو عوسمانی نەهدی)ەوە، گێڕاویەتییەوە، کە گوتوویەتی: من لەژێر دوانگەکەی پێشەوا (عومەر) دانیشتبووم، گوتاری دەدا. فەرمووی: من گوێم لە پێغەمبەر بووە، فەرموویەتی: زۆرترین ترسم لەسەر گەلەکەم، لە ئەو کەسە دووڕووانەیە کە زمانلوس و قسەپاراون.

بەڵام (عەبد بن حومەید) لە (موسنەد)ەکەیدا، بە ئەم شێوازە گێڕاویەتییەوە: ((حدثنا محمد بن الفضل ثنا ديلم بن غزوان عن ميمون الكردي عن أبي عثمان النهدي عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: «إنما أخاف عليكم كل منافق عليم يتكلم بالحكمة ويعمل بالجور»))[٢٤٤].

ئیمامی (بەیهەقی)ش بە ئەم (دوو) گوزارشتە گێڕاویەتییەوە: «أخبرنا أبو عبد الرحمن السلمي ثنا محمد بن عبد الله بن محمد بن قريش أنا الحسن بن سفيان ثنا محمد بن عبيد بن حسان ثنا حماد بن زيد ثنا ميمون الكردي قال: سمعت أبا عثمان النهدي قال: سمعت عمر بن الخطاب رضي الله عنه يقول على المنبر إياكم و المنافق العالم قالوا: و كيف يكون المنافق عالما قال: يتكلم بالحق و يعمل بالمنكر»[٢٤٥]. هەروەها بە ریوایەتی: «أخبرنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني أنا محمد بن أحمد بن ماهان مؤذن المسجد الحرام ثنا علي بن عبد العزيز ثنا عارم ثنا ديلم بن غزوان ثنا ميمون الكردي عن أبي عثمان النهدي عن عمر بن الخطاب: عن النبي صلى

---

٢٤٣- رواه أحمد في مسنده، برقم: ٣١٠، واللفظ له. وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي. والبزار في مسنده، برقم: ٣٠٥. غاية المقصد في زوائد المسند، للحافظ علي بن أبي بكر بن سليمان الهيثمي: ١/ ٣٥١ -باب في المنافق العالم. المطالب العالية: للحافظ ابن حجر العسقلاني، برقم: ٣٠٥٦.

٢٤٤- المنتخب من مسند عبد بن حميد، عبد بن حميد بن نصر أبو محمد الكسي: ٣٢.

٢٤٥- رواه البيهقي في الشعب، برقم: ١٧٧٦.

الله عليه و سلم قال: إنما أخاف على هذه الأمة كل منافق يتكلم بالحكمة و يعمل بالجور و رواه يزيد بن هارون عن ديلم و قال في الحديث: إني أخوف ما أخاف على هذه الأمة منافق عليم اللسان»[٢٤٦].

دووەم/ «حدثني عبد الله بن أحمد، قال: حدثني هدبة بن خالد، قال: حدثنا ديلم أبو غالب، عن ميمون الكردي، عن أبي عثمان النهدي، عن أبي سعيد الخدري، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: تمرق مارقة في فرقة من المسلمين تقتلها أولى الطائفتين بالحق»[٢٤٧]. واتە: (مەيمونى كوردى) لە (ئەبو عوسمانى نەهدى)ەوە، ئەويش لە (ئەبوسەعيدى خودرى)ەوە، گێڕاويەتييەوە، كە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەربێت) فەرموويەتى: دەستەيەك لە مسوڵمانان دەردەچن و جيادەبنەوە، كام لە ئەو دوو دەستە نزيكتربن لە حەق، ئەوەيان دەيكوژێت.

ئەم فەرموودەيە دەربارەى (زولخوەيصيرە) هاتووە، كە لە كاتى دابەشكردنى غەنيمەتدا بە پێغەمبەرى خوداى گوت: دادوەربە.

سێيەم: «حدثنا علي بن حمشاد العدل ثنا العباس بن الفضل الأسفاطي ثنا علي بن عبد الله المديني و إبراهيم بن محمد بن عرعرة قالا: ثنا حرمي بن عمارة حدثني الفضل بن عميرة أخبرني ميمون الكردي عن أبي عثمان النهدي أن عليا رضي الله عنه قال: بينما رسول الله صلى الله عليه و سلم آخذ بيدي و نحن في سكك المدينة إذ مررنا بحديقة فقلت: يا رسول الله ما أحسنها من حديقة قال: لك في

---

٢٤٦- شعب الإيمان، برقم: ١٧٧٧.

٢٤٧- الكنى والأسماء: للدولابي، برقم: ١١٥٣. السنة، عبد الله بن أحمد بن حنبل الشيباني: ١٥١١، (٢/ ٦٣٤).

الجنة أحسن منها»[248]. واته: پێشەوا (عەلی –خودا لێی ڕازیبێت) فەرمووی: جارێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) دەستی گرتبووم، بەناو كوچەیەكی (مەدینە)دا گوزەرماندەكرد، دامان بە لای باخچەیەكی جواندا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەم باخچەیە چەند جوانە! پێغەمبەریش فەرمووی: تۆ لە بەهەشتدا جوانتر لە ئەوەت پێدەدرێت.

(ئەبو یەعلا) و (بەزار)یش، ڕیوایەتەكەیان بە ئەم شێوازە تۆماركردووە: «حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيّ ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَعْمَرٍ، قَالا: حَدَّثَنَا حِرْمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ بْنِ أَبِي حَفْصَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ عَمِيرَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَيْمُونُ الْكُرْدِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ عَلِيّ، قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم، وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِي، فَمَرَرْنَا بِحَدِيقَةٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَحْسَنَهَا مِنْ حَدِيقَةٍ، فقَالَ: لَكَ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْهَا ثُمَّ مَرَرْنَا بِأُخْرَى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَحْسَنَهَا مِنْ حَدِيقَةٍ، قَالَ: لَكَ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْهَا حَتَّى مَرَرْنَا بِسَبْعِ حَدَائِقَ، كُلُّ ذَلِكَ أَقُولُ مَا أَحْسَنَهَا، وَهُوَ يَقُولُ: لَكَ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْهَا فَلَمَّا خَلا لَهُ الطَّرِيقُ اعْتَنَقَنِي، ثُمَّ أَجْهَشَ بَاكِيًا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا يُبْكِيكَ؟ قَالَ: ضَغَائِنُ فِي صُدُورِ قَوْمٍ لاَ يُبْدُونَهَا لَكَ إِلاَّ مِنْ بَعْدِي، قُلْتُ: فِي سَلامَةٍ مِنْ دِينِي؟ قَالَ: فِي سَلامَةٍ مِنْ دِينِكَ»[249].

شێخ (ئیبن حەجەر)یش دیسان لە (ئەبویەعلا)وە، بە ئەم داڕشتنەی ڕیوایەت كردووە: «وقال أبو يعلى: ثنا القواريري، ثنا حرمي بن عمارة ، ثنا الفضل بن عميرة أبو قتيبة القيسي، حدثني ميمون الكردي أبو بصير، عن أبي عثمان، عن علي بن أبي طالب، قال: بينما رسول الله صلى الله عليه وسلم آخذ بيدي ونحن نمشي في

---

٢٤٨- رواه الحاكم في مستدركه، واللفظ له، وصححه، برقم: ٤٦٧٢. وأحمد في فضائل الصحابة، برقم: ١١٠٩. قال الذهبي في التلخيص: صحيح.

٢٤٩- رواه البزار في مسنده، برقم: ٧١٦، و أبويعلى في مسنده، برقم: ٥٦٥.

بعض سكك المدينة إذ أتينا على حديقة فقلت: يا رسول الله، ما أحسنها من حديقة قال: لك في الجنة أحسن منها. حتى مررنا بسبع حدائق، كل ذلك أقول: ما أحسنها ويقول: لك في الجنة أحسن منها، فلما خلا لي الطريق اعتنقني ثم أجهش باكيا، قال: قلت: يا رسول الله، ما يبكيك؟ قال: ضغائن في صدور أقوام لا يبدونها لك إلا من بعدي. قال: قلت: يا رسول الله، في سلامة من ديني؟ قال: في سلامة من دينك»[٢٥٠].

چوارەم/ پێشەوا (سیوتی) و (ئیبن ئەبی حاتەم)، دەگێڕنەوە: «أخرج ابن أبي حاتم عن ميمون الكردي أن ابن عباس كان راكبا فمر عليه جراد فضربه، فقيل له: قتلت صيدا وأنت محرم؟ فقال: إنما هو من صيد البحر»[٢٥١]. واتە: (مەیمونی کوردی) لە (ئیبن عەباس)ەوە ڕیوایەتی کردووە، کە جارێك (ئیبن عەباس) بەسەر وڵاخێکەوە بوو، کوللەیەك بەلایدا تێپەڕی، ئەویش لێیدا و کوشتی. پێیانگوت: گیانەوەرێکت کوشت لە کاتێکدا لە ئیحرامدایت! گوتی: کوللە هەمان حومکی نێچیری ئاویی هەیە. واتە: وەك چۆن دروستە بە ئیحرامەوە گیانلەبەرە ئاوییەکان ڕاوبکەیت، کوللەیش بە هەمان شێوەیە.

پێنجەم/ ڕاڤەکاری قورئان، پێشەوا (بەغەوی) لە تەفسیری ئایەتی: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ﴾. ئەسەرێك بە سەنەدی (مەیمونی کورد)یەوە، لە ئیمامی (عومەر)ەوە دەگوازێتەوە و دەفەرموێت: «أخبرنا أبو سعيد الشريحي، أخبرنا أبو إسحاق الثعلبي، أخبرني الحسين بن محمد بن فنجويه، أخبرنا محمد بن علي بن الحسين القاضي، أخبرنا بكر بن محمد المروزي، أخبرنا أبو قلابة، حدثنا عمرو بن الحصين، عن الفضل بن عميرة، عن ميمون الكردي، عن

---

٢٥٠ـ أورده ابن حجر في المطالب، برقم: ٤٠٣٢.

٢٥١ـ الدر المنثور، عبد الرحمن بن الكمال جلال الدين السيوطي: ٣/ ١٩٩. تفسير ابن أبي حاتم، برقم: ٥٨٣١، (٤/ ١٢١٠ ـ ١٢١١).

أبي عثمان النهدي قال: سمعت عمر بن الخطاب قرأ على المنبر: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ الآية، فقال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (سابقنا سابق، ومقتصدنا ناج، وظالمنا مغفور له)، قال أبو قلابة فحدثت به يحيى بن معين فجعل يتعجب منه»[٢٥٢].

شەشەم/ پێشەوای زانا (سیوتی) دیسان لە ڕیوایەتێکی (مەیمون)دا دەڵێت: «أخرج عن ميمون الكردي قال: رأيت عروة البزار في النوم بعد موته، فقال إن لفلان السقاء علي درهما وهو في كوة في بيتي فخذه فادفعه إليه، فلما أصبحت لقيت السقاء فقلت له ألك على عروة شيء؟ قال: نعم درهم، فدخلت بيته فوجدت الدرهم في الكوة فدفعته إلى السقاء»[٢٥٣]. (مەیمونی کوردی) دەڵێت: لە دوای مردنی (عوروەی بەزار)، لە خەودا بینیم، پێیگوتم: فلانەکەسی ئاوگێڕ درهەمێکی بەلامەوەیە، درهەمەکە لەناو پەنجەرەی ماڵەکەمدایە، برۆ پێیبدەرەوە. دەڵێت: منیش بەیانی چووم بە کابرای ئاوگێڕم گوت: تۆ هیچ قەرزێکت لای (عوروە) هەیە؟ گوتی: بەڵێ، درهەمێکم لایەتی. پاشان چووم بۆ ماڵەوەیان، بینیم درهەمەکە لە ئەو شوێنایە کە لە خەوەکەدا پێیگوتبووم.

حەوتەم/ (ئیبن عەساکر) لە (تەئریخ)ەکەیدا، دەگێڕێتەوە: «أخبرنا أبو الأعز قراتكين بن الأسعد أن أبو محمد الجوهري أن أبو القاسم عبد العزيز بن جعفر بن محمد بن حمدي الخرقي ناعمر بن أيوب السقطي نا عبيد الله بن عمر القواريري نا يونس بن أرقم ناكثير النواء أبو إسماعيل وعوف الأعرابي عن ميمون الكردي قالا كنا عند ابن عباس، فقال رجل ليته حدثنا عن علي فسمعه ابن عباس فقال: أما لأحدثنك حقا إن رسول الله صلى الله عليه وسلم أمر بالأبواب الشارعة في المسجد فسدت وترك

---

٢٥٢ـ معالم التنزيل، البغوي: ٦/ ٤٢١. الكشف والبيان، النيسابوري: ٨/ ١١١.

٢٥٣ـ شرح الصدور بشرح حال الموتى والقبور: جلال الدين عبد الرحمن السيوطي، برقم: ٢٠.

باب علي، فقال: إنهم وجدوا من ذلك فأرسل إليهم إنه بلغني أنكم وجدتم من سدي أبوابكم وتركي باب علي، وإني والله ما سددت من قبل نفسي ولا تركت من قبل نفسي إن أنا إلا عبد مأمور أمرت بشئ ففعلت إن أتبع إلا ما يوحى إلي»[٢٥٤]. واته: (عەوفی ئەعرابی) و (مەیمونی کوردی) دەڵێن: لە لای (ئیبن عەباس) بووین، پیاوێك گوتی: خۆزگە دەربارەی پێشەوا (عەلی) شتێکی بۆ باسدەکردین. (ئیبن عەباس) کە گوێی لێبوو، فەرمووی: دەی ئەوا لە پێغەمبەرەوە شتێکی ڕاستییت بۆ دەگێڕمەوە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێت) فەرمانی کرد بە ئەوەی هەموو درگاکانی سەر کۆڵانی مزگەوت دابخرێن، جگە لە درگاکەی (عەلی)، کە ئەو درگایەی هێشتەوە و داینەخست، خەڵك بە لایانەوە گران بوو، دواتر پێغەمبەر کەسێکی نارد بۆ لایان، پێیانبڵێ: هەواڵم پێگەیشتووە ئێوە شتێکتان بۆ دروستبووە سەبارەت بە ئەم کارەی من، کە هەموو درگاکانم داخستووە جگە لە ئەوەی (عەلی). سوێند بە خودا من هەر لە خۆوە دامنەخستووە، بەڵکوو من بەندەیەکی فەرمانپێکراوم، خودا فەرمانی پێکردوم و منیش جێبەجێمکردووە. من نیگای خودام بە ئەنجامگەیاندووە و شوێنی سروش کەوتووم.

ئەوەی ڕابوورد، ئەو فەرموودانەبوون، کە (مەیمون) لە پێغەمبەر و یاوەرانەوە گێڕاونیەتییەوە، وەك دەردەکەوێت، هەموویانی لە (عوسمانی نەهدی)ەوە وەرگرتووە و سەنەدەکەیشی (موتەصیلە). واتە گەیشتووە بە پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەربێت).

---

٢٥٤ـ تاريخ دمشق، ابن عساكر: ٤٢/ ١٣٧.

## باسی سێیەم

## منداڵەکانی ( مەیمونی کوردیی )

هەرچی پەیوەستە بە ژیانی خێزانی و منداڵ و نەوەکانیەوە، شتێکی ئەوتۆمان چنگ نەکەوت، جگە لە (سێ) کەسایەتیی، کە لە سەرچاوەکاندا بە کوڕی (مەیمونی کوردی) ناویانهاتووە. ئەوانیش: (خەلیل، جابر، مەهدی).

کوڕی یەکەم/ ناوی (خەلیل)ە و بە (باوکی عەبدولرەحمان) ناسراوە. ئەم کوڕە تەنها لە ئەم سەنەد و سەرچاوەیەدا بەردەستمکەوت، کە لە پێغەمبەری خوداوە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە، جگە لە ئەمەش هیچ زانیارییەکی ترم لە بارەیەوە چنگ نەکەوت و هیچیشی لێوە ڕیوایەت نەکراوە:

«أخبرنا القاسم بن سعيد أخبرنا عبد الله بن إبراهيم بن تميم الفامي أخبرنا الحسين بن جعفر بن محمد الزيات بمصر حدثنا جعفر بن أحمد بن سلم بن حبيب العبدي حدثنا أبو عبد الرحمن الخليل بن ميمون الكردي حدثنا عبد الله بن أذينة عن هشام بن الغاز عن ابن أبي مليكة عن عائشة رضي الله عنها قالت قال رسول الله إن أبغض الرجال إلى الله الألد الخصم»[٢٥٥]. واتە: (ئەبو عەبدولرەحمان –خەلیلی کوڕی مەیمونی کوردی) گێڕاویەتییەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت)

---

٢٥٥ـ أحاديث في ذم الكلام وأهله: أبو الفضل المقرىء، الرقم: ١١٨ (١/ ١٣٦ ـ ١٣٧).

بەهەمان ژمارە ولاپەڕە لە: ذم الكلام وأهله: شيخ الإسلام أبو إسماعيل عبد الله بن محمد الأنصاري الهروي، تحقيق: عبد الرحمن عبد العزيز الشبل.

لە ڕاستییدا ئەم دوو کتێبە یەك شتن، بەڵام دراوەتە پاڵ دوو نووسەری جیا، منیش ناوی هەردوو نووسەرەکەم هێنا، بۆ ئەوەی مافی خاوەنە ڕاستەقینەکەی نەفەوتێت و پارێزراوبێت، جا هەرکامێکیان بێت.

فەرموویەتی: بوغزاوترین کەس بەلای خوداوە، ئەوانەن زۆرترین ململانێ و زۆرترین کێشمەکێشم دەکەن.

کوڕی دووەم/ (جابر)، کە بە نازناوی (کوردی) ناوبانگبووە. ئەمەشم تەنها لە (ئیبن ماکولا)وە دەستکەوت، کە لە کتێبەکەیدا (ئەلئیکمال)، دەفەرمووێت: (("باب الكردي والكردي والكرزي" أما الكردي بضم الكاف وبالدال المهملة فهو جابر بن ميمون الكردي))[٢٥٦].

ناوبراو نیشتەجێی شاری (واست) بووە و شارەزایەکی هەڵکەوتوو و بەتوانای زانستی فەرموودە و لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی قورئانی پیرۆز بووە[٢٥٧].

کوڕی سێیەم/ ناوی (مەهدی)ە، کە بە (ئەبو یەحیا) ناسراوە و شۆرەت و ڕۆڵی لە ئەوانی پێشوو زیاترە و چالاکیی باش و بەرچاوی هەبووە.

(مەهدی) مەزنترین و ناودارترین کەسایەتیی زانستیی کوردە لە سێ سەد ساڵەی یەکەمی ڕۆژگاری ئیسلامییدا، مەولای بنەماڵەی (ئەلمعولی) بووە لە هۆزی (ئەلئەزد) و لە شاری (بەصرا) دانیشتووە، هەر لەبەرئەوە بە (المعولي الأزدي البصري) ناوبراوە. (مەهدی) زانایەکی شارەزا و هەڵکەوتووی زانستەکانی فەرموودە بوو. لەسەر دەستی کەڵەزانایانی وەك (حەسەنی بەصری) و (ئیبن سیرین) و نزیکەی (بیست) شێخ و مامۆستای تر خوێندوویەتی و فێری زانستە ئایینییەکان بووە و فەرموودەی بۆ شاگردان و هاوچەرخانی خۆی گوێزاوەتەوە. سەرچاوەکان زیاتر لە (چل) قوتابی و شاگردی (مەهدی کوڕی مەیمون)یان ژماردووە[٢٥٨].

---

٢٥٦- الإكمال في رفع الارتياب عن المؤتلف والمختلف في الأسماء والكنى، لابن ماكولا: ٧/ ١٤٣.

٢٥٧- بڕوانە/ کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئسلامییدا، د. زرار سەدیق: ٧١.

٢٥٨ - کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئسلامییدا: ٧٠.

ئەو زانایانەی لە زاری ئەمەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، گەلێك زۆرن. وەك هەرکام لە: (بوخاری، موسلیم، ئەحمەد، ئەبوداود، ترمزی، ئیبن ماجە، بەزار، تەبەرانی، بەیهەقی، ئیبن حیبان، ئیبن خوزەیمە، حاکم، نەسائی، ئیبن حەجەر، تەحاوی، دارەمی، دارەقوتنی) و چەندین فەرموودەناسی تر. بوونی ناوبراو لە ڕشتەی فەرموودەی ئەم کەڵەزانایانەدا، بەڵگەی دەست و دەمپاکیی و سەرڕاستیی و دامەزراویی و متمانەدارییەتی.

بۆ چەسپاندنی ئەم حەقیقەتە درێژەی نادەینێ و تەنها بە ئەم گوتەیەی زانای هاوچەرخ شێخ (شوعەیب ئەرنەئوت) بەسندە دەکەین، کە دەربارەی فەرموودەیەك لە سەنەدەکەیدا (مەهدی) تیایە. دەڵێت: ((إسناده صحيح على شرط مسلم، رجاله ثقات رجال الشيخين))[259].

جا ئەگەر بێتو هەموو ئەو فەرموودانە بهێنین کە ناوبراو لە ڕشتە (سەنەد)ەکەیدا هەیە، ئەوا دەیان فەرموودە ڕیزدەکەین و هەر بە کۆتا ناگەین، بگرە فەرموودەکانی زۆر زیاترە لە ئەوەی بتوانین لێردە جێیانبکەینەوە.

سەبارەت بە مێژووی مردنیشی، بۆچوونی جیاواز هەیە. هەندێك دەڵێن: لە سەردەمی خەلیفە (مەهدی)دا مردووە کە لە نێوان ساڵەکانی ( ١٥٨ ـ ١٦٩ك/ ٧٧٥ ـ ٧٨٤ن)دا بووە، هەندێکی تر پێیان وایە لە ساڵەکانی (١٧١ك/ ٧٨٧ن یاخود ساڵی (١٧٢ك/ ٧٨٨ن) لە دونیا دەرچووە[260].

---

٢٥٩ـ مسند أحمد، بتعليق الشيخ شعيب أرنؤط، حديث رقم: ٢٢١٩٥.

٢٦٠ـ بڕوانە/ کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئسلامییدا، د. زرار سەدیق: ٧٠.

## باسی چوارەم

## وتەی زانایانی فەرموودە و ( جەرح و تەعدیل ) لەسەر ( سەنەدی ) هەریەکە لە ( جابان ) و ( مەیمون )

بە حوکمی ئەوەی ناوبراوان (جابان) و (مەیمون)، لە ڕشتەی فەرموودەکاندا بوونیان هەیە، پێم باشبوو هەڵوێستە و هەڵسەنگاندنیان لە لایەن زانایانی بواری فەرموودەوە و (جەرح و تەعدیل)ەوە بخەمە بەرچاو، بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنای کەسایەتیی و ئەندازەی متمانەی ئەو دەقانە ببین، کە گەیاندوویانە پێمان.

سەبارەت بە ڕشتەی (جابانی کوردیی)، بە حوکمی ئەوەی یاوەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بووە، قسەی لەسەر نەکراوە و وەك نەریتی هەمیشەیی زانایان، دەرحەق بە هاوەڵان بێدەنگ بوون و هیچیان لەسەر نەگوتووە. ئەمەش لەسەر بنەمای ((الصحابةُ كلُّهم عدولٌ))[٢٦١]. واتە: هاوەڵان هەموویان دادوەرن.

بە ئەم پێودانگەش (جابانی کوردیی) وەك هەر هاوەڵێکی تر، قسەوەرگیراو و متمانەدارە و جێگەی قسەلەسەرکردن نییە! چونکە بە گوێرەی دەقەکانی قورئان و حەدیس، هاوەڵان بە تێکڕا چاك و پاك و سەرڕاست و خاوەن خەسڵەتی جوان و پەسەندن.

هەرچیش پەیوەستە بە (مەیمون)ەوە، کە لە چینی تابیعینە، قسەی پێویستی لەسەر کراوە و زانایان لە بارەیەوە هەڵوێستیان دەربڕیوە. لە ئەوانە:

---

٢٦١- التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد، لابن عبد البر: ٢٢/ ٤٧. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي، محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري أبو العلا: ١/ ٢٥٦. سبل السلام: ١/ ٢١. عمدة القاري: ٣٣/ ٤٠٧. التلخيص الحبير: ٣/ ٤٠٥. في الحديث الشريف والبلاغة النبوية: ٢٨.

ئیمامی (زەهەبی) کە شایەتی متمانەداریی بە لای (ئیبن حیبان)ەوە بۆ دەدات و دەڵێت: ((وذكره ابن حبان في الثقات))[262]. کەواتە (مەیمون) بە لای (ئیبن حیبان)ەوە متمانەداربووە، هەر لەبەرئەوە فەرموودەکەشی بە (صەحیح) داناوە.

زانای فەرموودەناسیش (هەیسەمی) دوای ئەوەی فەرموودەی: «من كذب عليّ متعمدا..» دەهێنێت، کە (مەیمون) لە (جابان)ی باوکیەوە ڕیوایەتی کردووە، سەبارەت بە ڕشتەی گێڕەرەوانی فەرموودەکە، بە ژمارەکانی (٦٦٥٤) و (٧٥٠٧)، دەفەرمووێت: ((رواه الطبراني في الأوسط والصغير و رجاله ثقات))[263]. لە جێگەیەکی ترا و لە فەرموودەی ژمارە (٦٥٨)دا، دەفەرمووێت: ((قال الحافظ الهيثمي: إسناده حسن إن شاء الله))[264].

سەبارەت بە ڕشتەی فەرموودەی دووەمیش کە دیسان (مەیمون) لە (جابان)ی باوکیەوە گێڕاویەتییەوە، هەریەکە لە (هەیسەمی) و (مونزیری) دەفەرموون: پیاوانی گێڕەرەوەی فەرموودەکە متمانەپێکراون. ((قال الحافظان المنذري والهيثمي: رجاله ثقات))[265].

هەروەها (عەجەلی)یش متمانەی بە (مەیمون) بەخشیوە. هەروەك ئیمامی (زەهەبی) دەفەرمووێت: ((وثقه العجلي))[266]. پێشەوا (مەناوی)ش، پاش ئەوەی ئەو فەرموودەیەی کە باسی دانەوەی قەرزی تێدایە لە لایەن قەرزارەکەوە، دەڵێت: ئەم فەرموودە یەکێکە لە ئەو چوار بنەمایانەی کە هەموو حوکمە شەرعییەکانی بۆ

---

٢٦٢- ميزان الإعتدال، للذهبي: ٤/ ٢٣٣.

٢٦٣- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد، الهيثمي: ٤/ ٢٣٧.

٢٦٤- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد: ١/ ٣٧٤.

٢٦٥- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد: ٤/ ٢٣٧. مێرگ و گوڵزاری بەهار بۆ گەشتیارانی ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار: ٢٠٧.

٢٦٦- ميزان الإعتدال، للذهبي: ٤/ ٢٣٣.

دەگەڕێنرێتەوە. پاشان دەڵێت، (تەبەرانی) لە (مەیمونی کوردی) گێڕاویەتییەوە و ئیسنادەکەی دروستە. ((وهي احدى القواعد الأربع التي ردت جميع الأحكام إليها "طب عن ميمون الكردي"، وإسناده صحيح))[٢٦٧].

هەروەها (یەحیای کوڕی موعین) و (ئەبوداود)یش متمانەیان بە (مەیمون) کردووە. وەك (عەسقەلانی) لە دوو کتێبدا، لێیانی نەقڵکردووە: ((ميمون الكردي أبو بصير عن أبي عثمان النهدي وعنه حماد بن زيد والفضل بن عميرة وغيره وثقه بن معين وأبو داود))[٢٦٨]. دووبارە دەڵێت: ((ميمون الكردي، كنيته أبو بصير بالباء وقيل أبو نصير بالنون. روى عن أبيه وأبي عثمان النهدي. وعنه الفضل بن عميرة الطفاوي ومالك بن دينار وأبو خلدة وحماد بن زيد وغيرهم. قال عثمان الدارمي عن ابن معين ليس به بأس وقال ابن أبي خيثمة عن ابن معين صالح وقال الآجري عن أبي داود ثقة وذكره ابن حبان))[٢٦٩].

هەروەها (ئەلبانی) بە ئەم چەشنە لێیدوواوە: ((قلت: إسناده صحيح، ميمون الكردي و ثقة أبو داود و ابن حبان، و قال ابن معين: ليس به بأس[٢٧٠]، و في رواية: صالح))[٢٧١].

ئەمانە و سەرەڕای ئەوەی قسە لەسەر سەنەدی (مەیمون) هەیە و هەندێك لە زانایان متمانەی تەواوی پێناکەن. بەڵام هەموو ئەم شایەتییانەی سەرەوە بەڵگەی بەس و پەسەندن سەبارەت (مەیمون) و (جابان)، کە هەر دووکیان لە

---

٢٦٧ـ التيسير بشرح الجامع الصغير، المناوي: ٢/ ٧٥٨.

٢٦٨ـ لسان الميزان، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي: ٧/ ٤٠٧.

٢٦٩ـ تهذيب التهذيب، ابن حجر العسقلاني: ١٠/ ٣٥٢.

٢٧٠ـ تأريخ ابن معين (رواية عثمان الدارمي)، يحيى بن معين أبو زكريا: ٢٠٧. الجرح والتعديل: ٨/ ٢٣٨، المغني في الضعفاء: الذهبي، برقم: ٦٥٦٥ (٢/ ٦٩١).

٢٧١ـ السلسلة الصحيحة، محمد ناصر الدين الألباني، حديث رقم: ١٠١٣، (٣/ ٨٧)

گێڕانەوەی حەدیسەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت) ڕاستگۆ و متمانەپێکراو بوون[272].



272. مێرگ و گوڵزاری بەهار: 207 _ 208.

## بەشی پێنجەم

## لە بەشی پێنجەمدا، ئەم باسانە دەخەینەڕوو:

**باسی یەکەم/ جلوبەرگی کوردیی، ڕەسەنایەتیی و شەرعییبوون.**

**باسی دووەم/ لە ئیسلامدا هیچ جۆرە جلوبەرگێك دیاریکراو و سەپێنراو نییە.**

**باسی سێهەم/ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێت) **جلوبەرگی کوردیی لە لا پەسەندبووە و لەبەریکردووە.**

**باسی چوارەم/ ئایا (شەرواڵ) پۆشاکی تایبەتی چ نەتەوەیەکە؟**

**باسی پێنجەم/ چەند پێشنیازێك سەبارەت بە برەوپێدانی جلوبەرگی کوردیی.**

## باسی یەکەم

## جلوبەرگی کوردیی، ڕەسەنایەتیی و شەرعییبوون

ئاشکرایە هەر گەل و نەتەوەیەك كۆمەڵێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە كە لە نەتەوەکانی تر جیایدەکاتەوە و لە ڕێگەی ئەو خەسڵەتە تایبەتییانەوە ناسنامە و شوناسی خۆی دەپارێزێت و بە هۆیانەوە بوونی خۆی دەسەلمێنێت. پۆشاك و جلوبەرگیش یەكێكە لە شوناسی هەر نەتەوە و هۆزێك، هەروەك چۆن زمان و فەرهەنگی مێژوویی و زانستیی و پاشماوە کەلەپوورییەکان وێنا و نمایشکاری ناسنامەی نەتەوە و گەلن.

لەبەرئەوە دەبینین هەر نەتەوە و جۆرە بەرگێکی تایبەت بە خۆی هەیە، کە ئەو بەرگە بووەتە بەشێك لە نەریت و ناسنامەی. کەواتە جلوبەرگ یەكێكە لە فاکتەرە جیاکەرەوەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی لە قۆناغەکانی بەرەوپێشچووندا. لە هەمان کاتیشدا ئەو جلوبەرگە ویستێکی خودای گەورەیە، کە دەبێت ئادەمیزاد بە جلوبەرگی شایستە و گونجاو داپۆشراوبێت. هەروەك ئەم ڕاستییە لە دەقێکی قورئانی پیرۆزدا بەدیاردەکەوێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا﴾. سورة الأعراف، الآية: ٢٦.

لە ئەو کاتەی خودای گەورە (ئادەم و حەوا)ی لە بەهەشتدا کردە دەرەوە، ئەندامەکانی لەش (عەروەت)یان بەدەرکەوت. خودای گەورە گەڵای دارەکانی بەسەردا وەراندن، بۆ ئەوەی ئەندامەکانی لەشیانی پێ داپۆشن. هەروەك ئەم ڕاستییە لە ئایەتی: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾. سورة الأعراف، الآية: ٢٢. بەدیاردەکەوێت.

لەبەرئەوە لە ڕوانگەی ئەم (دوو) ئایەتە پیرۆزەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی، کە

خودای گەورە مەبەستی هەرەگەورەی لە بەکارهێنانی جلوبەرگ، داپۆشینی عەورەتە. ئەم ڕێسایەی خودای گەورەش پەیڕەوکراوە و دەشکرێت هەتا ڕۆژی دوایی[٢٧٣]. کەواتە جوانکاریی و تەواوکاریی و ڕازانەوەش لە جلوبەرگدا، ویستێکی خودای گەورەیە کە جوانیی و جوانکاریی خۆشدەوێت[٢٧٤].

---

٢٧٣ـ نەتەوایەتی.. نیشتیمانپەروەریی، عبدالله مەلا سعید گرتکی: ٤٠.

٢٧٤ـ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولرەحمان سدیق.

## باسی دووەم

## لە ئیسلامدا هیچ جۆرە جلوبەرگێك دیاریيكراو و سەپێنراو نییە

پێش لەوەی باس لە جلوبەرگی نەتەوەیی و پۆشاكی كوردیی بكەین، وا چاكە ئەو گومان و قسە و بۆچوونانە ڕەتبكەینەوە كە پێیان وایە ئیسلام جلوبەرگێكی دیاریيكراوی بەسەر موسڵماناندا فەرزكردووە، یان لە ئیسلامدا جلوبەرگێكی تایبەت هەیە بە ناوی (پۆشاكی ئیسلامیی)، یان ئیسلام هەڵوێستێكی نەرێنیی هەیە سەبارەت بە جلوبەرگی نەتەوەكان، یان دەڵێن ئیسلام جلوبەرگی بیانیی قەدەغەدەكات؛ چونكە دروستكراوی دەستی بێباوەڕانە. ئەمانە و چەندین قسەی تری لە ئەم چەشنە!

بۆ ڕەتكردنەوەی ئەم جۆرە قسانە سەرنجتان بۆ لای ئەم چەند خاڵەی لای خوارەوە رادەكێشین:

**یەكەم:** لە پێش ئیسلام و لە سەرەتای هاتنی ئیسلامیشدا، دیاردەیەكی جیهانیی بوو، كە هەندێك جلوبەرگ هێما بووە بۆ جۆرێك لە ناسنامەی (ئایینیی) هەندێك كۆمەڵ، ئەمەش بە هۆی نەبوونی سیستمێكی ئیداریی بۆ ڕێكخستنی باری شارستانیی وەك ئەوەی ئەمڕۆ. لەبەرئەوە ئەو سەردەمانە جەخت لەسەر جۆری جلوبەرگ دەكرایەوە، كە چی لەبەربكرێت و چی لەبەرنەكرێت[٢٧٥].

وەك چۆن (مەسیحییەكان) بە بەستنی پشتێنە (شدّ الزنار) دەناسرانەوە و (مەجوسییەكان)یش بە لەسەركردنی (قەلەنسووە)، ئەمەش بە مەبەستی ڕێكخستنی بارودۆخی ناو كۆمەڵ بووە. بەڵام بە دەركەوتنی سیستمی ئیداریی پێشكەوتوو لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، لە ساڵانی دواییدا واز لە ئەم شێوازە هێنرا و

---

٢٧٥. ئیسلام وپاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان.

جلوبەرگ بوو بە دیاردەیەکی گشتیی و کەس لە کەس بە هۆی جلوبەرگەوە جیانەدەکرایەوە. لەبەرئەوە (ئیبن خەلەکان) لە (وفیات الأعیان)دا سەبارەت بە ماوەی حوکمی (عەباسی)یەکان دەڵێت: ((وکان ملبوس الناس قبل ذلك شیئا واحدا، لا یتمیز أحد عن أحد بلباسه))[٢٧٦]. واتە: لە پێش دەسەلاتی (عەباسی)یەکاندا خەڵك یەکپۆش بوون و بە هۆی جلوبەرگەوە هیچ کەس لە ئەوی تر جیانەدەکرایەوە.

**دووەم:** ئەوەی زۆربەی (فوقەهاکان) ئاماژەیان بۆ کردووە کە موسڵمان نابێت جلوبەرگی بێباوەڕان لەبەربکات، مەبەستیان جلوبەرگی بەکار هێنراو (مستعمَل)ی بێباوەڕانە، کە ڕەچاوی ڕاگرتنی پاك و تەمیزیی جلوبەرگی بە ئەو جۆرە نەکردووە کە بۆ نوێژپێوەکردن بشێت. ئەگەرنا، شتێکی ئاساییە مرۆڤی موسڵمان جلوبەرگی ئاسایی و ڕێکوپێکی دروستکراوی هەر وڵاتێك لەبەربکات. هەروەك هاوەڵی بەڕێز (ئەنەسی کوڕی مالیك) دەفەرموێت: «أَنَّ مَلِكَ الرُّومِ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ صلى الله علیه وسلم مُسْتَقَةً مِنْ سُنْدُسٍ فَلَبِسَهَا»[٢٧٧]. واتە: پاشای ڕۆمەکان فەروەیەکی قۆڵدرێژی بە دیاریی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) هەنارد، پێغەمبەریش لەبەریکرد.

کەواتە جلوبەرگی نوێ، هی هەر شوێنێك بێت دروستە بەکاربهێنرێت و لەبەربکرێت. حوکمەکەی جیایە لە جلوبەرگی بەکارهێنراو (مستعمل)[٢٧٨].

هەروەك (ئیبن تەیمیە) دەڵێت: ((علی عهد رسول الله کانت الثیاب تجلب إلیهم من الیمن ومصر والشام وأهلها کفار، وکانوا یلبسون ما نسجه الکفار ولا

---

٢٧٦. وفیات الأعیان وأنباء الزمان، لابن خلکان: ٦/ ٣٧٩.

٢٧٧. رواه أبوداود، الرقم: ٤٠٤٧، وأحمد، برقم: ١٣٤٢٤.

٢٧٨. بڕوانە/ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولرەحمان سدیق.

یفسلونه))[279]. واته: له سەردەمی پێغەمبەردا، جلوبەرگ له (یەمەن) و (میصر) و (شام) هاوردەدەکران، له کاتێکدا خەڵکانی ئەوێ بێباوەڕ بوون، مسوڵمانان پۆشاکی چنراوی بێباوەڕانیان لەبەردەکرد و نەشیاندەشۆرد.

(ئیبن قەیم)یش دەڵێت: ((فإن غالب لباسهم كان من نسج اليمن، لأنها قريبة منهم، وربما لبسوا ما يُجلب من الشَّام ومصر، كالقباطي المنسوجة من الكتان التي كانت تنسجها القبطُ))[280]. واته: زۆربینەی پۆشاکی مسوڵمانان له (یەمەن)ەوە دەهات؛ چونکه لێك نزیکبوون، هەروەها له (مصر) و (شام)یشەوە بۆیان دەهات. بەرهەمی چنراوی (قیبتی)ەکانیشیان لەبەردەکرد.

هەر سەبارەت بە ئەم باسە (ئیبن قودامەی مەقدیسی) دەفەرمووێت: ((ولا نعلم خلافا بين أهل العلم في إباحة لبس الثوب الذي نسجه الكفار، فإن النبي صلى الله عليه وسلم وأصحابه إنما كان لباسهم من نسج الكفار))[281]. واته: ئێمه هیچ راجیاییەك نابینین سەبارەت بە دروستیەتیی پۆشینی ئەو پۆشاکانەی که بێباوەڕان دەیچنن؛ چونکه پێغەمبەر خۆی چنراوی دەستیانی لەبەرکردووه.

دکتۆر (عبدالكريم زيدان)یش له (المفصل)ەکەیدا دەڵێت: ((ينبغي غسل مايمس من ثيابهم، وكذلك سراويلهم لأنهم لايحتاطون من البول كما نعلم منهم ذلك، لأن العلة في كراهة إستعمال ثيابهم المستعملة هو إحتمال تنجسها، بسبب لُبسهم لعدم إحتياطهم من البول ونحوه))[282]. واته: لەبەرئەوە پۆشاکی بەکاهێنراوی بێباوەڕان

---

٢٧٩ـ مجموع الفتاوى، لابن تيمية: ٢٨/ ٧٩. الحسبة، لابن تيمية: ٣٢.

٢٨٠ـ زاد المعاد في هدي خير العباد، ابن قيم الجوزية: ١/ ١٤٤.

٢٨١ـ المغني مع شرحه الكبير: ١/ ١٠٥.

٢٨٢ـ المفصل الجامع فى الفقه الإسلامي، عبدالكريم زيدان: ٣/ ٣٠٦.

دەشۆردرێت، چونکە ئەوان خۆیان نابوێرن لە میز. ئێمەش لەبەر گریمانەی پیسبوون دەیشۆرین، چونکە ئەوان لە پیسیی خۆیان ناپارێزن.

کەواتە هیچ کێشەیەك لە بەکارهێنانی جلوبەرگی دروستکراوی دەستی بیانیی و بێباوەڕاندا نییە و لە ڕووی شەرعەوە بەکارهێنانیان دروستە. مەگەر پێشتر بێباوەڕەکان خۆیان ئەو بەرگەیان بەکارهێنابێت و جلوبەرگەکەیان پاك ڕانەگرتبێت، کە ئەو کات دەبێت پێش ئەوەی مسوڵمانان بەکاریانبهێنن بیانشۆنەوە. ئیسلام لەبەر جیاوازیی کەش و هەوای شوێنەکان و جۆری پیشە و کارەکان و جۆری بۆنە و یادەکان و فرەڕەنگیی نەتەوەکان، بۆ لەبەرکردنی هەر جۆرە جلوبەرگێك مرۆڤی ئازادکردووە.

(ئیبن قیم) لەبارەی جلوبەرگی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێت) دەڵێت: ((فلبس في كل موطن ما يناسبه))[283]. واتە: پێغەمبەر بۆ هەموو شوێنێك جلوبەرگی موناسب و گونجاو بە ئەو شوێنەی لەبەردەکرد. هەروەها دەڵێت: ((هديه في اللباس: أن يلبس ما تيسر من اللباس))[284]. واتە: هەر بەرگێك هەبایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لەبەریدەکرد.

هەر لەبەر ئەمەشە کاتێك خەڵك مسوڵمان دەبوون -جا لە هەر هۆز و نەتەوەیەك بووبن-، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) نەیدەهێشت جلوبەرگی نەتەوەییان بگۆڕن و جلوبەرگی عەرەب لەبەربکەن. لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوییش نەزانراوە، پێغەمبەری خودا داوای لە مسوڵمانانی غەیرە عەرەبی وەك: (جابانی کوردیی، بیلالی حەبەشیی، سەلمانی فارسیی) کردبێت، واز لە جلوبەرگی نەتەوەکەی خۆیان بهێنن، یان جلوبەرگی عەرەب

---

٢٨٣ـ زاد المعاد في هدي خير العباد: ١/ ١٣٠.

٢٨٤ـ المصدر السابق: ١/ ١٣٧.

لەبەربکەن. هەروەك (ئەبو عەبدوڵای عەبدەری)، دەڵێت: «ولم يأت عنه أنه نهى وافدا عليه من العجم عن زيهم، وندبهم إلى زي العرب»[٢٨٥].

**چوارەم:** سەبارەت بە جلوبەرگی ئافرەتانیش هەر جۆرێك بێت دروستە و دەشێت، بە مەرجێك ئەم (سێ) ئایەتەی قورئان بەرجەستەبكات:

١ _ ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾. سورة الأحزاب، الآية: ٥٩.

٢ _ ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾. سورة النور، من الآية: ٣١.

٣ _ ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾. سورة النور، من الآية: ٣١.

كورتەی بەرجەستەكردنی ناوەڕۆكی ئەم (سێ) برگە ئایەتەش، ئەوەیە كە ئافرەتان باڵاپۆش و سەرپۆش بن، ئیتر بە كام شێوە و بە چ جۆرە شێوازێك و بە كام ڕەنگ، ئەوانە هەمووی بۆ ئازادیی كەسیی بەجێدەمێنێت.

چونكە ئێمە كاتێك سەرنج لە شێواز و ڕەنگی جلوبەرگی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێت) دەدەین، دەبینین ڕەنگە جیاواز و ئاڵۆاڵاكانی لەبەركردووە. هەروەك لە ئەم چەند فەرموودەیەدا ئەم ڕاستییە بەدیاردەكەوێت: «ألبسوا من ثيابكم البياض فإنها من خير ثيابكم وكفنوا فيها موتاكم»[٢٨٦]. واتە: ڕەنگی جلوبەرگەكانتان با (سپیی) بێت؛ چونكە (سپیی) باشترین ڕەنگە. مردووەكانتان لە كفنی سپییدا كفن بكەن.

وەك دەبینین لێرەدا فەرمانی كردووە بە لەبەركردنی پۆشاكی (سپیی). خودی خۆیشی پۆشاكی ڕەنگ (سەوز)ی لەبەركردووە. هەر وەك (ئەبو ڕەمسە)

---

٢٨٥ـ التاج والإكليل لمختصر خليل، محمد بن يوسف بن أبي القاسم العبدري أبو عبد الله: ١/ ٥٠٢. نظام الحكومة النبوية المسمى بالتراتيب الإدارية، عبدالحيّ الكتاني: ١/ ٢٧٩.

٢٨٦ ـ رواه البيهقي في الكبرى، برقم: ٥٧٦٣. وأحمد، برقم: ٣٠٣٦.

دەفەرمووێت: «إنطلقت مع أبي نحو رسول الله صلى الله عليه وسلم فرأيت عليه بردين أخضرين»[287]. واتە: لەگەڵ باوکمدا چووینە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بینیم دوو باڵاپۆشی (سەوز)ی لەبەردابوو.

سەبارەت بە ڕەنگی (سوور)یش هاوەڵی بەڕێز (بەراء -خودای لێ ڕازیبێت)، دەفەرمووێت: «كان النبـي صلى الله عليه وسلم مربوعا، قد رأيته في حلة حمراء ما رأيته شيئا أحسن منه»[288]. واتە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) باڵای مامناوەند بوو (نە کورت بوو، نە درێژ)، بینیم باڵاپۆشێکی (سوور)ی لەبەردابوو، هیچ کەسێکم نەدیوە لە ئەو جوانتر بێت.

دەربارەی ڕەنگی (ڕەش)یش حەزرەتی (جابر -خودای لێ ڕازیبێت)، دەفەرمووێت: «أن رسول الله صلى الله عليه وسلم دخل مكة عام الفتح وعليه عمامة سوداء»[289]. واتە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لە ڕۆژی ڕزگارکردنیدا کە چووە ناو (مەککە)وە مێزەرێکی (ڕەش)ی لەسەردابوو.

هەروەها (فەزلی کوڕی عەباس) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: «دخلت على رسول الله صلى الله عليه وسلم في مرضه الذي توفي فيه وعلى رأسه عصابة صفراء فسلمت عليه، فقال: يا فضل. قلت: لبيك يا رسول الله، قال: اشدد بهذه العصابة رأسي قال: ففعلت»[290]. واتە: لە ئەو نەخۆشییەی کە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێت) تێیدا وەفاتیکرد، چووم بۆ لای و سڵاوم لێکرد، پارچە قوماشێکی (زەرد) بەسەر سەریەوە بوو. فەرمووی: ئەی فەزل؟ منیش گوتم: بەڵێ، قوربان.

---

٢٨٧ ـ رواه أبوداود، برقم: ٤٠٦٥. والبيهقي في الشعب، برقم: ٦٢٣٩. وأحمد، برقم: ١١٣٧٤.

٢٨٨ ـ رواه البخاري، برقم: ٥٨٤٨.

٢٨٩ ـ رواه مسلم، الرقم: ٣٣٧٦.

٢٩٠ـ رواه الترمذي في الشمائل، الرقم: ١٣٧.

فەرمووی: بە ئەم پارچە پەڕۆیە سەرم ببەستە. منیش بۆم بەست.

لە ئەم فەرموودانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە بەکارهێنانی هەموو ڕەنگەکان شتێکی دروست و ڕێگەپێدراوە و جیاوازیی ڕەنگەکان لە ئیسلامدا هێندە گرنگ نییە و مرۆڤیش چی ڕەنگێك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت ئازادە، بەڵام ئەوەی گرنگ و جێگەی هەڵوێستەلەسەرکردنە و ئیسلام داوایکردووە پۆشتەیی و داپۆشراوییە. پۆشتەبوونیش مۆرك و سیمایەکی شارستانییەت و پێشکەوتنی مرۆڤە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا.

جا کە مرۆڤ ئازاد بێت لە ڕووی جۆری پۆشتەبوونەوە، ئەوا مافێکی خوداپێداوی گەلانە کە بایەخ بە جلوبەرگی نەتەوەیی خۆیان بدەن و (دەنگ) و (ڕەنگ)ی خۆیانی پێ بەهێزبکەن و هەوڵبدەن بە ئەم جلوبەرگەوە بناسرێن[291].

کەواتە پێویستە هەموومان ئەو ڕاستییە بزانین ئەوەی ئیسلام مەبەستیەتی لە جلوبەرگی پیاوان و ئافرەتاندا، تەنها ئەوەیە کە ئەو جلوبەرگە عەورەتی مرۆڤ داپۆشێت، لە هەمان کاتیشدا لە ماددەیەکی پاك دروستکرابێت. ئاشکرایشە کە عەورەتی پیاوان لە نێوان (ناوك و ئەژنۆ/ السرة والركبة)دایە، هی ئافرەتانیش سەرتاپای جەستەیانە، تەنها دەست و دەموچاوەکانیان نەبێت. بەڵام شێواز و ڕەنگی جلوبەرگەکە وەك باسمانکرد ئەمە ئازادییەکی تاکەکەسییە و ئیسلام ئەم ئازادییەی بۆ خودی مرۆڤ جێهێشتووە.

سەبارەت بە پۆشاکی ئافرەتانیش بەهەمان شێوە، مەبەستی سەرەکیی ئیسلام پۆشتەیی و خۆداپۆشینە، بە چەشنێك ئەندامەکانی لەشی دیارنەبێت و تەنگ و تەسك نەبێت. جا بە کام شێوە و شێوازێك و بە کام ڕەنگ بێت، ئەوانە هەمووی بۆ

---

٢٩١ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان: عەبدولڕەحمان سدیق.

ئازادی کەسیی بەجێدەمێنێت و خودای گەورە ئازادیی بە خودی تاکەکان داوە و کەس ناتوانێت گوشاری بخاتەسەر[٢٩٢]. هەر لەبەرئەوە ئیمامی (عومەر) خودای لێ ڕازیبێت، قەدەغەیکردبوو عەرەبە موسوڵمانەکان بەرگی عەرەب دابنێن و بەرگی نەتەوەیەکی تر لەبەرکەن. واتە: هەتا بتوانن ڕەسنایەتیی خۆیان بپارێزن[٢٩٣]. نامەی بۆ والییەکانی دەنارد و تێیدا فەرمانی پاراستنی ڕەسەنایەتیی و مۆرکی نەتەوەیی دەکرد. «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ: أَتَانَا كِتَابُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ اخْشَوْشِنُوا وَاخْشَوْشِبُوا وَاخْلَوْلِقُوا وَتَمَعْدَدُوا كَأَنَّكُمْ مُعَدٌّ وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ وَزِيَّ الْعَجَمِ قَالَ فَنَهَاهُمْ عَنْ زِيِّ الْعَجَمِ»[٢٩٤].

## باسی سێیەم

---

٢٩٢ـ نەتەوایەتی.. نیشتیمانپەروەریی، عبدالله مەلا سعید گرتکی: ٤٠ ـ ٤٢.

٢٩٣ ـ عبقرية عُمر رضي الله عنه: ٣٩. وەرگیراو لە/ مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٩.

٢٩٤ـ شرح مشكل الآثار، الطحاوي: ٥/ ٣٤٠.

## پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) جلوبەرگی کوردیی لە لا پەسەندبووە و لەبەریکردووە

بۆ ئێمەی کورد پێویستە ئاوڕێکی جیدیی لە جلوبەرگی کوردیی بدەینەوە، بە تایبەت ئەگەر بزانین لە فەرهەنگ و ژیانی ڕۆژانەی مسوڵمانانی چینی پێشوودا چ بایەخێکی هەبووە. ئەوەتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) داوایکردووە شەرواڵی کوردیی بەکاربهێنرێت، تەنانەت خۆیشی نوێژیشی پێوەکردووە[٢٩٥]. ئەگەر سەرتاسەری دونیا بگەڕێیت لە بەرگی کوردیی جوانتر و داپۆشەرتر نییە. ئەوەندە شانازییەش بەسە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) شەرواڵی پەسەندکردووە[٢٩٦].

خاتوو (عائیشە)ی دایکمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ فَنَظَرَ إِلَى أَعْلَامِهَا نَظْرَةً فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي، وَقَالَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ، قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُنْتُ أَنْظُرُ إِلَى عَلَمِهَا وَأَنَا فِي الصَّلَاةِ فَأَخَافُ أَنْ تَفْتِنَنِي»[٢٩٧].

واتە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بە پۆشاکێکی ڕەنگاوڕەنگ و نەخشدارەوە نوێژی کرد. کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد، فەرمووی: ئەم پۆشاکە لاببەن و ئەوەی (ئەبوجەهم)م بۆ بهێنن؛ چونکە ئەم بەرگە نەخشدارە سەرقاڵی کردم و بیری لای نوێژەکە بردم.

---

٢٩٥- نەتەوایەتی، نیشتیمانپەروەریی، عبدالله مەلا سعید گرتکی: ٣٤.

٢٩٦- مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٩.

٢٩٧- رواه البخاري، برقم: ٣٧٣.

له درێژەی ئەم فەرموودەیەدا و له ڕیوایەتی (ئەبوداود) هاتووە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) پۆشاکی کوردیی لەبەرکردووە. هەروەك دایکمان (عائیشە) دەگێڕێتەوە: «أَخَذَ كُرْدِيًّا كانَ لأَبِي جَهْمٍ، فَقِيلَ: يا رسُولَ اللهِ الْخَمِيصَةُ كانَتْ خَيْراً مِنَ الْكُرْدِيِّ»[٢٩٨]. واتە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) پۆشاکە کوردییەکەی (ئەبوجەهم)ی وەرگرت، هاوەڵانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، پۆشاکە ڕەنگاوڕەنگەکە لە ئەم بەرگە کوردییە باشتربوو.

ڕاڤەکاری فەرموودە (عەزیم ئابادی) دەفەرموێت: ((«وأخذ كرديا». أي: رداء كرديا))[٢٩٩]. واتە: باڵاپۆشێکی کوردیی وەرگرت و لەبەریکرد.

لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) زانیویەتی (ئەبوجەهم) پۆشاکێکی تری هەیە، لەبەرئەوە داوای بێنەخش و نیگارەکەیانی کرد و فەرمووی ئەوەیانم بۆ بهێنن.

جا هاوەڵان کە گوتیان (خەمیصە)کە لە (ئینبیجانیە)کە باشترە، مەبەستیان باشتربوونی جۆری قوماشەکە بوو[٣٠٠]، نەك خودی پۆشاکەکە، ئەمە لە لایەك.

لە لایەکی ترەوە ڕەنگە مەبەستیان لە بەباشتردانانی (خەمیصە)کە، لەبەر ئەوە بووبێت، نەك زبریی (ئینبیجانیە)کە ئەزیەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بدات. وەك چۆن لە هەموو کاتێکدا سۆزیان بەرانبەری نواندووە و پێشنیازیانکردووە پێغەمبەر کارێك بکات دووربێت لە زەحمەت و ئازار.

---

٢٩٨- سنن أبي داود، برقم: ٩١٦. حسّنه المحققان: الألباني ومحمد محي الدين عبدالحميد. وأورده ابن الأثير في الجامع الأصول من أحاديث الرسول: ١/ ٣٦٩٥. حديث حسن، وشطره الأول في الصحيحين.

٢٩٩- عون المعبود شرح سنن أبي داود، العظيم آبادي: ٣/ ١٢٩.

٣٠٠- مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٦.

جۆری ئەو پۆشاکە کوردییەی کە پێغەمبەر پۆشی، دەتوانین بڵێین قاتی شاڵی هەورامیی بووە، بە ئەم گریمانەیەی خوارەوە:

(إنبجانیه) بە ئەو جۆرە پۆشاکە دەگوترێت، کە زبر و سادە و بێنەخش و نیگارە. هاوشێوەی قاتی مەرەز (شاڵ)ی کوردیی.

پێشەوایان (سیوتی) و (صەنعانی) بە ئەم چەشنە (ئینبیجانیە)یان پێناسکردووە: ((أنبجانية بفتح الهمزة وسكون النون وكسر الموحدة وتخفيف الجيم وبعد النون ياء النسبة كساء غليظ لا علم له))[٣٠١].

وشەی (خمیصە)ش بە ئەو جۆرە جلوبەرگە دەگوترێت، کە لە خوریی دروستکراوە و نەخش و نیگاری لەسەرە. هەروەك (ئیبن مەنزور) دەڵێت: ((وهي ثوبُ خَزّ أو صُوفٍ مُعلم وقيل لا تسمى خَمِيصة إلا أن تكون سَوْداءَ مُعْلمة وكانت من لباس الناس قديماً وجمعها الخَمائِصُ وقيل الخمائص ثيابٌ من خَزّ ثخانٌ سُودٌ وحُمْر ولها أعْلامٌ ثِخانٌ أيضاً))[٣٠٢].

(زوبەیدی)ش هەمان شت دەڵێت: ((والخَمِيصَةُ: كِسَاءٌ أسْوَدُ مُرَبَّعٌ، له عَلَمَانِ، فإنْ لمْ يَكُنْ مُعْلَماً فليْسَ بخَمِيصَةٍ، والخَمِيصَةُ سَوْدَاءُ والجَمْعُ خَمَائِصُ. وقِيلَ: الخَمَائِصُ: ثِيَابٌ من خَزٍ ثِخَانٌ سُودٌ وحُمْرٌ، ولها أعْلامٌ ثِخانٌ أيْضاً، وكانَتْ من لِبَاسِ النَّاسِ قَدِيماً))[٣٠٣].

لە ئەمەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە (خەمیصە) هەر پۆشاکێکە نەخش و نیگاری لەسەرە، هەر لەبەرئەوە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێت) پێی خۆش نەبوو. فەرمووی: لە نوێژەکەدا خەیاڵی بردم.

---

٣٠١ـ تنوير الحوالك شرح موطأ مالك، السيوطي: ١/ ٩١. سبل السلام: الصنعاني: ١/ ١٥١،

٣٠٢ـ لسان العرب: ٧/ ٢٩.

٣٠٣ـ تاج العروس من جواهر القاموس، مرتضى الزَّبيدي: ١٧/ ٥٦٦.

له فەرموودەیەکی تردا کە (ئەبوهورەیرە) گێڕاویەتییەوە، هاتووە: «دخلت يومًا السوق مع رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فجلس إلى البزازين فاشترى سراويل بأربعة دراهم.. الحديث. وفيه فقلت: يا رسول الله إنك لتلبس السراويل؟ قال: أجل في السفر والحضر والليل والنهار فإني أمرت بالستر»[٣٠٤].

واتە: لەگەڵ پێغەمبەردا چوومە بازاڕەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) شەرواڵێکی کڕی بە (چوار) درهەم. منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ شەرواڵ لەبەردەکەیت؟ فەرمووی: بەڵێ، لە سەفەر و لە ماڵەوە، بە شەو و بە ڕۆژا لەبەریدەکەم! چونکە من فەرمانم پێکراوە باش خۆم داپۆشم.

جا ئاشکرایە لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) شەرواڵی کڕیوە هەتا لەبەریبکات؛ چونکە هەر بە ئیزنی ئەو لە ئەو سەردەمەدا هاوەڵان شەرواڵیان لەبەردەکرد[٣٠٥].

بەڵکوو یاوەرانی هاندەدا لەسەر پۆشینی شەرواڵی کوردیی. وەك لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە:

یەکەم/ «عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم عِنْدَ الْبَقِيعِ يَعْنِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ، فَمَرَّتِ امْرَأَةٌ عَلَى حِمَارٍ وَمَعَهَا مُكَارِي، فَمَرَّتْ فِي وَهْدَةٍ مِنَ الأَرْضِ، فَسَقَطَتْ فَأَعْرَضَ عَنْهَا بِوَجْهِهِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا

---

٣٠٤ـ رواه البيهقي في الشعب: ٦٢٤٤. إرشاد الساري: ٨/ ٤٢٧، شرح حديث رقم: ٥٨٠٤. تحفة الأحوذي للمباركفوري: ٩/ ٧٠. فتح الباري: ٣/ ٤٦٠. عون المعبود: ١٤/ ١٥٥. وفيه يوسف بن زياد البصري وهو ضعيف.

٣٠٥ـ فتح الباري: ١/ ٦٢٦، وە: ١٠/ ٣٣٦. وەرگیراو لە/ مێژگو گوڵزاری بەهار: ٢٠٧.

مُتَسَرْوِلَةٌ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُتَسَرْوِلاتِ مِنْ أُمَّتِي[306]. ثلاثا، يا أيها الناس اتخذوا السراويلات فإنها من أستر ثيابكم، وحصنوا بها نساءكم إذا خرجن»[307].

واتە: پێشەوا (عەلی) فەرموویەتی: لە ڕۆژێکی باراناوییدا لە خزمەت پێغەمبەردا بووم لە لای (بەقیعی غەرقەد)دا، ئافرەتێك بەسەر گوێدرێژێکەوە بوو، لەگەڵ خاوەن گوێدرێژەکەدا، دایان بە لای زەوییەکی نزم و نەوییدا. ئافرەتەکە کەوتە خوارەوە، لە ئەو کاتەدا بۆ ئەوەی نەیبینێت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) ڕووی لێوەرچەرخاند. خەڵکەکە گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو ئافرەتە شەرواڵی لە پێدایە، لە ئەو کاتەدا سێ جار فەرمووی: خودایە لە شەرواڵەپێکان خۆشببە. ئەی خەڵکینە شەرواڵ بپۆشن؛ چونکە داپۆشەرترین جۆری پۆشاکە. هەر کاتێکیش ژنانتان لە ماڵ دەرچوون با بە شەرواڵەوە دەربچن.

لە ڕیوایەتێکیشدا بە ئەم گوزارشتە هاتووە: «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ عَلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَرَّتِ امْرَأَةٌ عَلَى دَابَّةٍ، فَلَمَّا حَاذَتْ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَثَرَتْ بِهَا، فَأَعْرَضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَتَكَشَّفَتْ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ عَلَيْهَا سَرَاوِيلَ، فَقَالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُتَسَرْوِلَاتِ»[308].

واتە: خودایە گیان، بەزەیی بنوێنە بەرانبەر بە ئەو ژنانەی شەرواڵ لەبەردەکەن.

دووەم/ لە فەرموودەی (صەحیح)دا هاتووە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) شەرواڵی کڕیوە: «عَنْ سُوَيْد بن قَيْس رضي الله عنه قال: جاءَنا رَسُولُ

---

٣٠٦ـ رواه البيهقي في الآداب، برقم: ٥١١. والبزار في مسنده، برقم: ٨٩٨.

٣٠٧ـ رواه البيهقي في الآداب، برقم: ٥١١.

٣٠٨ـ رواه البيهقي، في شعبه، برقم: ٧٤٢٢.

اللهِ صلى الله عليه وسلم فَساوَمَنَا سَراوِيلَ فَبِعْنَاهُ، وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم: زِنْ وَأرْجِحْ»[٣٠٩].

واته: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) هاتە لامان مامەڵەی شەرواڵێکی لەگەڵ کردین، ئێمەش پێمانفرۆشت. پێغەمبەر بە پارەدەرەکەی فەرموو: پارەکەی بۆ بکێشە[٣١٠] و زیادەشی پێبدە.

جا لە ئەم فەرموودانەوە ئەوە دەردەکەوێت کە لەپێکردنی شەرواڵ بۆ پیاوان و بۆ ئافرەتان، سوننەتە.

زانایان دەفەرموون: یەکەم کەس شەرواڵی لەبەرکردووە حەزرەتی (ئیبراهیم) بووە (سەلامی خودای لەسەربێت) «أول من لبس السراويل»[٣١١]؛ چونکە خۆی کوردبووە و پۆشاکیشی کوردیی بووە. هەر لەبەر پۆشینی ئەم شەرواڵە کوردییە شەرعیی و شیرینەیە لە دوارۆژدا یەکەمین کەسە پۆشتەدەکرێتەوە و پۆشاکی بە بەردادەکرێت، وەك پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی[٣١٢].

حەزرەتی (موسی)یش (سەلامی خودای لەسەربێت) ئەو رۆژەی خودای گەورە، گفتوگۆی لەگەڵ کرد شەرواڵی لەبەردابوو[٣١٣]. شێخی (قەستەلانی) فەرموویەتی: ((لە ئەوەدا بەڵگە هەیە کە سوننەتە شەرواڵ لەبەربکرێت))[٣١٤].

---

٣٠٩- سنن ابن ماجه، برقم: ٢٢٢٠، تحقيق و تعليق: محمد فؤاد عبد الباقي. وابن حبان: ٥١٤٧، صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.

٣١٠- دیارە لە ئەو کاتەدا پارە وەك ئێستا نەبووە بە ژمارە بێت، بەڵکوو دراوی ئەو سەردەمە سکەی زێڕ وزیو بووە و مامەڵەپێکردنی بە کێشانە بووە.

٣١١- عمدة القاري شرح صحيح البخاري: ٢٣/ ٢٠٢. فتح الباري شرح صحيح البخاري: ٦/ ٣٩٠.

٣١٢- «أَوَّلُ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام». رواه البخاري، برقم: ٤٤٦٣.

٣١٣- إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري: ٨/ ٤٢٧. وەرگیراو لە/ مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٩.

٣١٤- إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري: ٨/ ٤٢٧. وەرگیراو لە/ مێرگ و گوڵزاری بەهار: ٢٠٩.

بە تایبەت بۆ ئافرەتان، شەرواڵ پۆشاکێکی شکۆدار و داپۆشەرە و حەیا و حورمەتیان زیاتر دەپارێزێت و حیکمەتی حیجابی زیاتر تێدا بەرجەستەدەبێت.

وەك ئیمامی (مەناوی) دەفەرمووێت: بۆ ئافرەتان بە نیەتی خۆداپۆشین و پۆشتەیی، شەرواڵ لەبەرکردن، سوننەتێکی جەخت لەسەرکراوەیە. «رحم الله المتسرولات من النساء، أي اللذين يلبسون السراويل بقصد الستره فهو لهن سنة مؤكدة محافظة على ستر عوراتهن ما أمكن»[٣١٥].

(عەبدولکەریم زەیدان)یش، جەخت لە هەمان بۆچوون دەکاتەوە و دەڵێت: ((من الأحاديث التي ذكرناها يعرف أن لبس المرأة ما يسمى بالسراويل أمر جائز شرعا، بل ويستحب شرعا، كما تدل على ذلك الأحاديث الشريفة التي ذكرناها))[٣١٦].

---

٣١٥ـ فيض القدير، مناوي: ٤/ ٣٠.

٣١٦ـ المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم: ٣/ ٣٢٥ ـ ٣٢٦.

## باسی چوارەم

## (شەرواڵ) پۆشاکی تایبەتی چ نەتەوەیەکە؟

سەبارەت بە وشەی (شروال) ئیمامی (قەستەلانی)، فەرموویەتی: ((سروال فارسي معرّب، والسراوين بالنون لغة والشروال بالشين المعجمة لغة))[٣١٧].

واتە: (شەرواڵ) وشەیەکی فارسییە و بە عەرەبیی کراوە. لە شێوەزارێکدا -کە دوور نییە مەبەستی زمانی کوردیی بێت- پێیدەگوترێ (شەرواڵ) و لە شێوەزارێکی تردا پێیدەگوترێت (سەروال).

دووبارە دەفەرموێت: ((السراويلات جمع سراويل، غير منصرف قيل: لأنه منقول عن الجمع بصيغة مفاعيل وأن واحده سروالة، وقيل لأنه أعجمي))[٣١٨].

پسپۆڕی زانستی (نەحو)یش (سیبەوەیهی) دەڵێت: ((سراويل واحدة، وهي أعجمية أعربت))[٣١٩].

کەواتە زانایان دانیان بە ئەوەدا ناوە کە (شەروال) داهێنراو و دروستکراوی عەرەبەکان نییە، بەڵکوو دروستکراوی دەستی نەتەوەی غەیری عەرەبە، بەڵام ڕەنگە لەبەر چەند هۆکارێك وەك ئەوەی ئاشنا بە کورد نەبووبن، یان نەگەیشتبێتنە ئەو بڕوایەی دڵنیابن لە ئەوەی بڵێن هی کوردە، یان هەر هۆکارێکی تر بێت ڕاستەوخۆ ناوی کوردیان نەهێناوە، ئەگینا ئێمەی کورد گومانمان لە ئەوەدا نییە، کە شەرواڵ شاکاری داهێنراوی دەستی کوردانە.

بەپێی ڕیوایەتی پێشەوا (تەبەرانی)، ئەم تێڕوانینە پشتئەستوورتر دەبێت، وەك هاتووە، کاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) شەرواڵێکی لە

---

٣١٧ـ إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري، للقسطلاني: ٣/ ١٠٩.

٣١٨ـ إرشاد الساري: ٣/ ٣١٠. شرح حديث: ١٨٣٨.

٣١٩ـ الصحاح (تاج اللغة وصحاح العربية)، الجوهري: ٧/ ١٨.

کابرایەکی قوماشفرۆش کڕی، کابرا کە زانی کڕیارەکە پێغەمبەری خودایە، پەلاماریدا دەستی ماچبکات، پێغەمبەر نەیهێشت و دەستی گێڕایەوە و فەرمووی: ئەمە کارێکە عەجەمەکان بەرانبەر پاشاکانیان دەیکەن.

جا لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر، سەبارەت بە دەستماچکردنی کابرا، کە فەرمووی: (ئەمە خەڵکانی عەجەم دەیکەن بەرانبەر بە پاشاکانین). پێدەچێت ئەو قوماشفرۆشە کوردبێت و جلوبەرگی کوردیی فرۆشتبێت؛ چونکە لە لایەك لە ناو عەرەبدا دەستماچکردن نەریت نییە، بەڵکوو ئەوە لە دابونەریتی ئێمەی کوردە. لە لایەکی ترەوە ئەوان بە کەمیی بایەخ بە جلوبەرگ و پۆشاکی غەیری خۆیان دەدەن، هەر لەبەرئەوە کەمیش بازرگانیی پێوەدەکەن. هەروەها ئێمەی کورد لە بازنەی عەجەمییداین و بەشێکین لێیان، کە پێغەمبەر فەرمووی ئەمە کاری عەجەمەکانە. بە ئەمەدا دیارە ئەو کابرایە عەرەب نەبووە.

ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: «عن أبي هريرة قال دخلت يوما السوق مع رسول الله صلى الله عليه و سلم فجلس إلى البزازين فاشترى سراويل بأربعة دراهم، وكان لأهل السوق وزان، قال: فقال له رسول الله صلى الله عليه و سلم: اتزن وأرجح، فقال الوزان: إن هذه الكلمة ما سمعتها من أحد. قال أبو هريرة، فقلت له: كفى بك من الجفاء في دينك أن لا تعرف نبيك صلى الله عليه و سلم فطرح الميزان، و وثب إلى يد النبي صلى الله عليه و سلم يقبلها، فجذب رسول الله صلى الله عليه و سلم يده منه، وقال: هذا إنما يفعله الأعاجم بملوكها، إنما أنا رجل منكم، فزن وأرجح وأخذ رسول الله صلى الله عليه و سلم السراويل»[٣٢٠].

---

٣٢٠ـ رواه الطبراني في الأوسط، برقم: ٦٥٩٤، (٦/ ٣٤٩).

به ئەمەدا دەتوانین ئەگەرێکی بەهێزی کوردبوونی ئەو بازرگانە قوماشفرۆشە بکەین و گریمانەی کوردبوونی بۆ دابنێین. لە ئەمەیشەوە دەتوانین بڕیاری خاوەندارێتیی و ڕەسەنایەتیی شەروال بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکەی بگێڕینەوە، کە کوردە.

هەموو ئەم فەرموودانەی سەرەوە ئاماژەپێکردنێکی ڕاستەوخۆیە، بە ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەربێت) جلوبەرگی کوردیی لەبەرکردووە، بەڵکوو جلوبەرگی کوردییشی پێ شیاو و شەرعیی بووە و داوایکردووە بۆ کاتی خواپەرستیی بۆی بهێنن، هەتا لەبەریبکات. فەرمانی کردووە هاوەڵانیش بەکاریبهێنن.

لەبەرئەوە جێگەی خۆیەتی ئێمەی کورد، شانازیی بە جلوبەرگی کوردانەی خۆمانەوە بکەین. چ جلوبەرگی پیاوان، یان ئافرەتان. نەوەکانی خۆمان زیاتر ڕابهێنین، پابەندبن بە ئەم جلوبەرگەوە، کە جگە لە ئەوەی سیمایەکی نەتەوەیی بە وڵاتەکەمان دەبەخشێت، لە هەمان کاتیشدا مافێکە پێغەمبەری ئیسلام پێمانی بەخشیوە[٣٢١].

چونکە نەتەوەی کورد لە ئەم بوارەدا خاوەنی کەلەپورێکی دەوڵەمەند و مەزن و پیرۆزە و بەرگ و پۆشاکی شەرعیی و ڕەسەنی تایبەت بە خۆی هەیە. هەر لە کڵاش و شاڵ و، کۆڵەباڵ و چۆغە و مشکی و جامەدانی و کەوا و سەڵتە و فەقیانە و کڵاوزەڕ و دەستماڵ و، هتد .. بەدەر لە ئەو هەمووە تایبەتمەندییە کەموێنانەی تر کە نیشتیمانی ئێمە هەیەتی و بە هۆیانەوە لە نەتەوەکانی تر جیادەکرێینەوە.

---

٣٢١. بڕوانە/ نەتەوایەتی.. نیشتیمانپەروەریی: ٤٣.

ئەوەتا یەکێکی وەك (ئیبن راوندی[٣٢٢]) سەبارەت بە تەفسیری ئایەتەکانی تایبەت بە جلوبەرگی ئافرەتانی بەهەشت، پاش وەسفێکی زۆر، ناچاردەبێت نمونەیەك بهێنێتەوە، کە نمونەش دەهێنێتەوە دەڵێت: ((ملابس أهل الجنة من السندس والاستبرق وأساور الفضة والذهب .. إنها تجعلهم يشبهون عروس الأكراد..))[٣٢٣]. واتە: جلوبەرگی ئافرەتانی بەهەشت وەك جلوبەرگی بووکێنیی ئافرەتانی کورد وایە.

ئەمەش جێگەی فەخر و شانازییە؛ چونکە سەرەڕای لایەنی جوانیی و هونەریی دەستڕەنگینی نەتەوەکەمان، بەڵگەیەکی بەهێزیشە لەسەر سەربەخۆیی ئەم نەتەوەیە و هەبوونی کەلتووری ڕەسەن بە خۆیان هەر لە دێرینەوە هەتا هەنوکەش.

لە لایەکی ترەوە وەك هەر مرۆڤێکی سەر ئەم زەمینە، مافی سروشتیی و خوداپێداوی خۆمانە، نەتەوە و خاك و نیشتیمان و کەلتوور و زێدی باوباپیرانی خۆمانمان خۆشبوێت؛ چونکە وێڕای ئەوەی جگە لە خۆمان، خەڵکان و گەڕیدە و پسپۆڕ و مێژوونووسانێکی زۆر، شایەتیی ئەوە بۆ میللەتەکەمان دەدەن، کە خاوەنی زۆر سیفات و تایبەتمەندێتیی جۆراوجۆر و کەموێنەین[٣٢٤].

لەبەرئەوە پێویستە بە هەموو لایەکمانەوە ئەم ڕەسەنایەتییەی خۆمان بپارێزین و ئەم بەرهەمە خۆماڵییە لەدەست نەدەین. هەر لێرەشەوە جێگەی خۆیەتی

---

٣٢٢ـ (ابن الراوندی) کەسایەتییەکی ئاڵۆز بووە و بە ئاسانیی ناتوانین بیروباوەڕی دەستنیشانبکەین؛ چونکە لە سەرەتادا مسوڵمانێکی ئەهلی سوننە بووە و دواتر بووە بە شیعە و دواتریش بووە بە موعتەزیلە و پاشان بووەتە زیندیقە و هەندێکیش پێیان وایە دواجار مولحید دەرچووە.

٣٢٣ـ وەرگیراو لە/ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان.

٣٢٤ـ بڕوانە/ ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان.

ئاوڕێکی جیدیی و ڕەسمیی لە شوێنەوار و کەلەپوری گەلەکەمان بدرێتەوە لە لایەن وەزارەت و دامودەزگا پەیوەندییدارەکانەوە، بە تایبەت ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی کە بۆ ئامانجی لە ئەم چەشنە دامەزراوون. وەك: (کۆمەڵەی مێژوونووسانی کوردستان) و (کۆمەڵەی کەلەپوری کوردستان)، ئەمەش بۆ سوودوەرگرتن و وەبەرهێنانی ئەو گەواهینامانەی کە مێژوونووسان لە بارەی شوێنەوار و کەلەپوری کوردییەوە ئاماژەیان بۆ کردووە؛ چونکە نەتەوەی کورد بە درێژایی سەدان ساڵ، مێژووی تێکدەدرێت و دەشێوێندرێت بە مەبەستی چەواشەکردنی ئەو ڕاستییانەی کە دەیسەلمێنن کورد کۆنترین نەتەوەی ناوچەکەیە و خاك و زمان و کەلتوور و کەلەپوری خۆی هەیە. لە بەرانبەر شاڵاوێکی وادا جگە لە بەرهەمی نووسراو و گوتاری مێژوونووسان، چاکترین شایەتی ڕاستگۆی هەر نەتەوە و گەلێك ئەو کەلەپور و شوێنەوار و بەرهەمە جۆراوجۆرانەیە کە کەلەپور و فۆلکلۆری ئەو نەتەوەیە پێکدەهێنن.

## باسی پێنجەم

## چەند پێشنیازێك سەبارەت بە برەوپێدانی جلوبەرگی کوردیی

بە مەبەستی کاراکردنی ئەو فاکتەرانەی کە ناسنامەی نەتەوایەتییمان دەپارێزن، پێم باشبوو ئەم پێشنیازانە ئاراستەبکەم:

١. هەوڵدان بۆ پارستنی جۆرەکانی جلوبەرگی کوردیی و ئاشناکردنی نەوەی ئێستا و داهاتوو پێیان. جا چ لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە بێت، یان لە ڕێگەی مۆزەخانە میللییەکانەوە بێت.

٢. پۆشینی جلوبەرگی کوردیی بۆ کارمەند و ئەندامانی ئەو دەزگا باڵایانەی کە گوزارشت لە خواستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان دەکەن. وەك: (پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران، بە تایبەتیی لە کاتی پێشوازییکردن لە میوانانی بیانیی و دەرەوەی هەرێم و هەروەها لە بۆنەنیشتیمانیی و نەتەوەییەکاندا).

٣. ڕێزگرتن لە جلوبەرگی نەتەوەیی و میللیی هەموو نەتەوەکانی تری کوردستان. وەك بەرجەستەکردنێك بۆ گیانی پێکەوەژیان و پێکەوە جوانیی هەموو ڕەنگ و دەنگەکان، کە ویستێکی خودای گەورەیە[٢٢٥].



٢٢٥- ئیسلام و پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییمان.

# بەشی شەشەم
# ئازایی و جوامێریی کورد، لە ئاماژەی ئایەتێکی قورئان و فەرموودەیەکی حەزرەتدا (درووودی خوای لەسەربێت)

بەشی شەشەم لە ئەم (دوو) باسە پێکهاتووە:

**باسی یەکەم/ ئازایی و جوامێریی کورد، لە ئاماژەی ئایەتێکی قورئاندا.**

**باسی دووهەم/ ڕوبەڕوو وەستانەوەی کورد لە بەرانبەر (دەجال)دا، لە ئاماژەی فەرموودەیەکی حەزرەتدا.**

## باسی یەکەم

## ئازایی و جوامێریی کورد، لە ئاماژەی ئایەتێکی قورئاندا

هەرچەندە باسەکانی ئەم تەوەرەمان حەقیقەتێکی چەسپاوی (قەتعی) دوور لە گومان نییە و مەبەست و ناوەرۆکی ئایەتەکە بۆچوونی جیاوازی ئەهلی تەفسیری لەسەرە.

بەڵام بەگونجاومان زانی ئاماژەی پێبدەین؛ چونکە بەشێك لە موفەسیرانی قورئانی پیرۆز لە ڕاڤەکردنی ئایەتەکەدا مەبەستی دەبەنەوە سەر نەتەوەی کورد و ئاماژەکانیش لە ئەو بارەیەوە هەتا ڕادەیەکی بەهێز بەجێ و واقیعیی و دڵخۆشکەرن. وەك دواتر دەیخەینەبەرچاو.

خودای گەورە لە سورەتی (الفتح) ئایەتی (١٦) دەفەرموێت: ﴿قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾. واتە: ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بڵێ بە ئەو عەرەبە ترسنۆکە دەشتەکییانەی کە دواکەوتوون لە غەزای (حودەیبیە)، لە ئایندەدا بانگدەکرێن بۆ جەنگکردن لەگەڵ هۆزێکی ئازا و جەنگاوەر. جا ئەو کات یان دژیان دەوەستن و لەگەڵیان دەجەنگن، یان خۆیان بەبێ جەنگ مسوڵمان دەبن.

سەبارەت بە ئەو هۆزە خاوەن هێز و بازووە، هەریەکە لە هاوەڵی بەڕێز (ئەبوهورەیرە) و گەورەزانای چینی تابیعین (موجاهید) دەفەرموون: مەبەست نەتەوەی کوردە. «عن أبي هريرة قال: يعني الأكراد»[٣٢٦]. «وأخرج ابن المنذر، والطبراني في الكبير عن مجاهد قال: أعراب فارس وأكراد العجم»[٣٢٧].

---

٣٢٦. بڕوانە هەرکام لە ئەم تەفسیرانە:

سەبارەت بە بۆچوونەکەشیان –ئیبن عومەر و موجاهید)– کە دەفەرموون: «أعراب فارس وأكراد العجم» هەر مەبەست نەتەوەی کوردە. هەروەك (سیوتی)[328] و، (تەبەری)[329] و، (ئیبن کەسیر)[330] و، (زەمەخشەری)[331] و، (ئالوسی)[332] و، زۆریکی تر لە زانایان ڕوونیانکردووەتەوە.

لەبەرئەوە سەرئەنجام هەریەکە لە پێشەوایان و پسپۆڕانی بواری تەفسیر، (تەبەری)[333] و، (ئیبن کەسیر)[334] و، (زوجاج)[335] و، (ئیبن عەتیە)[336] و،

---

* فتحُ البيان في مقاصد القرآن، أبو الطيب محمد صديق خان بن حسن بن علي ابن لطف الله الحسيني البخاري القنُّوجي: ١٣/ ١٠٣.
* فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير، محمد بن علي بن محمد الشوكاني: ٦/ ٩٤.
* تفسير القرآن العظيم، لابن كثير: ٧/ ٣٣٩.
* تفسير ابن أبي حاتم، ابن أبي حاتم الرازي: ٢/ ١٦٢.
* الدر المنثور، عبد الرحمن بن الكمال جلال الدين السيوطي: ٧/ ٥١٩.
* تفسير الألوسي: ١٩/ ٢٠٢.
* أخبار أصبهان، أبو نعيم الأصبهاني: ١/ ٢٥.
* فتح البيان في مقاصد القرآن، القنوجي البخاري: ١٣/ ١٠٣.

٣٢٧ـ تفسير الألوسي: ١٩/ ٢٠٢.

٣٢٨ـ كە لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت: ((رجل من أعراب فارس يعني الأكراد)). الدر المنثور: ٥/ ٦٣٨.

٣٢٩ـ تأريخ الطبري: ١/ ١٦٨.

٣٣٠ـ كە دەفەرمووێت: ((من أعراب فارس من الأكراد)). تفسير ابن كثير: ٥/ ٥٣١.

٣٣١ـ كە دەفەرمووێت: ((وعن ابن عمر رضي الله عنهما: رجل من أعراب العجم يريد الأكراد)). تفسير الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل: ٣/ ١٢٦.

٣٣٢ـ كە دەفەرمووێت: ((رجل من أعراب فارس يعني الأكراد)). تفسير الألوسي: ١٢/ ٤٢٥.

٣٣٣ـ جامع البيان في تأويل القرآن، للطبري: ٢٢/ ٢٢١. كە دەفەرمویت: ((يقول تعالى ذِكرُه للمخلَّفين من الأعراب تقاتلون هؤلاء الذين تُدعون إلى قتالهم، أو يسلمون من غير حرب ولا قتال)).

٣٣٤ـ تفسير القرآن العظيم، لابن كثير: ٥/ ٤٧٩. كە دەفەرمویت: ((أو يسلمون فيدخلون في دينكم بلا قتال بل باختيار)).

ژمارەیەکی تر، وایان لێکداوەتەوە ئەو هۆزەی لە ئایەتەکەدا باسی هاتووە، بەبێ شەڕ و بەبێ ڕووبەڕووبوونەوە مسوڵمان دەبن.

جا هەرچەندە ئەو هۆزەی لە ئایەتەکەدا باسکراوە مشتومڕی زانایانی ئەهلی تەفسیری لەسەرە، ئایا کام هۆزەی مەبەستە؟ بەڵام ڕاستترین تەفسیر بۆی ئەوەیە بڵێین: ئەو هۆزە ئەوانەن کە خاوەن هێز و بازوون، هەروەك ئیمامی (بەغەوی) دەفەرمووێت: ((ولا قول فيه أصح من أن يقال كما قال الله جل ثناؤه: إنهم سيدعون إلى قوم أولي بأس شديد))[٢٢٧]. بە ئەم پێیەش ڕووندەبێتەوە مەبەست لە ئەو هۆزە نەتەوەی کوردە.

((چونکە ئازایەتیی دیارترین سیفەتێکە کە لە مێژوودا درابێتە پاڵ کورد، هەروەك سەرچاوەکان ئاماژە بە ئەوە دەدەن وشەی کورد لە بنەڕەتدا وشەیەکی هندۆئەورووپییە و بە واتای پاڵەوان، یان جەنگاوەر دێت. هەندێکی تر وشەی کورد بە واتای ئازا و بەجەرگ، یان شەڕانیی و کۆڵنەدەر واتا دەکەن و ئەسڵی وشەکەش بە فارسیی دەزانن))[٢٢٨].

هەروەها مێژوونووسی میصری (یەحیا خەشاب) لە پێشەکیی (شەرەفنامە)دا بۆچوونی (میر شەرەفخانی) خستووەتە ڕوو، کە پێی وایە، وشەی (کورد) واتە: (ئازا)[٢٢٩]. ئەم لێکدانەوەیەش تەبا و کۆکە لەگەڵ وەصفی ئەو هۆزەی لە ئایەتەکەدا هاتووە.

---

٢٢٥ـ تفسير القرطبي: ١٦/ ٢٧٣. کە دەفەرموێت: ((أو هم يسلمون من غير قتال)).

٢٢٦ـ المحرر الوجيز، أبو محمد عبدالحق بن غالب بن عبدالرحمن ابن تمام بن عطية المحاربي: ٦/ ١٥٣. کە دەفەرمووێت: ((أو هم يُسلمون دون حرب)).

٢٢٧ـ معالم التنزيل، البغوي: ٧/ ٣٠٣.

٢٢٨ـ کورد و چیا، محمد بەکر: ١٩٨.

٢٢٩ـ شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی: هەشتاوهەشت.

به هەمان شێوە (ئیحسان نوری پاشا)یش، دەڵێت: مسوڵمانەکان کوردیان ناوناوە بە (کورد)، کە بە واتای (ئازا و پاڵەوان) دێت. وەك دەڵێت: (مسوڵمانەکان ناوی کوردیان بە "گورد"، واتە: پاڵەوان بانگکردوون و لێرەوە ناوی کورد بڵاوبووەتەوە، کە پێشتر پێیانگوتراوە: (کۆسی و مادی)[240]. شاعیری مەزنی گەلەکەشمان (حاجی قادری کۆیی) لە شیعرێکدا دەڵێت: (گوردی شانامە سەر پاکی کوردە). واتە: هەرچی وشەی (گورد) لە ناو کتێبی (شانامەی فیردەوسی)دا هاتووە، مەبەست لێی کوردە. وشەی گوردیش واتە: ئازا.

لە لایەکی ترەوە، کورد هەمیشە بە نەبەردیی و بوێریی و دلێریی ناسراوە. هەروەك (ئالوسی) فەرموویەتی: ((وبالجملة الأكراد مشهور بالبأس))[241]. واتە: بە شێوەیەکی گشتیی کورد بە ئازایەتیی بەناوبانگە.

هەروەها یەکێك لە شاعیران بە ناوی (ئیبن تاهیر) لە ستاییشی پاڵەوانیی و ئازایی و هەڵمەتبردنی (باز)دا دەڵێت: هێندە ئازایە دەڵێی کورد گرتوویەتی. وەك دەڵێ:

ولیس للطُرّاد إلاّ فَهْــدُ
كأنّما ألقتْ علــيه الكُردُ
مِن خُلْقِـها، أو وَلَدتْه الأُسْدُ
وهْوَ كفيلُ النُجْحِ حينَ يَغْدو[242].

---

٢٤٠- مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد: ئیحسان نوری پاشا، و: حەمەکەریم عارف: ٦٤.

٢٤١- تفسير الآلوسي: ١٩/ ٣٥٩.

ئەوەی جێگەی داخە لە کتێبخانە ئەلکترۆنییەکاندا ئەم دەقەیان گۆڕیوە و، (بأس)یان کردووە بە (يأس)، جا ئەمە بە مەبەست بێت، یان هەڵە خودا زاناترە.

٢٤٢- التذكرة الحمدونية، ابن حمدون: ٥/ ٧٤.

له كوردەواریی خۆشماندا قسەیەك باوە: (تورك بۆ ڕەنگ، فارس بۆ دەنگ، كورد بۆ جەنگ).

هەر شیاوی ئەم شوێنەیە، ئەم وتەیەی (مەلای گەورەی كۆیە) بخەینە پێشچاو، كە دەفەرمووێت: ((نەقلّ لە "ئەبو هورەیرە": قەومی نەجیبی كوردە، حەقیقەتەن قەومی "ئولی بەئس"، بە غیرەت و نامووس و شەجاعەت و وەفا، جەنگاوەر و بێ حیله و بێ دەسیسە، مەردی مەیدانی مەحشەرە، زۆر مەمنون و تەشەكوری جەنابی حەق ئەكەین، كە "جیزیە"ی لە كوردان قبولّ نەكردیە، وەكی عەرەب، ئەبێ مسلّمان بن، عولەما و پیاوی گەورەیان بێ حەد و حیسابە، ئەگەر لە ریجالی مولك و حوكمداری غەیری "صەلاحەدین"، وە لە ریجالی عیلم غەیری "ئیبن صەلاح"یان نەبا، كافی بوو بۆ ئیفتیخاری كوردان، لە دیانەت هیچ قەوم ناگاتە كوردان. تا ئەمڕۆ یەكێ بە ناوی ریسالەت و ریئاسەتی دین، خیلاف و شیقاقی نەهاویشتیتە بەینی بەشەر. عەلەلئەكسەر "شافیعیولمەزهەب"، "ئەشعەریولعەقیدە"، رەسولیان عەرەبی، ئیمامی ئوصول و فروعیان عەرەبی، شێخ و ئیمامی تەریقیان تا ئەم ئەواخیرە تەنها قوتبولئەقتاب "ئەلسەیید موحی دین عەبولقادر ئەلگەیلانی" ئەلغەوسولئەعزەم، ئەلحەسەنی، ئەلعەلەوی، ئەلهاشمی، ئەلعەرەبی، "ئەبو بەكری هەوای" بووە))[٢٤٣].

كەواتە ڕوونبوویەوە مەبەست بە ئەو نەتەوە خاوەن هێز و بازووە میللەتی كوردە، كە بەبێ شەڕ و بەرگریی مسولّمان بوون و بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە چوون. ئەم باس و خواسە لە بەشی دواتردا زیاتر ڕوونیدەكەینەوە.

---

٢٤٣ ـ تەفسیری كوردی لە كەلامی خوداوەندی: ٣/ ٦٠٠.

## باسی دووەم

## ڕوبەڕوو وەستانەوەی کورد لە بەرانبەر ( دەجال )ـدا، لە ئاماژەی فەرموودەیەکی حەزرەتدا ( دروودی خوای لەسەربێت )

وەك چۆن لە ڕابردوودا کورد شەرەفی ڕزگارکردنی یەکەم ڕووگەی مسوڵمانان (قودس)ی پیرۆزی دەستەبەرکرد و لەژێر چنگی (جووەکان)ی دەرهێنا، پشتیوان بە خودا لە داهاتووشدا شەرەفی ڕووبەڕووبوونەوە و لەناوبردنی (دەجال)ی پێدەبەخشرێت. هەر ئێمەی کوردین لە ئەو گۆڕەپانەدا دێینە مەیدان و مسوڵمانانی جیهان لە ئەو مەینەتیی و ناهەمواریيەی (دەجال) و داروودەستەکەی ڕزگاردەکەین.

لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیەی کە (ئەبوهورەیرە) لە پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، «أنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ. قَالُوا نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوَهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَاقَ فَإِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلاَحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ، قَالُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا. قَالَ ثَوْرٌ لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: الَّذِي فِي الْبَحْرِ ثُمَّ يَقُولُوا الثَّانِيَةَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الآخَرُ ثُمَّ يَقُولُوا الثَّالِثَةَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيُفَرَّجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُوهَا فَيَغْنَمُوا فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْمَغَانِمَ إِذْ جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ فَقَالَ: إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَرَجَ، فَيَتْرُكُونَ كُلَّ شَيْءٍ وَيَرْجِعُونَ»[٢٤٤].

واتە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) فەرمووی: ئایا ئەو شارەتان بیستووە کە لایەکی لە وشکاییدایە و لایەکی لە دەریایە؟ گوتیان: بەڵێ، ئەی

---

٢٤٤ـ رواه مسلم، برقم: ٧٥١٧.

پێغەمبەری خودا. فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت هەتا (حەفتا هەزار) کەس لە (بەنی ئیسحاق) ئەو شارە غەزا نەکەن. جا کە دەگەنە ئەوێ، بار و بنەی خۆیانی لێ دادەخەن و لە نزیکی شارەکە نیشتەجێدەبن. ئیتر نە بە چەك شەڕدەکەن و نە تیر دەهاوێژن. بەڵکوو دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ). جا بە فەرمانی خودا و بە بەرەکەتی ئەم وشە پیرۆزە، لەسەر دەستی ئەو پاڵەوان و دلێرانە خۆیان بەدەستەوەدەدەن. جا دووبارە دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ)، ئیتر ئەو لاکەی تریشی تەسلیمدەبن و خۆیان بەدەستەوەدەدەن. ئەوجا سێبارە دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ). ئیتر دەرووی تەواویان بۆ دەکرێتەوە و دەڕژێنە ناو شارەکەوە. دواتر دەست بە کۆکردنەوەی غەنیمەت دەکەن. لە ئەو کاتەی ئەوان سەرقاڵی کۆکردنەوەی غەنیمە و سامانن، کەسێك هاواردەکات، بۆ لایان دێت و دەڵێت: ئەوا دەجال هەستایەوە، ئەوانیش هەموو شتێك بەجێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە.

لێرەدا مەبەست لە (بەنوئیسحاق) کوردانی ڕۆژئاوان، هەروەك زانای ڕاڤەکار (مەزهەر) دەفەرمووێت: ((قال المظهر: من أكراد الشام، هم من بني إسحاق النبي عليه الصلاة والسلام وهم مسلمون))[٢٤٥]. واتە: ئەوانەی ڕووبەڕووی دەوەستنەوە کوردە مسوڵمانەکانی (شام)ن –کە کوردانی ڕۆژئاوای ئێستا دەکات – و لە نەوەی حەزرەتی ئیسحاق)ن. درود و سەلامی خودای لەسەربێت.

هەروەها زانای ناوداری سەردەم و شێخی پێشووتری (ئەزهەر)، (مەنصور عەلی ناصیف) جەخت لەسەر هەمان ڕاڤە دەکاتەوە و دەڵێت: مەبەست لە ئەو نەوەیە کوردە مسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی (سوریا)ن. ((من أكراد الشام المسلمين))[٢٤٦].

---

٢٤٥. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، الملا علی القاري: ١٥/ ٤١٠.

٢٤٦. غاية المأمول شرح التاج الجامع للأصول، الشيخ منصور علي الناصف: ٥/ ٣٢٩.

زانای گەورەی کورد، مامۆستا (نوری فارس)یش -خودا بیپارێت- دەفەرمووێت: ((ئەم حەدیسە پیرۆزە کە ئیمامی موسلیم لە صەحیحی موسلیمدا ڕیوایەتی کردووە -ڕەزای خودای لێبێت-، موژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ هەموو کوردێك، بەهرەیەکی گەلێك گەورەیە بۆ گەلی کورد! چونکە مزگێنیی ئەوەی تیایە کە لە سایەی خوداوە گەلی کورد هەتا نزیکەی قیامەت بە سەربەرزیی و دلێریی دەمێنن و لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوامدەبن. بەشداریی زۆر باش لە جەنگە هەرە گەورەکانی ئیسلامدا دەکەن، تەنانەت لە ئاخر زەمانیشدا ئەوەندە مسوڵمانێکی پاك و جەنگکەرێکی چاك و هۆزێکی ئازا و دلێرن. سوپای مەزنی وایان هەیە، کە گەورەشارێکی وەك -قوستەنتینیە، کە ئێستا پێیدەڵێن ئیستەنبوول- بە نەڕەی شێرانەیان، بە نەعرەتەی پڕ لە سام و شکۆیان، کە دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ)، زەندەقی دەچێت و خۆی بەدەستەوەدەدات.

ئەوەی کە ئێستا لەبەرچاوە ئەمەیە: سەردەمدارەکانی ئەم چەرخە، جەجاڵەکانی زەمانە، فیرعەونەکانی سەدەی بیستەم، هەوڵێکی شەیتانانە دەدەن بۆ قەڵاچۆکردنی کوردان و بۆ تاڵانکردنی سەر وماڵیان، بەڵام بێگومان لە ئەم تەقەلا پیسەیاندا ژێردەکەون و سەرناکەون. بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایش ئەم حەدیسەیە و گەلێك ئیشارات و ئاسار و ئەخباری ترە))[٢١٧].

---

٢١٧- التاج الجامع للأصول، وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان: ٥/ ٥٨٠.

## دەستپێك

### ڕوونكردنەوەی مەبەستی فەرموودەیەكی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت )

لە كات و بۆنەی جیاوازدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) ئاماژەی بە نەتەوەی كورد كردووە، ئەگەرچی ڕاستەوخۆ و ڕاشكاوانە ناویشی نەهێنابێت، ئەوا كۆمەڵێك ناونیشانی فەرمووە، كە كورد دەگرێتەوە. وەك دواتر یاوەران و زانایانی ڕاڤەكار مەبەستەكەیان ڕوونكردووەتەوە.

یەكێك لە ئەو فەرموودانەی بە ئاماژە دەربارەی كورد دوواوە، ئەو فەرموودە شیرینەی (ئەبوهورەیرە)یە، كە لە خۆشەویستی (دروودی خوای لەسەربێت) گێڕاوەتەوە. «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمْ الشَّعَرُ»[248]. لە ڕیوایەتێكی تری فەرموودەكەدا هاتووە: «بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نِعَالُهُمْ الشَّعَرُ، وَهُوَ هَذَا الْبَارِزُ»[249].

واتە: ئەی یاران، قیامەت نایەت، هەتا لەگەڵ نەتەوەیەكدا دەجەنگن، پێڵاوەكانیان لە (موو) دروستكراوە.

مەبەست بە پێڵاوی لە (موو) دروستكراو، (كڵاش)ە -خوداش زاناترە-، كە پێڵاوی ڕەسەنی كوردییە؛ چونكە ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین، هیچ گەلێكی ناوچەكە نییە هاوشێوەی ئەو جۆرە كڵاشەی ئێمەیان هەبێت و لە موو پێڵاو بەرهەمبهێنن.

بێجگە لە ئەمە، ئاگادارانی بواری فەرموودە بەیانیانكردووە، كە ئەو هۆزە نەتەوەی كوردە؛ چونكە ئەوان (واتە كوردەكان) پێڵاوەكانیان لە (موو) دروستدەكەن.

---

٢٤٨- رواه البخاري، الرقم: ٢٩٢٨. ومسلم، الرقم: ٧٤٩٤.

٢٤٩- رواه البخاري، برقم: ٣٥٩١.

هەروەك هاوەڵی بەڕێز (ئەبو هورەیرە) فەرموویەتی: «وهم هذا البارز: يعني الأكراد»[٣٥٠]. زانای فەرموودەناسیش (قەستەلانی) دەفەرموێت: ((هم أهل فارس أو الأكراد الذين يسكنون في البارز أي الصحراء أو الديالمة))[٣٥١]. هەروەها (عەینی) دەفەرمووێت: ((وقيل: المراد من القوم الأكراد))[٣٥٢].

(ئەبونەعیم)یش دەفەرمووێت: ((قال أبو نعيم في مستخرجه: هم الأكراد))[٣٥٣].

مێژوونووس (ئیبن ئەسیر)یش، گوتوویەتی: ((قيل بَارز نَاحية قريبة من كِرْمان بها جبال، وفي بعض الروايات: هم الأكراد))[٣٥٤].

بەڵام مامۆستا مەلا (ڕەشید بەگی بابان) مەبەستەکە ڕوونتر دەکاتەوە و دەڵێت: ئەو هۆزە نەتەوەی کوردە و بە دیارییکراویش بارزانییەکانن. ((والظاهر أنه برزان الذي بموصل، وهم الأكراد الساكنون هناك. واتە: ئەوانە ئەم بارزانەن کە لە جێی بەرزدا دانیشتوون))[٣٥٥].

بە ئەم پێیەش دەردەکەوێت مەبەست لە ئەو نەتەوەیە میللەتی کوردە و لە ناو کوردیشدا بە تایبەت مەبەستی بارزانییەکانە کە لە نزیك (موصل) نیشتەجێن.

ئەم فەرموودە پیرۆزە بە ئەو واتایە نایەت، کە عەرەب لەسەر حەق بێت و کوردیش لەسەر باتڵ، بەڵکوو هەروەك مامۆستا (نوری فارس) ڕوونکردنەوەی ورد دەدات و دەڵێت: ((موقاتەلە لە بابی "موفاعەلە"یە، بۆ موشارەکەیە، لە مەتنی حەدیسەکەدا: کێ سەردەکەوێت و کێ ژێردەکەوێت، ئەوەی تێدا نییە. مەبەستی

---

٣٥٠ـ فتح الباري: ١/ ٢٩٩. روح المعاني، للآلوسي: ١٩/ ٢٠٢. البداية والنهاية: ٦/٢٥٠.

٣٥١ـ إرشاد الساري شرح صحيح البخاري، للقسطلاني: ٤٩/٦. شرح حديث الرقم: ٣٥٩١.

٣٥٢ـ عمدة القاري شرح صحيح البخاري، بدر الدين العيني الحنفي: ٢٤/ ١٩٤.

٣٥٣ـ فتح الباري: ١/ ٨٧.

٣٥٤ـ النهاية في غريب الحديث والأثر، أبو السعادات المبارك بن محمد الجزري: ٣١٦/١.

٣٥٥ـ إقتران النيرين فى مجمع الحرين، مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان: ٣/ ٩٨.

سەرەکیی فەرموودەکە ئەوەیە: شەڕی کورد و عەرەب -بە تایبەتیی کوردە بەزانییەکان- نیشانەی نزیکبوونەوەی قیامەتە. هەروەها لە مەتنی حەدیسەکەدا ئەوەی تێدا نییە: کە شەڕەکە غەزایە و بۆ خودایە، یان هەرایە و بۆ دنیایە. هونەری گفتوگۆئارایی جاری وا هەیە وا پێویستدەکات: ئەنجامی کار، ئەگەر بە دڵی گوێگر نەبوو خامۆشیی لێبکرێت چاکترە. فتأمل. لە خودا بەزیادبێت ئەم فەرموودانە بەڵگەی ئەوەیشن کە کوردان بەر ئەم فەرموودەیە دەکەون، کە دەفەرمووێت: «لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ»[٣٥٦]. خودا یاربێت ئەوەی پاشقول لە گەلی کوردی مسوڵمان دەدات سەری خۆی لە بەردی ڕەق و تەقی چیای -هەندرێن- دەدات؛ چونکە ئەوەی دەست لە کاری خودا بدات، خۆی زیاندەکات))[٣٥٧].

هەروەها دەڵێت: ((کەوابێت بڕیاری خودا بە کەس هەڵناوەشێت، بەپێی ئەم فەرموودە پیرۆزەیش بڕیاری خودا لەسەر ئەوەیە کە لە ئاخرزەماندا کوردان گەشەدەکەن و لە ڕیزی لەشکرە سەرکەوتووەکانی ئیسلامدا فەتحی گەورەگەورە دەکەن و دروشمی هەرە گەوریان وشەی یەکتاپەرستیی -لا إله إلا الله والله أكبر- ە))[٣٥٨].

## مسوڵمانبوونی کورد لە نێوان جەنگ و ئاشتییدا

---

٣٥٦ـ رواه البخاري، برقم: ٦٨٨١. ومسلم، واللفظ له، برقم: ٥٠٥٩.

٣٥٧ـ التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول، بە وەرگێڕانی: نووری فارس حەمەخان: ٥/ ٥٨١.

٣٥٨ـ التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول، نووری فارس حەمەخان: ٥/ ٥٨٢.

پاش ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەی سەرەوە و ئەو ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (الفتح)، ﴿قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ﴾. کە لە بەشی (شەشەم)دا بە وردیی قسەمان لەسەر کرد و لە خزمەتیدا بووین، چەسپاندمان مەبەستی فەرموودەکەی خودا و فەرمایشتەکەی پێغەمبەر بە ئەو نەتەوەیە، نەتەوەی کوردە. لێرەوە باسێکی تر سەرهەڵدەدات، ئەویش بابەتی مسوڵمانبوونی کوردە، ئایا بە جەنگ بووە، یان بە ئاشتیی؟

کە بە ڕاستیی ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگرێت و شیکاریی و شیتەڵێکی ورد و درشت و بەرفراوانی دەوێت، بەڵام ئێمە لێرەدا کورتەیەکی لەسەر دەدوێین و چەند سەرەداوێکی دەخەینە بەردەست.

سەرەتا دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە ئەم باسە هەتا هەنوکەش مشتومڕی زۆری لەسەرە و تێڕوانین و دیدگای جیاوازی تێدایە. وردبوونەوە و بەدواداچوونی زانستیی و ئەکادیمیانەی دەوێت، کە دووربێت لە هەر لایەنداریی و دەمارگیرییەك.

بەڵام لەبەرئەوەی خەڵکانێك هەتا ڕادەیەك زێدەڕەویی لە ئەم باس و بابەتەدا دەکەن و پەیوەندیی نێوان کورد و ئیسلام و ئاشنابوونیان بەیەکتری بە ئاراستەیەکی تەواو بەرهەڵستکارانە و خوێنڕێژانە دەبینن و دەناسێنن، پێم باشبوو وەك کورتەوەڵامێك لە ئەم تەوەرەدا لە درگای ئەو باس و خواسانە بدەم.

هەرچەندە لە ئەم تەوەرەدا وەك پێویست بابەتییانە و زانستییانە قووڵ دانەچووم، لەبەرئەوەی لە ئەم باسەدا دوو بۆچوونی ناتەبا و دژیەك هەن و توێژینەی زانستییش پێویستی بە هەڵسەنگاندن و شەن و کەوکردنی هەموو بۆچوونە جیاوازەکان هەیە. هەروەك دکتۆر (قادر محەمەد) دەڵێت: ((لە ئەو چەند ساڵەی دواییدا ئەو قسە و باسانە زۆر دەورووژێندرێت، ئایا کورد بە چ شێوەیەك مسوڵمان بووە؟ یان ئایینی ئیسلام چۆن لە کوردستاندا چەسپاوە؟ دوو بۆچوونی

پەرگیرمان هەیە لە ئەو بوارەدا. یەکێکیان دەڵێت: کورد هەمووی بە ئاشتیی مسوڵمان بووە، خۆیان چوون لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە ئایینەکەیان هێناوە و زۆر بە ئاسانیی ئایینەکەیان قەبوڵکردووە و بوون بە مسوڵمان. بۆچوونێکی ترمان هەیە، یان خوێندنەوەیەکی ترمان هەیە، کە پێی وایە کورد بە زەبری ئاگر و ئاسن و بە هێز پاش سەرکوتکرنێکی زۆر، ئەوکات ئیسلام لە ناویاندا بڵاوبووەتەوە))[٣٥٩].

پاشان دەڵێت: ((لە ڕاستییدا هەردوو بۆچوونەکە تەواو نین لە ڕووی زانستییەوە، لە کاتێکدا تەماشای پرۆسەی هاتنی سوپای مسوڵمانان دەکەین بۆ کوردستان، لە هەندێك ناوچەدا تەبعەن شەڕیش هەبووە، کوشت و کوشتار هەبووە، خەڵك لە یەکتر کوشتن هەبووە، دەستکردنەوە و مقاوەمەتێکی هەتا ڕادەیەك بەرچاو هەبووە. کێ پێمان دەڵێت مقاوەمە هەبووە؟ سەرچاوە ئیسلامییەکان وامان پێدەڵێن، ئەوە لە فتوحاتی ئیسلامی "بلاذري، و طبري" لە "تأريخ الأمم والملوك" و دەیان سەرچاوەی تردا ئەو ئاماژانە هەن، کە سەرچاوە ئەساسییەکانی مێژووی ئیسلامن، قسەیان لە ئەو بوارەدا کردووە. ئەگەر تەماشابکەین دەبێت دوو ئاراستە لە فتوحاتی ئاسلامی جیابکەینەوە، ئەو ئاراستەی لە هەرێمی چیاکان لە جەلەولاوە بۆ سەرێ بۆ نەهاوەند و کرماشان و ناوچە کوردییەکان، ئەو شوێنەی پێیدەگوترێت هەرێمی چیاکان هەتا دەگاتە شارەزوور و قووڵایی هەرێمی چیاکان. لە ئەو ناوچانەوە هەتا ڕادەیەکی زۆر مقاوەمە هەبووە، ئەویش لەبەرئەوەی ئیمپراتۆری ساسانی هێشتا لە گۆڕێ بوو، دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، وەك دەسەڵات مقاوەمەی دەکرد، کوردیش وەك ئەو

---

٣٥٩ـ د. قادر محمد، گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژ: ٦٢، ل: ٢٧.

میللەتانەی کە لە ئەوێ لە بندەستدا بوون. لە ناو سوپایەکەدا حەتمەن دەبێت هەبووبن، بەڵام لە ئاستی میللییەوە هیچ ئاماژەیەکی وا نابینین بۆ ڕەتکردنەوەیەکی دەستەجەمعی، بڵێیت لەسەر ئاستی میللیی ڕەتکردنەوەیەك هەبێت))[٢٦٠].

لە لایەکی ترەوە، زۆر ئاساییە ڕووبەڕووبوونەوە و ململانێ هەبووبێت؛ چونکە هەموو بیر و باوەڕێکی تازە هەرچەندە جوان و چاکیش بێت، سەرەتا نامۆیە و بەلای هەندێکەوە پەسەند نییە، هەتا ئەو ئاستەی خەڵکانێك لەپێناوەدا خۆبەکوشتن و بڕین بدەن.

بۆ ئاسایی بێت پێغەمبەرێکی دەستپاك و ڕاستگۆ و ژیری وەك حەزرەتی (موحەممەد)ی عەرەبی، خودی قورەیشییەکان سەنگەری لێبگرن و دژی ڕابووەستن، لە کاتێکدا هەلومەرج و بارودۆخ، زۆر لەباردابووە بۆ بڕواپێهێنانی، بەڵام ئاسایی نەبێت کوردێك کە ڕەگەز و باوەڕ و زمان و کەلتوور و تەنانەت هەڵکەوتەی جوگرافیی و خاکەکەشی جیاواز بێت، پێمان سەیر بێت سەرەتا ئیسلامیان قبوڵ نەبووبێت و بۆ سووکەشەڕ و بەرهەڵستییەك بیکەن بە هەرا!

لەبەرئەوە ئەگەر سەرەتا بەرهەڵستیی و ململانێیەکیش لە لایەن کوردەوە هەبووبێت، زۆر ئاسایی و سادەیە. گرنگ ئەوەیە دوای ئاشنابوون بە ئیسلام، پابەندییەکی تەواو پەیڕەوکرا و ڕێز لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام نرا.

لێرەدا وەك ئەمانەتێکی زانستیی، ئەم قسانەمان لەبەرئەوە گواستەوە هەتا خوێنەر لە ئەوە ئاگاداربێت، ئەوەی ئێمە لێرەدا دەیڵێین، حەقیقەتێکی ڕەها نییە،

---

٢٦٠. د. قادر محمد، گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژ: ٦٢، ل: ٢٧.

بەڵکوو مەجالی قسەی تری تێدا هەیە. بەڵام بە ئەو ڕادەیەیش نا، کە پێمان وابێت کوردستان لە ئەنجامی کوشتن و بڕیندا مسوڵمان بووە و ئیمانی هێناوە.

لای هەمووان سەلماوە کە گەیشتنی ئایینی ئیسلام بە کوردستان و مسوڵمانبوونی کورد بە شێوەیەکی فەرمیی و دەستەجەمعیی، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٦)ی کۆچیی و سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین (عومەری کوڕی خەتاب). ئەمەش لەسەردەستی هەردوو هاوەڵی بەڕێز (خالیدی کوڕی وەلید) و (عەیازی کوڕی غەنەم).

هەرچەندە لە ناو کورددا کەسانێك هەبوون پێشتر بڕوایانهێناوە و خۆیان گەیاندووەتە پێغەمبەری پێشەوا، بەڵام ئەمانە بە هەوڵی تاکەکەسیی دەژمێردرێن و جیاوازە لە ئەم مسوڵمانبوونە بەرفراوانەی ئێمە مەبەستمانە لێیبدوێین.

لە ڕاستییدا واتا و ناوەڕۆکی فەرموودەکەی پێشوو، پێویستی بە شیکردنەوە و هەڵوێستەلەسەرکردن هەیە؛ چونکە واتاکەی بە ئەو ڕەهاییە نییە، کە بڵێین: کوردەکان ڕووبەڕووی هاوەڵانی پێغەمبەر وەستاونەتەوە و لە دژیان شەڕیان کردووە، بەڵکوو بەرگرییکردنی کوردەکان کارێکی خۆڕسك و هەڵقوڵاوی ناو بیر و قەناعەتی خۆیان نەبووە. هەروەك ئاشکرایە کورد لە ئەو کات و ڕۆژگارەدا ژێردەستەی فارسەکان بووە و ئەوان بە زۆر جەنگیان پێکردوون بەرانبەر بە هاوەڵانی موجاهید و هەموو نەیارەکانی خۆیان، نەك ئەوەی دەگوترێت کوردەکان دژ بە دینی ئیسلام و فتوحاتەکان وەستاونەتەوە.

ئاشکرایە لە ئەم فەرموودەیەدا خۆشەویستمان (درووودی خوای لەسەربێت) ڕووی وتار (خیتاب)ەکەی لە هاوەڵەکان بوو (خودایان لێ ڕازیبێت). جا بە هۆی ئەوەی کوردەکان ژێردەستە و پاشکۆی دەسەڵاتی زلهێزی فارس بوون، بە فەرمانی فارسەکان بەشێك لە کوردەکان ڕووبەڕووی جیهادی هاوەڵان

وەستاونەتەوە و ڕێگرییان لێکردوون. هەر لەبەر ئەمەشە بەشێك لە مێژوونووسان بۆچوونیان وایە کوردستان بە زەبر و جەنگ لە لایەن هاوەڵانەوە ڕزگارکراوە.

هەروەها دەبینین بەشێك لە مێژوونووسان هەر لە بنەڕەتدا کوردیان بە بەشێك لە فارس داناوە، وەك مێژوونووسی عەرەب (یەحیا خەشاب) لە پێشەکیی (شەرەفنامە)دا بۆچوونی نووسەرانی سەبارەت بە کورد نەقڵکردووە، کە گوتوویانە: ((کورد ئێرانین))[٢٦١]. دواتر وتەی (مینۆرسکی) هێناوە کە پێی وایە کورد گەلێکی ئێرانییە و لە وڵاتی (فارس) و (قەوقان) و (تورکیا) و (عێراق)دا نیشتەجێن[٢٦٢].

هەروەها وتەی (ریسك)ی هێناوە، کە توێژینەوەی پسپۆڕانی زۆر خوێندووەتەوە و دەڵێت: ((کورد بووەتە ناو بۆ گەلێکی ڕەگەز ئێرانی دوو تۆوە))[٢٦٣].

وێڕای ئەمانە، لە چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆردا، کورد وەك لقێك لە (فارس) بینراوە و هەژمارکاوە. بۆ نمونە سەرنج لە: (تەفسیری قورتوبی، بەحرولموحیت، سەعالیبی، ئیبن کەسیر، لوباب) و چەندین سەرچاوەی تر بدە، سەبارەت بە کەسایەتییە کوردەکان دەڵێن: ((.. هو رجل من الاكراد من أعراب فارس اي من باديتها))[٢٦٤]. ((..بإشارة رجل من أعراب فارس من الأكراد))[٢٦٥]. ((قال مجاهد: سمعت ابن عمر يقول: إنما أشار بتحريق إبراهيم رجل من الأكراد من فارس))[٢٦٦]. وەك بە ڕوونیی دیارە کوردیان بە بەشێك لە فارس هەژماردووە.

---

٢٦١- شەرەفخانی بەدلیسی: هەشتاو هەشت.

٢٦٢- هەمان سەرچاوە.

٢٦٣- شەرەفنامە: هەشتاو نۆ.

٢٦٤- تفسير القرطبي: ١١/ ٣٠٣. الجواهر الحسان في تفسير القرآن، عبد الرحمن بن محمد بن مخلوف الثعالبي: ٣/ ٥٧. تفسير البحر المحيط، لأبي حيان الأندلسي: ٦/ ٣٠٤.

٢٦٥- تفسير ابن كثير: ٣/ ٣٥١.

٢٦٦- اللباب في علوم الكتاب، أبو حفص عمر بن علي ابن عادل الدمشقي الحنبلي: ١٣/ ٥٣٧.

هەموو ئەم قسانەمان لەبەرئەوە کرد، هەتا بزانین هەندێکجار نەتەوەی کورد، بە تەواوی کەلتوور و فەرهەنگ و زمان مێژوویەوە، بە هی فارس دانراوە، بگرە خاوەندارێتییان بە فارس دراوە. هەر لەبەر ئەمەشە زۆرجار دەبینین، لە بری وشەی (کورد/ کوردی) وشەی (فارس/ فارسی) بەکاردەهێنرێت، ئەمەش گرنگە ئاگاداری بین؛ چونکە زۆرجار مەبەست لە باسکردن و ناوهێنانی (فارس) میللەتی (کورد)ە، یان لانی کەم کوردیش دەگرێتەوە؛ چونکە وەک گوتمان بەشێک لە نووسەران و مێژوونووسان کوردیان بە بەشێك لە فارس هەژمارکردووە.

هەروەك هاوەڵی ڕێزدار (عەبدوڵای کوڕی ئیمامی عومەر) خودایان لێ ڕازیبێت، لە وەڵامی پرسیاری کابرایەکدا سەبارەت بە (ئەعرابی فارس) فەرمووی: ((الأكراد هم أعرابهم))[٢٦٧]. واتە: مەبەست لە فارسی ئەعرابیی، کوردە.

هۆکاری هەژمارکردنی کوردیش وەك بەشێك لە فارس، بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە:

١. گرنگترینیان نەبوونی سەروەریی و کیان و دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی بووە، بە ئەم هۆیەشەوە زمان و کەلتوور و کەلەپور و مێژوومان لە ناو دەوڵەتی فارسدا تواوەتەوە.

٢. بێئاگایی و نەشارەزایی لە ڕەگ و ڕیشەی کورد، کە کورد وەك پێویست نەناسراوە و بە میللەتێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە. پێشەوا (ئالوسی) دەڵێت: ((أعراب فارس وأكراد العجم، وظاهرالعطف أن أكراد العجم ليسوا من أعراب فارس وظاهر إضافة أكراد إلى العجم يشعر بأن من الأكراد ما يقال لهم أكراد العرب، ولا نعرف هذا التقسيم وإنما نعرف جيلا من الناس يقال لهم أكراد

---

٢٦٧. الكامل في التأريخ، لابن الأثير: ١/ ٣٢.

من غير إضافة إلى عرب أو عجم ... قال ابن عبد البر: لعمرك ما الأكراد أبناء فارس ولكنه كرد بن عمرو بن عامر))[٢٦٨]. زانای ناوبراو، ئەوە دەسەلمێنێنت کە کورد نە لقی نەتەوەی عەرەبە، نە هی فارس، بەڵکوو نەتەوەیەکی سەربەخۆ و تایبەتن.

٣. هۆکارێکی تری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، خەڵکانێکی ناحەز و نەیار بە کورد، بە مەبەست ئەم کارەیان کردووە. دکتۆر (قاسملوو) لە ئەو بارەیەوە دەڵێت: ((هەندێکی تر خزمایەتیی نێوان زمانی فارسیی و کوردیی و ئەوە کە هەردوو زمانەکە دەچنەوە سەر لقی زمانە ئێرانییەکان، دەکەنە بەڵگەی ئەوە کە کورد بە فارس دابنێن. بە کورتیی دان بە بوونی کورد وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆدا نانێن و پەرەئەستاندنی مێژوو بەراوەژوور پیشاندەدەن))[٢٦٩].

٤. دەبێت ئەو خاڵەش لەیادنەکەین کە تێکەڵاویی و لێکنزیکیی ئەم دوو نەتەوەیە (کورد) و (فارس) وای کردووە وەك یەك نەتەوە بناسرێن و سەیربکرێن. هەروەك ئاشکرایە ئێمە و فارس لە زۆر شتدا هاوبەش و لەیەکترەوە نزیکین.

بەهەمەحاڵ با لە باسەکەی خۆمان زیاتر دوور نەکەوینەوە، لەبەرئەوە جارێکی تر دیێینەوە سەر باسی چۆنێتیی مسوڵمانبوونی کورد.

لەبەرئەوەی کورد لە ناو هێزی فارسە ساسانییەکاندا هەبوون و لە ناو سوپاشدا پشکیان هەبووە، لەبەر ئەوە بە زۆرداریی جەنگیان پێکراوە و ساسانییەکان وەك قەڵغانێك کوردیان لە دژی ئیسلام و هەر هێزێکی تری نەیاری خۆیان بەکارهێناوە؛ چونکە کورد جوگرافیای کەوتووەتە نێوان سێ نەتەوەی گەورە و زلەوە، هەرسێکی شەڕیان بووە و شەڕەکەشیان لە خاکی کوردستاندا کردووە. ڕۆم و عەرەب فارس،

---

٢٦٨ـ تفسير الآلوسي: ١٩/ ٢٠٣.

٢٦٩ـ کوردستان و کورد، د. عەبدولرەحمان قاسملوو: ٣٧.

صەفەوی و عوسمانی، فارس و عەرەب، ئێران و عێراق، هەموویان لە خاکی کوردستاندا بەگژ یەکدا چوون و ئاگر و تیر و ترێشقەیان بۆ کورد جێهێشتووە.

ئەگەرنا لە ناو مێژوودا ڕەتکردنەوە و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دەستەجەمعیی کورد نابینرێت بەرانبەر بە هاوەڵان، یان بەرانبەر بە دینی ئیسلام. ئەگەر هەشبووبێت ئەوە لەژێر هێز و جوڵەی فارسەکاندا بووە، یان لەسەر ئاستی تاکە کەسییدا بووە؛ چونکە کورد لە ئەو کاتەدا هێز و سوپای ڕێکخراو و سەربەخۆی نەبووە.

هەروەك (حەسەن مەحمود حەمەکەریم) دەڵێت: ((کە سوپای ئیسلام تەقە لە دەرگای سنووری هەرێمی چیا "کوردستان" دەدات، ئەوەی کە بە دەم دەرگاوە دێت کورد نییە، هەرچەند کورد لە ماڵەوەیە، بەڵکوو ئەوەی دەرگا دەکاتەوە سوپای فارسە، کە بە زۆر و زۆرداریی و بەبێ پرس و مۆڵەت ماڵی کوردی داگیرکردووە. مێژوو لە نێوان کورد و ئیسلامدا هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تۆمار نەکردووە))[270]. دووبارە دەڵێت: ((لە مێژووی هەموو فتوحاتەکانی گەلانی جیهاندا وێنەیەك نییە شانبدات لە شانی هەڵوێستی کورد لە کاتی پرۆسەی بە ئیسلامبوونیدا، لە مێژووی هیچ میللەتێکی سەر گۆی زەویدا هەڵوێستێکی وەك کورد نابینرێت کە بەرانبەر ئیسلام و سوپاکەی نواندبێتیان، بە عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلامیشەوە))[271].

لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: ((ڕۆمەکان گەنجە کوردەکانیان دەکردە سەرباز و دەیاندان بە کوشت، لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆیاندا سەرانە و باج و خەرجییان دانابوو لەسەر خەڵك و زەویوزار و مەڕوماڵاتی کورد، کرابوو بە کۆیلە، وەك

270- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامییدا، حسن محمود حمەکریم: ١٥.

271- هەمان سەرچاوە: ٣٩.

کاڵایەك بازرگانیی پێوەدەکرا. شەڕیان پێ گەرمدەکردن، یەك هەزار ساڵە ئەوە حاڵی کوردە. فارس و ڕۆم لە شەڕی هەزارساڵەی خۆیاندا دەیانهاڕین))[٢٧٢].

(د. قادر محمد)یش دەڵێت: ((هیچ ئامارەیەکمان نییە بە بوونی ناڕەزاییەکی میللیی "شەعبی" لەسەر ئاستی خەڵك کە بیسەلمێنێت و بڵێت: من بە دینەکەی -واتە دینەکەی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێت- ڕازی نیم، بەڵام هەرچی ئامارەکانی ترە، ئامارەی شەڕی مەیدانییە، شەڕی مەیدانیی کێ دەیکات؟ دەوڵەتان دەیکەن، کاتێك عێراق شەڕی لەگەڵ ئێران دەکرد خۆ بە ئەو واتایە نەبوو ئێمە شەڕمان لەگەڵ ئێران هەیە، بەڵام سوپایەکە شەڕی بوو کوردیشی تێدابوو، ئەمە لە حاڵێکدا پێمان خۆش نەبوو، شەڕەکەمان بە گشتیی پێ باش نەبوو))[٢٧٣].

پاشان (د. قادر) لە ئەنجامی بەراودرکردنی نێوان ئەو دوو بۆچوونەی کە لە سەرەتادا ئامارەمان پێدا. دەڵێت: ((ئەگەر تەماشای نەخشەی گشتیی بڵاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکەین لە کوردستاندا، دەکرێت بڵێین هێندەی بە ئاشتەوایی و سوڵح بەرەبەرە جێگیربووە، هێندە بە توندوتیژیی جێگیر نەبووە))[٢٧٤].

کەواتە کورد کە شەڕی کردووە لە بەرانبەر هێزی ئیسلامدا شەڕەکەی بەسەردا سەپێنراوە لە لایەن هێزی ساسانی فارسەوە. ئەگینا دوای ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام، دەبینین کورد چۆن بووەتە قەڵغان و پارێزەری ئیسلام و شەریعەت، لە بەرانبەریشدا ئیسلام چۆن بووەتە خێر و ڕەحمەت بۆ میللەتی کورد. بۆ ئەم مەبەستەش دەچینە خزمەت ئەم بۆچوونانەی خوارەوە:

---

٢٧١ ـ کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامییدا: ٧٨.

٢٧٢ـ د. قادر محمد، گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژ: ٦٢، ل: ٢٩.

٢٧٤ـ د. قادر محمد، گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژ: ٦٢، ل: ٢٨.

مامۆستا (محەمەد ئەمین زەکی) دەڵێت: ((لە زەوری ئیسلامەتییدا و هەر لە ئەوەڵ تەماسیان لەگەڵ ئیسلامەکاندا تێفکرین و دییان کە ئەم دینە تازەیە بە تەواوی موافقی تەبع و ویژدانیانە، لەبەر ئەمە وەك "سێرمارك سایكس" دەڵێت: بە ئاسانیی و بەرەبەرە وەریانگرت بە پلەیەك کە مەگەر بەربەرەکانی "ئەفریقا" و تورکەکانی "تورکستان" بە ئەو جۆرە بە دڵ و شەوق وەریانگرتبێت))[275].

مامۆستا (مەسعود محەمەد)یش دەڵێت: ((کورد خۆشحاڵبووە بە هاتنی ئیسلام، هەتا فارس و ڕۆمیان لەکۆڵبکاتەوە))[276].

مەلا (جەمیل ڕۆژبەیانی)ش دەڵێت: ((وا دیارە کوردەکان کە لە ستەمی ساسانی بە تەنگهاتبوون، ئەوان بوون بە ڕێنوومانی سوپای ئیسلام و شەڕیان بۆ "شاهەنشا" نەکردووە و هەموو شارەکانیان هەر بەبێ شەڕ و بە ئاشتیی داوەتە دەستەوە))[277].

(د. قادر)یش دەڵێت: ((لەگەڵ چەسپاندنی دەسەڵاتی مسوڵمانان ئیتر ناوی کورد وەك میللەتێك دێتە ناو ناوانەوە، باسدەکرێت و دەرگای فراوانی مێژوویان بە ڕوودا دەکرێتەوە وەك میللەت، دواتر وەك دەسەڵاتی سیاسیی و بەشێك لە ئەو کەلتووری فراوانە و ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە ئەو ناوچانە دەبنە پێکهێنەرێکی گرینگ لە شارستانیەتیی ئیسلامی لە هەموو بوارەکاندا))[278]. هەروەها دەڵێت: ((لە پاش ئاشنابوونی کورد بە ئیسلام ئیتر ئەو دەرگایە فروانە بە ڕووی کورددا دەکرێتەوە کە خۆی بسەلمێنێت و خۆی بناسێت و ناوی

---

٢٧٥ـ خولاصەی تەئریخی کورد و کوردستان، محمد ئەمین زەکی: ٩٠.

٢٧٦ـ وەرگیراو لە/ کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا: ٤٠.

٢٧٧ـ مێژووی حەسنەوەیهی وعەیاری، جەمیل ڕۆژبەیانی: ١٥٦.

٢٧٨ـ د. قادر محمد، گۆڤاری چرای ڕووناکی، ژ: ٦٢، ل: ٣٠.

بکەوێتە ناو ناوانەوە و ئامازەی پێبکرێت وەك میللەتێکی سەربەخۆ، ئیتر کەلتووری و وڵاتەکەی و جوگرافیایەکەی ببنە بابەت لە ناو کەلتووری ئیسلامییدا))[٢٧٩].

(د. زرار سەدیق)یش هەموو بۆچوونەکانی پێشوو پشتڕاستدەکاتەوە و دەڵێت: ((میللەتی کوردیش بە هەموو چین و توێژەکانیەوە، دەستبەرداری ئایین و بیر و باوەڕی خۆیان بوون و بڕوایان بە ئایینی نوێ هێنا. ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە، کە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستاندا و مسوڵمانبوونی کورد، بە خاڵێکی وەرچەرخانی هەمەلایەن و هەرە مەزن دادەنرێت لە دیرۆکی کورددا و هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتیی و ئایینیی و سیاسیی و ڕۆشنبیریی جڤاکی کوردەوارییدا ڕەنگیدایەوە. دەسەڵات و فەرمانڕەوایی لە فارسە ساسانییەکان و ڕۆمە بیزەنتییەکانەوە بۆ دەستی عەرەبە مسوڵمانەکان گوێزرایەوە. مزگەوت و حوجرەکان جێگەی ئاگرخانە و پەرستگاکانیان گرتەوە، لە ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان و ڕێوڕەسمەکانیدا، لە جیاتی پیر و موغ و قەشە، لە سەرەتا مەلا و فەقێ و درەنگتریش شێخ و صۆفی ڕێبەریی خەڵکیان دەکرد و ڕێگەی ڕاستی خوداناسییان پیشاندەدا))[٢٨٠]. هەروەها دەڵێت: ((بوونی کوردستان بە بەشێك لە جیهانی بەرفروانی ئیسلام، خۆی لە خۆیدا خاڵی وەرچەرخانی هەرە مەزنە لە مێژووی جڤاکی کوردەوارییدا))[٢٨١].

سەرەڕای ئەمانەی ڕابوورد، بێگومان ئەگەر شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویدابایە، ئەوا سەرچاوەکانی مێژوو کات و شوێنەکەیان باس و بەیاندەکرد، بەڵام دیارە شتی لە ئەو جۆرە نەبووە، غەیری جەنگی (جەلەولا) و (شارەزوور)، کە ئەوەش لەژێر

---

٢٧٩- د. قادر محمد، هەمان سەرچاوە: ٣٠ ـ ٣١.

٢٨٠- کورد و کوردستان لەسەردەمی خیلافەتی ئیسلامییدا: ٧٥ ـ ٧٦.

٢٨١- کورد و کوردستان لەسەردەمی خیلافەتی ئیسلامییدا: ٤.

گوشاری فارسەکاندا بووە. ئەمەش وەك پێشتر گوتمان، شتێکی ئاساییە؛ چونکە سروشتی هەموو بیر و باوەڕێکی نوێ وایە، لە لایەن خەڵکانێکەوە بەرهەڵستیی و بەرگریی لێدەکرێت، ئەمەش ناکرێت ببێتە هەڵوێستی فەرمیی میللەتی کورد. وەك چۆن هەڵوێستی بێباوەڕانی عەرەب گشتاندن ناکرێت بەسەر تەواوی قورەیش و عەرەبدا، لە کاتی هاتنی پەیامبەری ئیسلامدا (دروودی خوای لەسەربێت).

بە ئەمەی ڕابوورد بۆمان ڕووندەبێتەوە، کورد میللەتێکی ئاشتییخواز و دڵسۆزی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر و هاوەڵان و مسوڵمانانە و ڕەوشت و ئاکاریان هێندە بەرزە، لە ناو دەقەکانی شەریعەتدا جێگەی بووەتە و جێگەی بایەخی هەموو لایەکیش بووە.

# بەشی هەشتەم
# قورئانی پیرۆز و زمانی کوردیی

لە ئەم بەشەدا ئەم باسانە تاوتوێدەکەین:

**باسی یەکەم/ ڕەسەنایەتیی و ڕەچەڵەکی زمانی کوردیی.**

**باسی دووەم/ هۆکارەکانی برەونەدانی نووسەران و زانایانی کورد بە زمانی دایك.**

**باسی سێیەم/ قورئانی پیرۆز و زمانی کوردیی.**

**باسی چوارەم/ شێوازەکانی عەرەباندنی وشە.**

**باسی پێنجەم/ ئەو وشە کوردییانەی لە قورئاندا هاتوون.**

## باسی یەکەم

## ڕەسەنایەتیی و ڕەچەڵەکی زمانی کوردیی

سەرەتا پێم باشە بە ئەوە دەستپێبکەم و بڵێم: زمانی کوردیی زمانێکی دێریینی ڕەسەن و سەربەخۆیە، بەڵگە مێژوویییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی (تنگ گەلوو)[٢٨٢] کوردێکی زانا و وێژەزان بووە، (٧٠٠) حەوتسەد ساڵ پێش لەدایکبوونی حەزرەتی (عیسا –سەلامی خودای لەسەربێت)، لە باکووری چیاکانی (موسڵ) بە زمانی کوردیی دەربارەی ئایین و ئەستێرەناسیی کتێبی نووسیوە.

دیسان (ئاریاتە)، کە پزیشك و زانایەکی بەناوبانگ بووە، هەر کوردە و (٦٨٨) ساڵ (پ.ز) کتێبی هونەری و پزیشکیی بە ئەلفبێی کوردیی ڕەسەن نووسیوە.

---

٣٨٢- (شەنگول) ناوە ڕاستەقینەکەیەتی.

(حەسەن پیرینا) دەڵێت: زەردەشت دوو کتێبی هەبووە، ناویان (ئاوێستا) و (دین کورد) بووە. ئاڤێستا لەسەر پێستی (دوازدە) هەزار گامێش نووسراوەتەوە.

(ئازەربورد)یش ئەلفبێیەکی داهێنا کە (٤٢) نیشانە بوو، پشتی بەستبوو بە خەتی (پەهلەوی) دێرین و هەموو دەنگەکانی زمانی کوردیی تێدابوو[٢٨٣].

دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین، کە هەندێك سەرچاوە باس لە ئەوە دەکەن کە کۆنترین کتێبی کوردیی دەربارەی ئایین نووسراوە، ئەویش کتێبی (دین کورد)ە و بە زمانی (پەهلەوی) نووسراوە. (ئازەربورد)ی نووسەری کتێبەکە خۆی نووسیویەتی: ((من کە ئازەربوردی کوڕی هەمەدم و پێشەوای –بادینا–م، کتێبی (دین کورد)م لە کاغەزە دڕاوەکان جارێکی تر کۆکردەوە، هەتا بە یارمەتیی خودا هەموویانم نووسیەوە))[٢٨٤].

ئەمەش جێگەی شانازیی ئێمەی کوردی مسوڵمانە؛ چونکە کورد وەك هەموو میللەتانی دنیا، خاوەنی زمانی تایبەتی خۆیەتی و زمان و ئەدەبیاتەکەی جێگە و ڕێگەی خۆی کردووەتەوە لە ناو ئەم جیهانە بەرییەدا.

بەداخەوە زۆرکات کە باس لە زمانی کوردیی دەکرێت، یەکاویەك تۆمەتی ئەوەی دەدرێتەپاڵ، کە لقێکە لە زمانی فارسیی. ئەمەش پێچەوانەی ڕاستییەکانە[٢٨٥].

(مێجەرسۆن)ی گەڕیدە و فەرمانڕەوای ئینگلیز لە شاری سلێمانی لە بەرانبەر ئەوانەی دەڵێن زمانی کوردیی لقێکی زمانی فارسییە، دەڵێت: ((بە پێچەوانەوە

---

٢٨٣- لەپێناوی زمانەکەماندا، عەزیز ئالانی: ٥.

٢٨٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٥.

٢٨٥- بڕوانە/ لە بارەی زمان و زمانی کوردی، ئاری عوسمان خەیات: ٣١ - ٣٢.

ئەوە زمانێکی خاوێنی ئارییە ماوەتەوە، بە شێوەیەك لەسەر چیا خۆڕاگرەکانی کورد پارێزراوە))[٢٨٦].

زمانی کوردیی نە لقێکە لە زمانی فارسیی، نە لە زمانی هیندیی، نە لە زمانی کلدانیی -وەك کەسانێك لە ئەم بۆچوونانەیان هەیە-، ڕاستە لەگەڵ ئەواندا ڕەگەزی زمانەکەی هاوبەشە، بەڵام میانە و جیاوازییەکی گەورە لە نێوانیاندا هەیە، چ لە وشە و چ لە ڕێزماندا، بەڵکوو زمانی کوردیی زمانێکی سەربەخۆی کۆنی خۆیەتی، کە زمانێکی ڕێك و بنەچەدار و تایبەتە. ئەمەش بۆچوونی هەریەکە لە زانایان و زماننناسانی بیانیی: (جەستی، سۆسینە، سیدنی سمیس، ئا. یوت، فردریك میولەر، میجەرسۆن، مینۆرسکی) و ژمارەیەکی ترە[٢٨٧].

هەرچەندە ئەم بابەتە قسەی زیاتر هەڵدەگرێت و بۆچوونی تری لەسەرە، بەڵام زۆرێك لە بۆچوونەکان لەسەر ئەوەن کە زمانێکی سەربەخۆیە و یاسا و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە، نەك لاوەکیی بێت.

بۆچوون و دانپێدانانی ئەم پۆلەزانایانەش جێگەی ئیعتیبار و ڕێز و ستاییشە. هەروەك (مەلای گەورەی کۆیە) ئەم هەڵوێستەی پسپۆڕانی ڕۆژهەڵاتناسی بە هەند زانیوە و لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ((شوکری بەعزێ ئەورووپایی ئەکەین، لیسانی کوردییش بە لیسانێ زیندی راقی حیساب ئەکەن، واقیعەن بە قەواعیدە، لاکین مەوادێ زۆری ضایع بووە))[٢٨٨].

گەلی کورد خاوەنی زمان و نووسین و خوێندنی سەربەخۆی خۆی بووە بە زمانی شیرینی کوردیی، لەبەرئەوە جێگەی خۆیەتی شانازیی بە زمانی ڕەسەنی

---

٢٨٦- کورد و چیا، محمد بەکر: ١٢٧.

٢٨٧- بڕوانە/ لە بارەی زمان و زمانی کوردی: ٣٤ ـ ٣٦.

٢٨٨- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ١١١.

خۆمانەوە بکەین؛ چونکە لە ناو زمانی کوردییدا ئاواز و فۆنەتیکی سەیر هەیە. هەروەك (ئەحمەد بن وحشیەی نبتی) لە کتێبی (شوق المستهام)دا دەڵێت: ((ئەلفبێی کوردیی چەند پیتێکی تێدایە کە لە هیچ زمانێکی تری جیهانیدا نییە، ئەوانەش جگە لە پیتی "چ"، پیتی "پ"، شەش پیتی تریشی تێدایە کە ئاواز و خوێندنەوەیەکی سەیریان هەیە))[٣٨٩].

لێرەدا جێگەی خۆیەتی بپرسین، کاتێك ئەمە مێژوو و حەقیقەتی زمانی کوردیی بێت، ئەی بۆچی وەك پێویست ناسراو و دانپێدانراو نییە و لە ئاست زمانە نێونەتەوەییەکانی دونیادا نییە و بە فەرمیی نەهاتووەتە ئەژمار؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ئەم بەشەی خوارەوەدا دەخوێنیتەوە.

## باسی دووەم

## هۆکارەکانی بەرەونەدانی نووسەران و زانایانی کورد بە زمانی دایك ([٢٩٠])

هۆی چی بووە هەریەك لە گەلانی دراوسێی کورد، وەك فارس و تورك، لەپاڵ زمانی عەرەبیدا گرنگییان بە زمانی خۆیان داوە، بەڵام کورد لای بە لای زمانەکەی خۆیدا نەکردووەتەوە؟ لێرەدا کۆمەڵێك ڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە، هەوڵدەدەین شرۆڤەی هەندێك لە ئەو بۆچوونانە بکەین.

---

٢٨٩ـ لە پێناوی زمانەکەماندا، عەزیز ئالانی: ١١.

٢٩٠ـ ئەم بابەتە بەشێکە لە توێژینەوەیەکی بەڕێز (د. ئاراس حەمەصالح)، مامۆستا لە زانکۆی (سلێمانیی)، بە ناونیشانی: هەوڵەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە بەکوردییکردنی زانستە ئیسلامیەکاندا. کە لەگەڵ چەند توێژینەوەیەکی تردا لە دوو توێی کتێبێکدا بە ناوی (دیداری مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس/ ٢٠١٦). وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان/ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی و هونەریی سلێمانیی، چاپیکردووە.

**بۆچوونی یەکەم/** پێی وایە زمانی کوردیی زمانی نووسین نەبووە وەك زمانی فارسیی، لەبەرئەوە کاتێك ئایینی ئیسلام بڵاوبووەتەوە لە کوردستاندا، کورد بۆ فێربوونی ئایینی نوێ پێویستی بە ئەوە بووە فێری زمانی عەرەبیی ببن؛ چونکە سەرچاوەکانی ئیسلام هەمووی بە زمانی عەرەبییە، دوایی لەژێر هەژموونی زمانی عەرەبییدا زۆر پێویستیان بە زمانی کوردیی نەبووەو گرنگییان پێنەداوە[٢٩١].

**بۆچوونی دووەم/** ڕای وایە لەبەرئەوەی کورد (شافیعیمەزهەب) بووە و ئەم مەزهەبەش زمانی عەرەبیی بە واجب دادەنێت لە بەجێهێنانی هەموو ئەرکە ئایینییەکاندا، وەك نوێژ و وتاری ڕۆژانی هەینی. ئەمەش کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر کورد، کە گرنگیی بە زمانی کوردیی نەدات و هەندێجار وەك شتێکی ڕێگەپێنەدراو سەیریکردووە[٢٩٢].

**بۆچوونی سێیەم/** پێی وایە لەژێر هەژموونی زمانی فارسیی و دواتر لە ڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمانییدا لەژێر هەژموونی تورکییدا کورد بە ئەو زمانانە خوێندویەتی و نووسیویەتی و گرنگیی بە زمانی کوردیی نەداوە[٢٩٣].

زۆرێك لە زانا گەورەکانی کورد دانراویان بە زمانی فارسیی هەیە و هەندێکیان بە تورکییش[٢٩٤]، هەتا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا کەسێکی وەك (کاك

---

٢٩١- زمانی کورد: مەسعود محەمەد، حەکیم کاکە وەیس کردوویەتی بە کوردی: ٢٩.

٢٩٢- بڕوانە/ ناساندنێکی مزگەوتەکانی سلێمانیی و خوێندنگە ئایینییەکانی: محەمەد قزڵجەیی، وەرگێڕانی: د.ئاراس محەمەد صالح: ٢٥.

٢٩٣- بڕوانە/ مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلادین سەجادی: ١٥٤.

٢٩٤- میری شارەزوور (مەئموون بێگە بەگ ٩٨٥ك ١٥٧٥ن) بە تورکی سکالا و یاداشتی خۆی بۆ سوڵتانی عوسمانی (موڕادی سێیەم) نووسیوە، هەروەها مێژوونووسی بەناوبانگی کورد (شەرەفخانی بەدلیسی) لە ساڵی ١٥٩٧-١٥٩٨ز، شەرفنامەی بە فارسی نووسیوە. بڕوانە/ کەمال ڕەئوف محەمەد، عەقیدەی ئیمان- عەقیدەی کوردی لوبیەلەقاید، خالیدی شارەزووری: ٣٧.

ئەحمەدی شێخ) نامەکان (مەکتوبات)ی بە فارسیی نووسیوە و ناردویەتی بۆ مەلاکان لە گوندەکاندا هەتا بۆ خەڵکی ڕوونبکەنەوە[٢٩٥]. ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە مەلای کورد فارسییزانی باش بوون و لە زمانی عەرەبیی زیاتر بەلایانەوە ئاسانبووە.

**بۆچوونێکی تر/** پێی وایە لەبەرئەوەی کورد دەسەڵاتی سیاسیی نەبووە، هەتا هەوڵبدات زمانی نووسین و خوێندن و حوکمڕانیی بکات بە کوردیی و گرنگیی بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بدەن، ئەمە هۆی سەرەکیی بووە کە خوێندەواری کورد بە کوردیی نەیخوێندووە و گرنگیی بە زمانی زگماکیی دایکی خۆی نەداوە[٢٩٦].

هەرچەندە کورد بە درێژایی مێژووی ئیسلامیی دەسەڵاتی میرایەتیی ناوچەیی هەبووە، بەڵام زمانی ڕەسمیی هیچ یەکێك لە ئەو میرایەتییانە کوردیی نەبووە، هەتا سەردەمی میرایەتیی بابان و دەرکەوتنی تەریقەتی (نەقشبەندی) و لاکردنەوەی (مەولانا خالید) و شوێنکەوتووانی بەلای زمانی کوردییدا، لە ناو میرایەتیی بابان لە سەردەمی (سلێمانیی)دا شاعیرانی سێکوچکەی بابان دەردەکەون کە سەر بە تەریقەتی (نەقشبەندی) بوون و زمانی سلێمانیی دەبێتە زمانی ئەدەب و شیعر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ڕەسمیی هەر فارسیی و عەرەبیی بووە، هەتا لە ساڵی ١٩١٨ز، لەسەردەمی حوکمڕانی شێخ (مەحمودی حەفید)دا زمانی کوردیی بووەتە زمانی ڕەسمیی حوکمڕانیی و کارگێڕیی[٢٩٧].

---

٢٩٥- مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ: کاك ئەحمەدی شێخ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە فارسی یەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی: ٦ ـ ٥.

٢٩٦- بڕوانە/ تأريخ الكرد في العهود الإسلامية، د. أحمد محمود الخليل: ٦٩.

٢٩٧- عەقیدەی کوردی، کەمال ڕەئوف محەمەد (بابی لالۆ): ٢٥.

بەلآم هەموو ئەو بۆچوونانە بەشێك لە ڕاستییان تێدایە و هەریەك كاریگەریی هەبووە لەسەر گرنگیینەدانی كورد بە زمانی نەتەوەیی خۆی، ئەگەر فارسەكان خاوەنی كتێبخانە و نووسین بووبن بە زمانی خۆیان و خاوەنی دەسەلآتی سیاسیی بوون لەپێش بلآوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ولآتەكەیاندا بە چەند سەدەیەك، بەلآم كورد ئەوەی نەبووە، ئەگەر تورك خاوەنی دەوڵەتی عوسمانیی بووبێت و پێنج سەدە حوكمڕان بووبن، ئەوا كورد هیچ یەك لە ئەو هەلانەی بۆ هەڵنەكەوتووە، هەرچەند میرایەتیی و دەسەلآتی ناوچەیی هەبووە، بەلآم زمانی ڕەسمیی ئەو میرایەتییانە هەر زمانی عەرەبیی و فارسیی بووە.

بەلآم ئەگەر بە خێرایی چاوێك بە مێژووی گەلاندا بگێڕین، بۆمان دەردەكەوێت، ئەو گەلانەی لە كۆندا بوونەتە خاوەنی شارستانیەت و زمانی نەتەوەیی خۆیان، دوو هۆی سەرەكیی كاریگەریی زۆریان هەبووە لە ئەو بوارەدا. ئەوانیش هەریەك لە دین و دەسەلآتی سیاسیی، دوو هۆی سەرەكیی بوون بۆ گەشەكردنی هەر زمانێك، لەبەرئەوەی كورد هیچ كام لە ئەو دوانەی نەبووە ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساوە گەشە بە زمانەكەی بدات و بیكاتە زمانی نووسین.

هەردوو زمانی (عیبریی) و (عەرەبیی) دوو نمونەی بەرچاوی ئەم بۆچوونەن. گەلێكی دواكەوتووی بیابانشینی وەك عەرەب بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە دەبنە خاوەنی دەوڵەمەندترین زمانی خوێندن و نووسین. هەروەها فارسەكانیش هەر بە هۆی ئایین و ئەو دەسەلآتەی لە ناوچەكەدا بوویانە، بوونەتە خاوەنی دەوڵەمەندترین كتێبخانەی ئەدەب و زمان و فەلسەفە بە زمانی فارسیی.

بەلآم بەكارهێنانی زمانی كوردیی، وەك زمانی نووسین و وتار لە شوێنە گشتیی و فەرمییەكاندا، زۆر دواكەوتووە. ئەوەتا وتاری ڕۆژانی هەینی، هەر بە زمانی عەرەبیی پێشكەشدەكرا، هەتا بۆ یەكەمجار لەسەر داوای خوالێخۆشبوو

(شێخ عەلادینی بیارە)، لە ڕۆژی ٢٦ ڕەجەبی ١٣٥٣ کۆچیی بەرانبەر ١١/٤/ ١٩٣٤ز، شێخ (عەلائەدینی بیارە) نامەیەك بە زمانی فارسیی دەنووسێت بۆ مامۆستا (مەلا عەبدولکەریم)، کە لە ڕۆژانی هەینیدا واتای وتاری هەینی بە زمانی کوردیی بۆ موسڵمانان پێشکەشبکرێت بۆ ئەوەی لە وتارەکان تێبگەن. لە ئەو هەفتەیەوە بۆ یەکەمجار مامۆستا (مەلا عەبدولکەریم) وتاری هەینی بە زمانی کوردیی لە (بیارە)دا خوێندووەتەوە. مامۆستا شەرەفی یەکەم وتاری هەینی بە زمانی کوردیی وەرگرتووە و بیارەی شەریف و جوان و ڕەنگین و مزگەوتە دێرینەکەی مەڵبەندی یەکەم وتاری هەینییە بە زمانی کوردیی[٢٩٨].

هەرچیش پەیوەستە بە نووسین بە زمانی کوردییەوە، ئەوەتا دەبینین یەکەم نووسەرێك دەربارەی مێژووی کورد نووسرابێت بە خامەی خودی کورد، (شەرەفنامە)ی (شەرەفخانە)، کە بە زمانی فارسیی نووسیویەتی و دواتر وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردیی.

لە ڕاستییدا دەبوو زانایانی کورد، سوودی زۆریان لە ئایینی ئیسلام وەربگرتایە لە ناساندن و برەودان و بە زانستییکردنی زمانی کوردیی، بەڵام مەخابن نەکرا، بەڵکوو بگرە هەتا ڕادەیەکیش ئەوان هۆکاربوون بۆ چەقبەستوویی؛ چونکە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، خوێندن و خوێندەواریی تێیدا گەشەیکردووە. سەدان زانای گەورە لە بوارە زانستییە جیاوازەکاندا دەرکەوتوون، دەیان خوێندنگەی زانستیی لە هەموو کوردستاندا ناوبانگیان بە جیهاندا بڵاوبووەتەوە. ئەمەیش بە هۆی گرنگییدانی ئیسلامەوە بووە بە خوێندن و

---

٢٩٨- ڕۆژگاری ژیان یادداشت و بیرەوەرییەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، ئامادەکردن و لەسەرنووسینی، ڕەئوف مەحمودی: ١٨٧. دەقی نامەکەی شێخ عەلادین بە زمانی فارسیی: ٣٤١.

خوێندەواریی و لە هەمان کاتدا میللەتی کوردیش بۆ فێربوونی بنەماکانی ئایینی نوێ ڕوویانکردووەتە خوێندن و پشتگیریی پرۆسەی خوێندەواریی و هاوکاری مزگەوت و حوجرەو زانایان و فەقێ و قوتابییانی زانستە شەرعییەکان[٣٩٩].

بەڵام لەگەڵ گرنگییدانی کورد بە خوێندن و خوێندەواریی و شارەزابوونی لە زمانی عەرەبیی و فارسیی و هەتا ڕادەیەکیش تورکیی، بۆچی خوێندنگەی ئایینیی و مەلای کورد لای بە لای زمان و ئەدەبی کوردییدا نەکردووەتەوە و گرنگییان پێنەداوە؟ خۆ ئەگەر لەگەڵ دەستپێکردنی خوێندنی مزگەوت لە کوردستاندا مەلای کورد لەپاڵ زمانی عەرەبیی و فارسییدا لایەکیشی بە لای زمانی کوردییدا بکردایەتەوە، ئێستا کورد خاوەنی مێژوویەکی زیاتر لە هەزار ساڵی ئەدەبی کوردیی دەبوو. لە هەمان کاتدا خاوەنی هەزاران شاعیر و نووسەر و سەدان لاپەڕە ئەدەبیی نووسراو دەبوو بە زمانی نەتەوەیی خۆی[٤٠٠].

خۆزگە نووسەرە دێرینەکانمان لە وێژەوان و شاعیر و مێژوونووس و تەواوی قەڵەمبەدەستان، (مەحوییئاسا) زوبانی کوردییان بە هەندوەردەگرت و حسابێکی ئەوتۆیان بۆ دەکرد، ئەوکات هەر هیچ نەبێت لە گرفتە زمانەوانییەکانی ئێستامان سەلامەتدەبووین. حەزرەت لە دەقێکی شیعریدا دەفەرمووێت:

کوردی، زوبانی ئەسڵمە گەر تەرکی کەم بە کولل

بۆ فارسی، بە کوللی ئەمن دەبمە بێ وەفا

---

٣٩٩ـ بڕوانە/ مێژوو کورتە باسێکی زانستی مێژوو کورد مێژوو، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: ١٠٠. مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار: ١/ ٨٠ ـ ٨١.

٤٠٠ـ هەتا سەدەی دەیەمی زایینی هیچ نووسراوێك بە زمانی کوردی تۆمار نەکراوە، ئەوەی کە هەیە لە دوای سەدەی دەیەمەوە نووسراوەتەوە. بڕوانە: الأكراد من القرن السابع الى القرن العاشر الميلادي، أرشاك بولاديان: ١٥٣ــ١٥٤. (هەتاك ئێرە سەر بە توێژینەوەکەی بەڕێز د. ئاراس حەمەصالح بوو).

دووری مەبینە تۆ لە کەریمی بەها نەجۆ
هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشێ بە (بُوالوَفا)[401].

بەڵام جێگەی داخە، نەك ئەمە نەکرا، بەڵکوو ئەگەر هەوڵ و بەرهەمێکی کوردیی لە ئارادا بایە، توانج و تەشەری لێدەگیرا. ئەوەتا زانایەکی وەك (ئیبن ئەلحاج)، لە (مەهدینامە)کەیدا، کە (دووسەد) ساڵ بەر لە ئێستا بە زمانی کوردیی نووسیویەتی و دەڵێت:

نەزمم کرد لە قەولی سەحیح
بە لەفزی کوردی و نافەسیح
بۆ مونصیفان (لا للشحیح)
بۆ ئینتیفاقی عالەمی[402].

وەك دیارە زمانی کوردیی بە زمانێکی نافەسیح دادەنێت، کە ئەمە جۆرە پاساوێك بووە بۆ ئەوەی لێی قبوڵبکەن و توانجی تێنەگرن؛ چونکە خۆی دانی پێدا ناوە[403].

بەهەمان چەشن، شاعیری گەورەی گەلەکەمان حەزرەتی (نالیی)، لە بەیتێکدا ئەوەمان دەخاتە پێش چاو، کە خەڵکانێك زمانی کوردیی بە کەمبەها دەبینن و دەڵێت:

---

٤٠١ ـ دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەمەدی مەلا کەریم: ٤٣ ـ ٤٤.

٤٠٢ـ دەفتنامە، محمد عەلی قەرەداغی: ١/ ٩٣. وەرگیراو لە/ زمانی کوردی لە ناو کەلەپوری ئیسلامییدا: د. هێمن عومەر خۆشناو، گۆڤاری خاڵ، ژمارە: ٣، ل: ٥٧.

٤٠٣ـ زمانی کوردی لە ناو کەلەپوری ئیسلامییدا: د. هێمن عومەر خۆشناو، گۆڤاری خاڵ، ژمارە: ٣، ل: ٥٧.

کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆ کردییە

هەرکەسێ نادان نەبێ، خۆی تالبی مەعنا دەکا[٤٠٤].

هەروەها مەلا گەورەی کۆیە، وەبەر ڕەحمەتی خودا بکەوێت، لە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿أَلَا لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ﴾. دان بە تەسکیی و کورتیی زمانی دایکدا دەنێت و دەڵێت: ((چونکی کورد حوکمیان نەبووە لە زوبانی کوردیی، هەرچەند ئەکەم کلیمەیە نادۆزمەوە ئەو مەعنایە بگەیەنێت. تەفسیری قورئانی وا پان و بەریین بە زوبانی کوردیی تەسك و کورت حقّ الإنصاف زۆر گران و زەحمەتە))[٤٠٥].

هەر لە ئەم بارەیەوە، خوالێخۆشبوو (د. موستەفا زەڵمی) دەڵێت: ((ساڵی ١٩٥١ لە سلێمانیی مەلا بووم، کتێبێکی دابەشکردنی میرات، کە پێیدەگوترێت "الفرائض" یان "المواريث"، دامنا و ناردم بۆ هەندێك لە مامۆستاکان، گوتیان: زۆر جوانە و زۆر باشە، بەڵام عەیبی ئەوەیە بە کوردیی داتناوە))[٤٠٦].

تەنانەت هەتا چەند ساڵی ڕابردوویش، لە حوجرەکانی کوردستاندا، ناوی فەقێ و قوتابییان لە کوردییەوە بۆ عەرەبیی دەگۆڕا. (ئازاد) دەکرا بە (عەبدوڵا)، (هیوا) بە (عیرفان)، (ئومێد) بە (موحەمەد)، (ئاوات) دەگۆڕا بە (بەهائودین)، (سیروان) بە (جەمیل)، (گۆران) بە (مەسعود). هەروەها...، ئەمانە و چەندین ناوی جوان و شیرین و واتاداری کوردیی بە عەرەبیی دەکران، کە تاکە عەیبێکی ئەم ناوانە کوردییبوونیان بوو.

---

٤٠٤- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتیح عەبدولکەریم: ١٠٤.

٤٠٥- تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ١/ ٦١٨.

٤٠٦- کاروانی ژیانم، موستەفا ئیبراهیم زەڵمی: ٤٨.

من لێرەدا دەپرسم: ئاخۆ چ گرفت و ناڕەواییەك لە ناوە جوان و واتابەخشەکانی (هیوا، ئاوات، ئومێد، ئازاد)دا هەبوون؟! خۆ بیر لە هەندێك ناوی بیانیی (غەیرە کوردیی) بکەیتەوە شەرم دەتگرێت لە واتاکەی!

هەروەها زۆرێك لە ناوی مزگەوتەکان و تیپە هونەریی و قوتابخانە ئایینییەکانیش، بە ناوی عەرەبییەوە ناودەنران. ئەمەش نە بێئەدەبییکردنە، نە بێڕێزیینواندنە بەرانبەر بە کەس، بەڵکوو ئامانج لە ئەم قەسەیە ناساندن و زیندووهێشتنەوەی پیاوە گەورە و زانا و عاریفەکانی کوردە، کە مێژووی پاك و جوانی کورد، ئەگەر زانایانی ئایینیی و شێخانی تەریقەت و کەسایەتییە ئایینیی و پاشماوە و بەرهەمە زانستیی و مەعریفییەکانیانی لێ دابڕنین، ئەوا شتێکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نامێنێت کە جێگەی باسکردن و قابیلی فەخرکردن بێت.

لە لایەکی ترەوە تێگەیاندنی نەتەوەکانی چواردەورمانە لە ئەوەی ئێمەی کوردیش خاوەنی کەڵەپیاوی مەرد و پایەبڵندین، ئەگەرنا، هاوەڵان و کەڵەزانایانی ئیسلامیی و ناوی شیرینیان لە هەر نەتەوە و ڕەگەزێك هەبن، تاجی سەر و پێشەوا و پێشەنگی ئێمەن و جێگەی شانازییمانن.

بە ئەوانەی ڕابوورد بۆمان دەردەکەوێت، کە شەرمنیی و کەمتەرخەمییەك لە هەنبەر زمانی کوردیی، لە لایەن بەشێك لە زانایانمانەوە کراوە. دیارە ئەمەش بێویژدانییە ئۆباڵی هەموو تاوانەکە بە تەنها بخەینە ئەستۆی ئەوان، بەڵکوو لەگەڵ ئەواندا، بەرپرس و فەرمانبەدەستەکانی ئەو دەمی کورد پشکی شێریان لە ئەو بارەوە بەردەکەوێت؛ چونکە دەسەڵات و سیاسەت پاڵنەر و بزوێنەری سەرەکیی سەرجەم بابەتە نەتەوەییەکانە.

ئێمە دەبینین نەتەوەکانی تر سەبارەت بە زمانی نەتەوەیی خۆیان، زۆر خەمخۆر و لێبڕاوبوون. ئەوەتا تورك بە زمانی خۆیان دەیانگوت: ((زمانی تورکیی لە ناو هەموو زمانەکاندا پیرۆزترینیانە))[٤٠٧].

عەرەبەکانیش هەتا ئاستی قسەهەڵبەستن بە زاری پێغەمبەری خوداوە (دروودی خوای لەسەربێت)، بە شان و باڵی زمانەکەیاندا هەڵدەدا. ئەوەتە بە ناوی پێغەمبەروە گوتویانە: «أحبُّوا العربَ لثلاث: لأني عربي والقرآن عربي وكلام أهل الجنة عربي»[٤٠٨]. واتە: عەرەبتان خۆشبوێت لەبەر سێ هۆکار؛ چونکە من –واتە پێغەمبەر– عەرەبە، قورئان عەرەبییە، قسەکردنی بەهەشتییەکانیش هەر بە عەرەبیە.

یا دەبینی زانایەکی کوردی وەك شێخ (ئیبن تەیمیە)، زانین و گۆکردن بە زمانی عەرەبیی بەبێ هیچ بەڵگەیەك بە بەشێك لە دین هەژماردەکات و بە واجبی دادەنێت و دەڵێت: ((فإن نفس اللغة العربية من الدين ومعرفتها فرض واجب))[٤٠٩]. لە جێگەیەکی تر و لە لاپەڕە (٢٠٤)دا، قسەکردن بە غەیری عەرەبیی بە قەدەغە ئەژمێرێت و دەڵێت: ((وأما الخطاب بها –أي بالعجمية– من غير حاجة في

---

٤٠٧- زمانی کوردی لە ناو کەلەپووری ئیسلامییدا: د. هێمن عومەر خۆشناو، گۆڤاری خاڵ، ژمارە: ٣، لا: ٥٦.

٤٠٨- قال الذهبي فى مختصر المستدرك: أظنه موضوعًا. وقال العقيلي: منكر لا أصل له. وأورده ابن الجوزي في الموضوعات. وأخرجه العقيلي (٣٤٨/٣، ترجمة: ١٣٨٠ العلاء بن عمرو)، وقال: منكر لا أصل له. وأخرجه الطبراني في الأوسط (٣٦٩/٥، رقم ٥٥٨٣). قال الهيثمي (٥٢/١٠): فيه العلاء بن عمرو الحنفي، وهو مجمع على ضعفه. والحاكم (٩٧/٤ ، رقم ٦٩٩٩)، وقال: صحيح وتعقبه الذهبي فقال: أظنه موضوعًا. والبيهقي فى شعب الإيمان (٢٣٠/٢، رقم ١٦١٠). وابن عساكر (١١٥/١٩). وابن الجوزي في الموضوعات (٢٩٢/٢، رقم ٨٥٩). قال ابن أبى حاتم فى العلل (٣٧٥/٢): سمعت أبي يقول: هذا حديث كذب. راجع: جمع الجوامع أو الجامع الكبير، للسيوطي: ١/ ١٠٠٣.

٤٠٩- اقتضاء الصراط المستقيم: ٢٠٧.

أسماء الناس والشهود كالتواريخ ونحو ذلك فهو منهي عنه مع الجهل بالمعنى بلا ريب)).

تەنانەت لە ئەم بارەیەوە هێندە زیادەڕەویی کردووە، هەتا ئەو ئاستەی پاراستنی زمان و کەلتووری عەرەبیی بە میکانیزمی پاراستنی دین ئەژماربکات و بڵێت: ((فَإِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ كِتَابَهُ بِاللِّسَانِ الْعَرَبِيِّ وَبَعَثَ بِهِ نَبِيَّهُ الْعَرَبِيَّ وَجَعَلَ الْأُمَّةَ الْعَرَبِيَّةَ خَيْرَ الْأُمَمِ فَصَارَ حِفْظُ شِعَارِهِمْ مِنْ تَمَامِ حِفْظِ الْإِسْلَامِ فَكَيْفَ بِمَنْ تَقَدَّمَ عَلَى الْكَلَامِ الْعَرَبِيِّ))[410].

بەهەمەحاڵ، لێرەدا لە ئەم باسەشدا دەستهەڵدەگرین و دەچینەسەر ئەسڵی مەبەست، ئەویش قورئانی پیرۆز و زمانی کوردییە.

---

٤١٠ـ مجموع الفتاوى: ٣٢/ ٢٥٥.

## باسی سێیەم

## قورئانی پیرۆز و زمانی کوردیی ([411])

ئەگەر ئاورێك لە زمانی عەرەبیی بدەینەوە، دەبینین کە زۆر وشەی کوردیی خۆمانیان موعەڕەب کردووە. بە جۆرێکی وا ناسینەوەی هەیهاتە. ئەم وشانە هێندە جوان کراوە بە عەرەبیی تەنانەت لە قورئانی پیرۆزیشدا جێی خۆی کردووەتەوە. تەماشای وشەی وەك (برزخ، صك، صدقة، بَدْرَقَة، رِضْوان، صفقة، جودی، دیك) و سەدان وشەی تر کە بە جۆرێك کراون بە عەرەبی، خاوەنوشە، وشەکەی خۆی ناناسێتەوە، مەگەر بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد.

وتمان لە قورئانی پیرۆزیشدا خودای گەورە و میهرەبان وشەی کوردیی بەکارهێناوە ئەوەتا دەفەرموویێت: ﴿لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾. سورة المؤمنون، الآية: ١٠٠. واتە: بەڵکوو ئەو ئاکارە چاکەی لێی نەبان بووم ئەو جار بیکەم. نەخێر، قسە بۆ خۆی دەکات: تازە هەتا ڕۆژی قیامەت لەمپەرێکی زۆر گەورەیان لە پێشدایە و (گەڕانەوەیان بۆ نییە).

دیسان دەفەرموویێت: ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾. سورة الذاريات، الآية: ٢٩. واتە: ژنەکەی بە هاوارەوە هات و چەپۆکێکی لە خۆی دا و گوتی: من پیرێژنێکم بەبێ زك و زا.

دیسان دەفەرموویێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾. سورة التوبة، الآية: ١٠٣. واتە: لە داراییەکی هەیانە سەدەقەیان لێ وەربگرە، هەتا بە ئەو پاك و خاوێنیان بکەیتەوە.

---

٤١١ـ ئەم باسە بەشێکە لە بەرهەمەکانی مامۆستا مەلا ئازاد گڵێجاڵیی، بە ناونیشانی (قوولەی قاف/٢)، کە زنجیرە بابەتێکە، بۆ گۆڤاری (پەیامی تصوف)ی نوسیوە، ژمارە: ٥/ زستانی ٢٠١٤، ل: ٣٤ ـ ٣٦.

دیسان دەفەرمووێت : ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ﴾. سورة هود، من الآية: ٤٠. واتە: -نوح هەر خەریکی کەشتییەکە بوو- هەتا فەرمانمان هات بۆ هەستانی تۆفان و تەنانەت تەنووری نانکردن - کە شوێنی ئاگرە - هاتەکوڵ و وەك مەنجەڵی سەر ئاگر سەرڕێژی کرد.

دیسان دەفەرمووێت: ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾. سورة هود، الآية: ٤٤. واتە: ئەوجا گوترا: زەمین! ئاوت هەڵقوڕێنە. بەرزایی! بەس ببارێنە، ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا و کار سەریگرت. لە سەر جودی لەنگەریگرت. گوترا: تارن. ئەوانەی ناهەقییکارن.

لە ئەم چەند ئایەتەدا وشەگەلی (برزخ، صك، صدقة، تنور، جودی) لە کوردییەوە کراون بە عەرەبیی.

## باسی چوارەم

## شێوازەکانی عەرەباندنی وشە

باس هاتە سەر موعەڕەب، با چەند شتێك هەیە باسیبکەین:

عەرەب عادەتی وایە کاتێك وشەیەك ئەکا بە عەرەبی هەندێ گۆڕانکاری بە سەرا ئەهێنێ. وەك (مەلای گەورە) لە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾. سەبارەت بە ئەمە دەڵێت: زمانی عەرەبی ((لیسانێ واسیعی موبین، ئەگەرچی مەجبورەن بەعزێ کەلیماتی ئەجنەبی وەرگرتییە، صقلی دایە، لیباسی عەرەبی لەبەر کردیە))[412]. دواتر (مەلای گەورە) نمونە لەسەر ئەم جۆرە عەرەباندنە دەهێنێتەوە و، دەڵێت: ((ئەڵێن: "ئیستەبرەق"، "ئەستوورك" بووە، تەعریب کراوە، مومکینە بوویتە عەرەبی پێش زەمانی سەعادەت وەرگیرایە))[413].

مامۆستای (مودەریس)یش لە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾. جەخت لە هەمان گریمانە و بۆچوون دەکاتەوە و، دەفەرموێت: ((أي مقروءً على الألسنة عربيا باعتبار المفردات وأساليب التركيب، ولا يقدح في ذلك التوصيفِ أمثالُ التنور والسجيل، إما لأنها من أصل اللغة العربية، وإن وافقت سائر اللغات، وإما لأنها مُزجت في التركيب المفهوم المعنى بحيث لا يتصور عربيٌّ أنه غير عربيّ))[414].

---

٤١٢ ـ تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ٤٤٩.

٤١٣ ـ تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی: ٣/ ٢٥٢.

٤١٤ ـ مواهب الرحمن: ٤/ ٢٤٢.

وە ئەوەی من سەرنجم داوە، عەرەباندنەی وشەی بیانی، زیاتر بەمجۆرەیە[٤١٥]:

١. پیتی (الف) دەگۆڕێت بە (ی)، یان فڕێیدەدات. وەك گۆڕینی وشەی (کرماشان) بە (قرمسین) ئەلفی یەکەمی فڕێداوە و ئەلفی دوەمی کردووە بە (ی).

٢. پیتی (پ) دەگۆڕێت بە(ف). وەك گۆڕینی وشەی (پیل) بە (فیل) و وشەی (پارسی) بە (فارسی)، بە هەمان چەشن وشەی (چەپکە) کە بە واتا چەپڵەیە، کراوە بە (صفقة)، یان وشەی (سپید) کراوە بە (سفید)، هەروەها وشەی (پەڕ) گۆڕیویانە بە (فرّ)، کە بە واتای دەرپەڕین و ڕاکردن دێت.

ئەم گۆڕانکارییە لە کوردییشدا هەیە، ئەوەتا (چفە) و (چپە) هەردوو یەك واتایان هەیە، هەروەها دەگۆڕێت بە (ب) وەك گۆڕینی وشەی (پادراهە) بە (بدرقة)، یان (گۆرەپا) بە (جورب) گۆرەپا واتە گۆڕی پێ، کراوە بە جەورەب. ئێستە پێیدەگوترێت گۆرەوی. خۆ ئەگەر بگوترێت: گۆرەپێ، تام و لەزەتەکەی کۆنی هەر دەمێنێت.

٣. پیتی (ت) دەگۆڕێت بە (گ) وەك گۆڕینی وشەی (تازە) بە (طازج)، هەروەها دەگۆڕێت بە (چ) وەك گۆڕینی وشەی (تەنگ) بە (ضنك). خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا﴾. سورة طه، من الآية: ١٢٤. واتە: هەر کەسێکیش بە ئامۆژگاریی من نەکات، ژینی لە تەنگانەدایە.

٤. پیتی (چ) دەگۆڕێت بە (ش)، وەك گۆڕینی وشەی (گەوچن) بە (جوشن) و وشەی (چایی) بە (شای)، یان دەگۆڕێت بە (ج) وەك گۆڕینی (چاردەقە) بە (جردقە) کە نانی چواردەق کراوە، یان دەگۆڕێت بە (ص) وەك گۆڕینی وشەی (گەچ) بە (جص) و (چەپکە) بە (صفقە) و (چنار) بە (صنار) و (گۆچان) بە

---

٤١٥ ـ قوولەی قاف: ئازاد عەباس کلێجالی، گۆڤاری پەیامی تصوف، ژمارە: ٥، ل: ٣٥ ـ ٣٦.

(صولجان)، گ كراوه به (ج)، و (چ) كراوه به (ص) و پاشان پاش و پێش (القلب المكانی) كراون.

پێشهوا (فهخرهدینی رازی) له كتێبی (مختار الصحاح)دا، دهفهرمووێت: له عهرهبیی پهتییدا پیتی (ص) و (ج) له یهك وشهدا كۆنابنهوه. ههروهها پیتی (ج) و (ق) له یهك وشه و پیتی (ج) و (ط) له یهك وشهدا كۆنابنهوه. وهك وشهی (صولجان و، منجنیق و، جردقة و، جوالق و، جوسق و، الجلطة).

٥. پیتی (د) دهگۆڕێت به (ذ) وهك گۆڕینی وشهی (ساده) به (ساذج).

٦. پیتی (ز) دهگۆڕێت به(ض)، وهك گۆڕینی وشهی (ڕهزوان) - چاودێری باخه ترێ - به (رضوان).

٧. پیتی (س) دهگۆڕێت به (ص)، وهك گۆڕینی وشهی (سهدیهكه) به واتای له سهدا یهك، به (صدقة).

٨. پیتی (ش) دهگۆڕێت به (س)، وهك گۆڕینی وشهی (كرماشان) به (قرمسین)، یان وشهی (گامێش) به (جاموس).

٩. پیتی (ك) دهگۆڕێت به (ق)، وهك گۆڕینی وشهی (كرماشان) به (قرمسین)، ههروهها (كاروان) به (قیروان) و (چهپكه) به (صفقه)، كهمجاریش دهكرێت به (ج) وهك (كۆشك) كراوه به (جوسق).

١٠. پیتی (گ) دهگۆڕێت به (ج)، وهك گۆڕینی وشهی (گهوچن) به (جوشن)، یان وشهی (سهرگین) به (سرجین)، یان (گامێش) به (جاموس)، یان (گهواڵ) به (جَوالق)، یان (گهچ) به (جص)، یان (گهزاف) به (جزاف) ههروهها دهگۆڕێت به (ك) وهك گۆڕینی وشهی (تهنگ) به (ضنك).

١١. پیتی (ه) دهگۆڕێت به (ج)، وهك گۆڕینی وشهی (ساده) به (ساذج)، یان به (ق) وهك (پادراهه) به (بدرقة).

١٢. پیتی (ی) دەگۆڕێت بە (و)، وەك گۆڕینی وشەی (گامێش) بە (جاموس).

١٣. جاری واش هەیە هەندێك پیت فڕێدەدرێت، وەك فڕێدانی پیتی (ق) و (ا) لە وشەی (ترۆوات)، کە بە (ترّهة) بە واتای قسەی هیچ و پووچ، لە کوردییدا (تڕ) بێجگە لە (با) دەنگدارەکە بە واتای قسەی لاف و گەزافیش دێت، (وات)یش یانی: گوتی. (ترۆوات) یانی لاف و گەزافی لێدا و قسەی بێواتای کرد. ئەم فڕێدانە زیاتر لە پیتەکانی (ا - و - ی) دەبێت کە لە عەرەبییدا بە حروفی (علّة) - یانی نەخۆش - ناسراون.

١٤. جاری واش هەیە وشەکە بەبێ دەستکارییکردن وەردەگرن. وەك وشەی (خەیار)، یان وشەی (قومقومە) لە کوردییدا بە فرێ لە ئاو دەگوترێت: قوم، دەکرێت لە (کەمکەمە)ش وەرگیرابێت.

لێرەدا دەستهەڵدەگرین و دێینەسەر بابەتی سەرەکیی خۆمان و لەسەر ئەو وشە کوردییانە دەدوێین کە لە قورئاندا هاتوون، بەڵام پۆشاك و سیمای عەرەبییان بە بەرداکراوە.

## باسی پێنجەم
## ئەو وشە کوردییانەی لە قورئاندا هاتوون

سەرەتا پێم خۆشە ڕوونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە ئەو ئایەتە پیرۆزانە بدەم کە باس لە عەرەبیەتیی قورئان دەکەن. وەك ئایەتی: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾. سورة يوسف، الآية: ٢. ئایەتی: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا﴾. سورة الشورى، من الآية: ٧. لەگەڵ چەند ئایەتێکی تر، کە جەخت لەسەر هەمان مەبەست دەکەنەوە.

لە ڕاستییدا گومان لە ئەوەدا نییە کۆی قورئانی پیرۆز عەرەبیە و بە زمانی عەرەبییش دابەزیوە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت زمانی (عەجەم) غەیرە عەرەبی تێدا نەبێت، بەڵکوو وەك یاسا و باوە هەر بەشێك زۆرینەی شتێکی پێکهێنا، ئەو زۆرینەیە دەبێتە ناسنامەی هەموو شتەکە: ((للأكثر حكم الكل))[416].

جا لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز زۆرینەی هەرە زۆری عەرەبییە، ئەو وشە بیانیی و ناعەرەبییانەی کە تێیدایە کاریگەریی لەسەر ناعەرەبیبوونی ناکەن. لە ئەم بارەیەوە پێشەوا (غەزالی) جوانی فەرمووە:

((اشتمال جميع القرآن على كلمتين أو ثلاث أصلها عجمي وقد استعملتها العرب و وقعت في ألسنتهم لا يخرج القرآن عن كونه عربيا، وعن إطلاق هذا الاسم عليه ولا يتمهد للعرب حجة، فإن الشعر الفارسي يسمى فارسيا وإن كانت فيه آحاد كلمات عربية إذا كانت تلك الكلمات متداولة في لسان الفرس))[417].

---

٤١٦- الوجيز في شرح القواعد الفقهية في الشريعة الإسلامي، الدكتور عبدالكريم زيدان: ٢١٤.

٤١٧ ـ المستصفي: للامام الغزالي، تحقيق: محمد عبد السلام عبد الشافي: ٨٥.

واتە: هەبوونی یەك دوو وشە -یان زیاتر- لە هەموو قورئاندا کە لە بنەڕەتدا عەرەبیی نەبن و عەرەبییش بەکاریهێنابن، ئەوە ناگەیەنێت کە قورئان عەرەبیی نییە و ئیتر ناتوانین بە قورئان بڵێین عەرەبیی و بەڵگە و بیانوویشی نەداوەتە دەست عەرەب، کە بڵێین: ئەم قورئانە کەی عەرەبییە ئەوە نییە وشەی بێگانەی تێدایە! شیعری فارسیی هەرچەند وشەی عەرەبییشی تیدابێت، هەر پێیدەڵێن: فارسیی، بە مەرجێك ئەو وشانە لە فارسییدا بەکاربهێنرێن.

لە لایەکی دیکەوە عەرەبییبوونی تەواوی قورئان، بە ئەو واتایە دێت وشە بیانییەکان پاش عەرەباندنی لەسەر ڕیشە و ڕەچەڵەکی زمانە بنەڕەتییە بیانییەکەی خۆی نامێنێت، بەڵکوو وەك وشەیەکی عەرەبیی دادەنرێت و هەژماردەکرێت. پێشەوا (ئالوسی) لە ئەم بارەیەوە دەفەرموویت: ((لا يقدح استعماله في القرآن في عربيته المذكورة في قوله تعالى: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا﴾. يوسف: ٢. لأنّه بعد التعريب والسماع في فصيح الكلام يصير عربياً فلا حاجة إلى إنكار تعريبه أو ادعاء التغليب أو أن المراد عربي الأسلوب))[418].

لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی زیاتر بۆمان ڕوونببێتەوە لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (عەجەمی) غەیرە عەرەبی هەیە، دەچینە خزمەت ئەم فەرموودەیەی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێت)، کە دەفەرموویت: «إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ»[419]. واتە: ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە دابەزیوە.

سەبارەت بە ئەو حەوت شێوەیە زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە، کە مەبەست پێی چییە؟

---

٤١٨ - تفسير الألوسي: ١٠/ ٤٥٠.

٤١٩- رواه البخاري، برقم: ٤٩٩٢. ومسلم، برقم: ١٩٣٦.

پێشەوا (قورتوبی) دەفەرموێت: مەبەست لێی حەوت شێوەزاری جیاوازی عەرەبەکانە. وەك دەفەرموێت: ((قال قوم: هي سبع لغات في القرآن على لغات العرب كلها يمنها ونزارها لأن رسول الله صلى الله عليه وسلم لم يجهل شيئا منها وكان قد أوتي جوامع الكلم وليس معناه أن يكون في الحرف الواحد سبعة أوجه ولكن هذه اللغات السبع متفرقة في القرآن فبعضه بلغة قريش وبعضه بلغة هذيل وبعضه بلغة هوزان وبعضه بلغة اليمن))[420]. هەروەها دەفەرموێت: ((قال قوم جائز أن يكون منها لقريش ومنها لكنانة ومنها لأسد ومنها لهذيل ومنها لتيم ومنها لضبة ومنها لقيس))[421].

لە شوێنێکی تردا بۆچوونی خۆی ڕوونتر دەردەبڕێت[422] و، دەفەرموێت: ((«أنزل القرآن على سبعة أحرف». أي سبعة أوجه من اللغات والله أعلم))[423]. واتە: قورئان بە حەوت شێوەزار دابەزیوە، خوداش زاناترە.

---

٤٢٠ـ تفسير القرطبي: ١/ ٥٣.

٤٢١ـ المصدر السابق: ١/ ٥٤.

٤٢٢ـ پێشەوا (قورتوبی) ئەم باسەی بە وردیی هێناوە، منیش لێرەدا دەیخەمەڕوو، بە هیوای سوودی زیاتر. ((باب هل ورد في القرآن كلمات خارجة عن لغات العرب أولا.. لا خلاف بين الأئمة أنه ليس في القرآن كلام مركب على أساليب غير العرب وأن فيه أسماء أعلاما لمن لسانه غير لسان العرب كإسرائيل وجبريل وعمران ونوح ولوط واختلفوا هل وقع فيه غير أعلام مفردة من غير كلام العرب فذهب القاضي أبو بكر بن الطيب والطبري وغيرهما إلى أن ذلك لا يوجد فيه وأن القرآن عربي صريح وما وجد فيه من الألفاظ التي تنسب إلى سائر اللغات إنما اتفق فيها أن تواردت اللغات عليها فتكلمت بها العرب والفرس والحبشة وغيرهم وذهب بعضهم إلى وجودها فيه وأن تلك الألفاظ لقلتها لا تخرج القرآن عن كونه عربيا مبينا ولا رسول الله عن كونه متكلما بلسان قومه فالمشكاة الكوة ونشأ قام من الليل ومنه ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ﴾ و ﴿يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ﴾ اي ضعفين. ﴿فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ﴾ اي الأسد كله بلسان الحبشة والغساق البارد المنتن بلسان الترك والقسطاس الميزان بلغة الروم والسجيل الحجارة والطين بلسان الفرس والطور الجبل واليم البحر بالسريانية والتنور وجه الأرض بالعجمية قال ابن عطية : فحقيقة العبارة عن هذه الألفاظ أنها في الأصل أعجمية لكن استعملتها العرب وعربتها فهي عربية بهذا الوجه وقد كان للعرب العاربة التي نزل القرآن بلسانها بعض مخالطة لسائر الألسنة بتجارات وبرحلتي قريش وكسفر مسافر بن أبي عمرو إلى الشام

زانای پایەبڵندی کورد مامۆستای (مودەڕیس)یش ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردووە و دەفەرمووێت: ((والمختار من بين تلك المعاني أنّ معنى نزول القرآن على سبعة أحرف نزوله على سبع لغات من لغات العرب))[424].

ئیمامی (قورتوبی) بە کردەیی چەند وشەیەکی بیانیی لە قورئاندا بە نمونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: ((وأنزل في القرآن من كل لغة فمنه ﴿السجِّيل﴾ وهي فارسية وأصلها سنك كيل، أي طين وحجر، ومنه ﴿الْفِرْدَوْسِ﴾ رومية، وكذلك ﴿القِسطاس﴾، وقرأ أهل الحجاز وأبو عمرو وابن ذكوان وحفص على الاستفهام، إلا أنهم لينوا الهمزة على أصولهم. والقراءة الصحيحة قراءة الاستفهام. والله أعلم))[425].

---

،وكسفر عمر بن الخطاب وكسفر عمرو بن العاص وعمارة بن الوليد إلى أرض الحبشة وكسفر الأعشى إلى الحيرة وصحبته لنصاراها مع كونه حجة في اللغة فعلقت العرب بهذا كله ألفاظا أعجمية غيرت بعضها بالنقص من حروفها وجرت إلى تخفيف ثقل العجمة واستعملتها في أشعارها ومحاوراتها حتى جرى مجرى العربي الصحيح ووقع بها البيان وعلى هذا الحد نزل بها القرآن فإن جهلها عربي ما فكجهله الصريح بما في لغة غيره كما لم يعرف ابن عباس معنى فاطر إلى غير ذلك قال ابن عطية: وما ذهب إليه الطبري رحمه الله من أن اللغتين اتفقتا في لفظة لفظة فذلك بعيد بل إحداهما أصل والأخرى فرع في الأكثر لأنا لا ندفع أيضا جواز الاتفاق قليلا شاذا.

قال غيره: والأول أصح وقوله هي أصل في كلام غيرهم دخيلة في كلامهم ليس بأولى من العكس فإن العرب لا يخلو أن تكون تخاطبت بها أولا فإن كان الأول فهي من كلامهم إذ لا معنى للغتهم وكلامهم إلا ما كان كذلك عندهم ولا يبعد أن يكون غيرهم قد وافقهم على بعض كلماتهم وقد قال ذلك الإمام الكبير أبو عبيدة. فإن قيل: ليست هذه الكلمات على أوزان كلام العرب فلا تكون منه قلنا ومن سلم لكم أنكم حصرتم أوزانهم حتى تخرجوا هذه منها فقد بحث القاضي عن أصول أوزان كلام العرب ورد هذه الأسماء إليها على الطريقة النحوية وأما إن لم تكن العرب تخاطبت بها ولا عرفتها استحال أن يخاطبهم الله بما لا يعرفون وحينئذ لا يكون القرآن عربيا مبينا ولا يكون الرسول مخاطبا لقومه بلسانهم والله أعلم)). تفسير القرطبي: ١/ ٦٨ ـ ٦٩.

٤٢٣ـ تفسير القرطبي: ١/ ٧٠.

٤٢٤ـ مواهب الرحمن، للشيخ محمد عبدالكريم المدرس: ١/ ١٨.

٤٢٥ـ تفسير قرطبي: ١٥/ ٣٦٩.

هەرچەند هەندێك لە زانایان پێیان وایە، قورئانی پیرۆز وشەی بێگانەی تێدا نییە، بەڵام بەشێكی تریان بەپێچەوانەوە. وەك (نەیسابوری)[٤٢٦] و (سەعلەبی)[٤٢٧] كە هەر دووكیان دەفەرموون: ((وأنزل في القرآن بكلّ لسان، فمنه السجيل، وهي فارسية عربت "سنك" و "كل")).

هەروەها (ئالوسی) دەڵێت: ((صح عن أبي ميسرة التابعي الجليل أنه قال: في القرآن من كل لسان، وروي مثله عن سعيد بن جبير، و وهب بن منبه))[٤٢٨]. واتە: لە گەورەتابیعینی وەك: (ئەبو مەیسرە، سەعیدی كوڕی جوبەیر، وەهبی كوڕی مونەبیه)ەوە چەسپاوە، قورئان هەموو زمانە جیاوازەكانی تێدایە.

حیكمەتی هەبوونی ئەم هەموو زمانە جۆراوجۆرانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، كە قورئان مادام پەیامێكی گشتگیر و سەرتاسەرییە و بۆ تەواوی گەلانی سەر ڕووی زەوییە، كەواتە زمانی هەموو گەلانیش لەخۆدەگرێت. ئەمەش گەورەزانای موفەسیر (ئالوسی) و جگە لە ئەویش باسیانكردووە و دەڵێن: ((وقال غير واحد: المراد أنه عربي الأسلوب، واستدلوا باتفاق النحاة على أن منع صرف نحو إبراهيم للعلمية والعجمة، ورد بأن الأعلام ليست محل خلاف وإنما الخلاف في غيرها، وأجيب بأنه إذا اتفق على وقوع الأعلام فلا مانع من وقوع الأجناس ونظر فيه، واختار الجلال السيوطي القول بالوقوع، واستدل عليه بما صح عن أبي ميسرة التابعي الجليل أنه قال: في القرآن من كل لسان، وروي مثله عن سعيد بن جبير و وهب بن منبه. وذكر أن حكمة وقوع تلك الألفاظ فيه أنه حوى علوم الأولين والآخرين ونبأ كل شيء فلا بد أن تقع فيه الإشارة إلى أنواع اللغات لتتم إحاطته

---

٤٢٦ـ الكشف والبيان، النيسابوري: ٨/ ٢٩٨.

٤٢٧- تفسير الثعلبي: ٢٠٠٨.

٤٢٨ـ تفسير الألوسي: ٨/ ٤٢٣.

بكل شيء فاختير له من كل لغة أعذبها وأخفها وأكثرها استعمالاً للعرب وأيضاً لما كان النبي صلى الله عليه وسلم ملاسلاً إلى كل أمة ناسب أن يكون في كتابه المبعوث به من لسان كل قوم شيء))[٤٢٩].

بەشێك لە زانایان نەك تەنها شێوەزارە جیاوازەکانی عەرەب لە قورئاندا جێگەدەکەنەوە، بەڵکوو پێیان وایە هەموو زمانە جیاوازەکانی دونیا لە ناو قورئاندا هەیە. وەك هەریەکە لە زانایان (الشيخ عادل أحمد عبدالموجود) و (الشيخ على محمد معوض) لە لێکۆڵینەوەیان بۆ کتێبی (سبل الهدى والرشاد)، دەفەرموون: ((أخرج ابن جرير بسند صحيح عن أبي ميسرة التابعي الجليل قال: «في القرآن من كل لسان». وروي مثله عن سعيد بن جبير و وهب بن منبه. فهذه إشارة الى أن حكمة وقوع هذه الالفاظ في القرآن أنه حوى علوم الاولين والاخرين، ونبأ كل شئ، فلا بد أن تقع فيه الاشارة الى أنواع اللغات والألسن ليتم إحاطته بكل شئ، فاختير له من كل لغة أعذبها وأخفها وأكثرها استعمالا للعرب. ثم رأيت ابن النقيب صرح بذلك، فقال: من خصائص القرآن على سائر كتب الله تعالى المنزلة أنها نزلت بلغة القوم الذين أنزلت عليهم، ولم ينزل فيها شئ بلغة غيرهم، والقرآن احتوى على جميع لغات العرب وأنزل فيها بلغات غيرهم من الروم والفرس والحبشة شئ كثير انتهى. وأيضا النبي صلى الله عليه وسلم مرسل الى كل أمه، وقد قال تعالى: ﴿وما أرسلنا من رسول إلا بلسان قومه﴾ سورة إبراهيم، الآية: ٤. فلا بد وأن يكون في الكتاب المبعوث به من لسان كل قوم))[٤٣٠].

---

٤٢٩ـ تفسير الألوسي: ٨/ ٤٢٣. تفسير الطبري: ١/ ١٤. سبل الهدى والرشاد، للصالحي الشامي: ١٠/ ٢٩١.

٤٣٠ـ سبل الهدى والرشاد، للصالحي الشامي: ١٠/ ٢٩١.

پێشەوا (سیوتی)ش کتێبێکی نووسیوە و تایبەتیکردووە بە ئەو وشە ناعەرەبییانەی لە قورئاندا هەیە و ناوی ناوە: (المهذب فيما وقع في القرآن من المعرب).

کەواتە قورئانی پیرۆز بەپێی زمان و شێوەزاری جیاوازی عەرەب و سەرجەم زمانەکانی تر وشەی جیاواز و جۆراوجۆری تێدایە، لە ناویشیاندا زمانی کوردیی.

ئەوەی پەیوەندیی بە ئێمە و جێگە باسی ئێرەمانەوە هەیە ئەوەیە، کە بزانین وشەی کوردیی هەندێکی (تەعریب) کراوە و عەرەبیش وشەی ئێمەیان بەکارهێناوە و بەکاریشیدەهێنن. وەك چۆن ئێمە وشەی عەرەبیی و زمانەکانی تر بەکاردەهێنین، عەرەبیش بەهەمان شێوە. وەك ئەم وشانەی خوارەوە، کە لە بنەڕەتدا (عەجەمی) و غەیرە عەرەبیین، کەچی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون و ژمارەیەکیان وشەی ڕەسەنی کوردیین.

هەرکام لە زانایان (عادل أحمد) و (محمد علي عوض) لە لێکۆڵینەوەیاندا لەسەر کتێبی (سبل الهدى والرشاد) و لە پەراوێزەوە زۆرێك لە ئەو وشە عەجەمییانەی قورئانیان هێناوە و کۆیانکردووەتەوە و دەفەرموون: (ئەبو عوبەید قاسمی کوڕی سەلام) دەفەرموێت: ((والصواب عندي مذهب فيه تصديق القولين جميعا، وذلك أن هذه الاحرف أصولها أعجمية كما قال الفقهاء، لكنها وقعت للعرب، فعربتها بألسنتها وحولتها عن ألفاظ العجم الى ألفاظها، فصارت عربية، ثم نزل القرآن وقد اختلطت هذه الحروف بكلام العرب، فمن قال انها عربية فهو صادق، ومن قال: أعجمية فصادق. ومال الى هذا القول الجواليقي وابن الجوزي وآخرون)).

لە ناو ئەو هەموو وشە نا عەرەبییانەی قورئاندا، ئێمە چەند وشەیەك وەردەگرین و دەیانخەینە سەر ڕەگ و ڕیشە کوردییەکەی:

١. وشەی (مەککە) کە یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی ماڵی خودا، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾. سورة الفتح، الآية: ٢٤. (مەککە) وشەیەکی عەرەبی نییە، بەڵکوو کوردییە. کە بە شێوەزاری کرمانجی ژوروو (بادینی) واتە: دایك، ئەمەش کاتێك حەزرەتی (ئیسماعیل) خاتوو (هاجەرە)ی دایکی بانگکردووە پێیگوتووە: (ماك)، کە بە واتای دایك دێت، بەڵام عەرەب لە بەکارهێناندا (ئەلف)ەکەی لادەبەن و لە بری کردوویانە بە (بزوێن) و پاشان بووەتە (مەککە)[431].

٢. بە هەمان شێوە وشەی (بەکە)، کە یەکێکی ترە لە ناوەکانی (کەعبەی پیرۆز)، وشەیەکی کوردییە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ﴾ سورة آل عمران، الآية: ٩٦. پاش ئەوەی (کەعبە) لە (مەککە)دا دروستکرا لە لایەن حەزرەتی (ئیبراهیم) و (ئیسماعیل)ی کوڕیەوە، لەبەر پیرۆزیی شوێنەکە و پاکێتیی ئەم شوێنە لەسەر زەویدا بە (پاك) ناویان بردووە، کە بە واتای (طاهر)ی عەرەبییەکەیە و لە زمانی عەرەبدا بووەتە (بکە). کرمانجی سەروویش فۆنەتیکی (پاکە) بە (پکە) دەخوێننەوە و دان نانێن بە (ئەلف)ەکەدا. واتە درێژە بە (ئەلف)ەکە نادەن و بە کورتیی دەیخوێننەوە بە (پکە). جا لە زمانی عەرەبییدا پیتی (پ) نییە، لەبەرئەوە سەرئەنجام کردوویانە بە (بکە).

ئەم وشەیەیش خودا هەر بە کوردییەکەی خۆیەوە لە قورئاندا ناوی هێناوە لەسەر زاری ئەو پێغەمبەرانەی (درودی خودایان لەسەربێت)، کە عەرەب نەبوون[432].

---

٤٣١ـ حەجنامەی کوردی، محمد أمین جمیل موفتی: ٣٤.

٤٣٢ـ حەجنامەی کوردی: ٣٥.

٣. بەهەمان شێوە وشەی (یس) کە یەکەم ئایەتی سورەتی (یاسینە)، ئەمەش وشەیەکی کوردییە، بە ئەو بەشەی کتێبی (یەسنا) دەگوترێت کە بەشێکە لە (ئاوێستا) و لە لایەن خودی (زەردەشت)ەوە بە ئێمە گەیشتووە. وشەی (یەسنە) کورتکراوەی (یس تانا)یە. واتە: یەزدان، کە بە بیروباوەڕی ئێرانییەکانی ئەو کاتە واتای ناوی خودای تاکی بێوێنەیە، کە بەدیهێنەری خێر و خۆشیی و لابەری ئاژاوە و شەڕە.

بە ئەم جۆرە دەردەکەوێت کە گەلی کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە خاوەنی ئاین و یاسا بووە و خودای گەورەی ناسیوە و پەیوەندیی بتەوی لەگەڵ جیهانی دەوروبەریدا بەستووە[٤٣٣].

٤. وشەی (لەت)، کە لە ئەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ سورة الطور، الآية: ٢١. وشەیەکی کوردییە، خدوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە بڕوادارن و منداڵی چاکیان هەیە، دەفەرموێت: وەك چاکەکەی خۆیان پاداشتیان دەدەینەوە و هەرگیز پاداشتەکەیان (لەت) ناکەین، واتە کەم ناکەینەوە[٤٣٤].

٥. بەهەمان چەشن وشەی (ضنك) کە لە ئایەتی: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ سورة طه، الآية: ١٢٤. دا هاتووە، لە (تەنگ)ی کوردییەوە وەرگیراوە، کە وشەکە و واتاکەیشی تەبا و کۆکن لەگەڵ یەکتری و پێشتریش لە باسی ئاڵوگۆڕپێکردنی پیتەکاندا لە زمانی کوردییەوە بۆ عەرەبیی ئاماژەمان پێدا.

---

٤٣٣- بڕوانە/ چمکێك لە مێژووی کوردستان: رسول شارستێنی، گۆڤاری پەیامی زانایان، ژ: ٥، ل: ٦٣.

٤٣٤ - لە پێناوی زمانەکەماندا: ١٨.

٦. هەروەها وشەی (سجيل) له ئايەتی: ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ﴾ سورة هود، الآية: ٨٢. ئايەتی: ﴿تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ﴾ سورة الفيل، الآية: ٤. له وشەی (سنگ گلّ)ەوە وەرگيراوە[٤٣٥]. كه به واتای ئەو خۆڵە وشكه ڕەقبووە دێت كه (تەيرەئەبابيل) هەڵياندەگرت و سوپاكەی (ئەبرەهە)يان پێ بەردباران دەكرد.

٧. بەهەمان شێوە وشەی (كأس) له ئايەتی: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾. سورة الإنسان، الآية: ٥. وشەيەكی كوردييه و كورد پێيدەڵێت: (كاسه).

٨. ديسان وشەی (زنجبيل) له ئايەتی: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا﴾ سورة الإنسان، الآية: ١٧. وشەيەكی كوردييه و به واتای (زەنجەفيل) دێت.

٩. وشەی (چەك) كراوە به (صَك)، وەك له زۆر شوێنی كوردستانی ڕۆژهەڵات به چەپۆكه و شەپازله دەڵێن: چەك. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾. سورة الذاريات، الآية: ٢٩. واته: ژنەكەی به هاوارەوە هات و چەپۆكێكی له خۆی دا و گوتی: من پیرێژنێكم بەبێ زك و زا.

يەكێك له موعجيزەكانی قورئان ئەم ئايەتەيە، كه خودای گەورە باسی ژن و پياوێكی كورد دەكات –كه حەزرەتی (ئيبراهيم) و (ساره) خاتوونی خێزانيەتی– وشەی كوردييان بۆ بەكاردەهێنێت. تۆ بڵێيت ﴿صَرَّةٍ﴾يش له سيڕەی كوردييەوە نەهاتبێت؟ به تايبەت كه شێخی (شەنقيتی) له (أضواء البيان) دا دەفەرمووێت: ((فِي صَرَّةٍ أَيْ فِي صَيْحَةٍ، وَمِنْ هَذَا الْمَعْنَى صَرِيرُ الْبَابِ وَالْقَلَمِ، أَيْ صَوْتُهُمَا)). له كوردييشدا به دەنگی دەرگا و قەڵەم دەگوترێت: (سيڕە)[٤٣٦].

---

٤٣٥- تفسير الطبري: ١/ ١٤.

٤٣٦- قوللەی قاف: ئازاد عەباس كلێجاڵی، گۆڤاری پەيامی تصوف، ژ: ٥، لا: ٣٥.

١٠. عەرەب پیتی (س) دەگۆڕێت بە (ص)، وەك گۆڕینی وشەی (سەدیەکە) بە واتای لە سەدا یەك، بە (صدقة). ئەم وشەیەش لە چەندین شوێنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت) هاتووە. وەك هەرکام لە ئایەتەکانی: ﴿قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى﴾. سورة البقرة، من الآية: ٢٦٣. ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾. سورة التوبة، من الآية: ١٠٣.

ئەمانە و چەندین وشەی تر کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر و وردتر هەیە. بە ئەو هیوایەی هەوڵێکی چڕ و پڕ بۆ ئەم باسە و دۆزینەوەی وشە کوردییە تەعریبکراوەکان بخرێتەگەڕ، بۆئەوەی ئەدەبیات و زمانی ڕەسەنی خۆمان بناسینەوە و لە فەوتان و ونبوون ڕزگاریانبکەین.

چونکە ئێمە هەزاران وشە و زاراوەمان خراونەتە ناو زمانەکانی تری گەلانی دەوروبەرمانەوە، بەڵام خۆمان هەتا ئێستا نەبووینەتە خاوەنی زمانێکی یەکگرتووی کوردیی[٣٧]. ئەمەش لە کاتێکدا کورد لە پێش هاتنی ئیسلام خاوەنی سەدان کتێب و نووسراوی هەمەجۆر بووە لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا. هەموو ئەمانەش گەورەیی و بەرفراوانیی و دەوڵەمەندیی ئەم زمانە پیرۆزەمان بۆ دەردەخات.

ڕەنگە کەسێك بپرسێت و بڵێت، خۆ خودای گەورە لە چەند ئایەتێکدا عەرەبییبوونی قورئانی بەیانفەرمووە. ئێمەش دەڵێین وایە، بەڵام هەبوونی ئەم وشە بیانییانە قورئان لە عەرەبییبوونی ناخات؛ چونکە مەبەستی ئەو ئایەتانە

---

٣٧- بڕوانە/ لە پێناوی زمانەکەماندا: ١٨.

کۆی قورئانە. ئێمەش باس لە وشەگەلێك دەکەین، کە بە هەموویانەوە، پاشان ڕەنگە (حیزب)ێکی قورئان پێکبهێنن.

ئەمانەی خوارەوەش ئەو وشە ناعەرەبییانەی قورئانن، کە زانایان دەستنیشانیان کردووە:

هەرکام لە زانایان (عادل أحمد) و (محمد علی عوض) لە پەراوێزیان بەسەر کتێبی (سبل الهدى والرشاد) دەفەرموون: ((وهذا سرد الالفاظ الواردة في القرآن من ذلك مرتبة على حروف المعجم:

(أباريق): حكى الثعالبي في فقه اللغة انها فارسية، وقال الجواليقي: الابريق فارسي معرب، ومعناه طريق الماء أو صب الماء على هينة.

(أب): قال بعضهم: هو الحشيش بلغة أهل الغرب حكاه شيذلة.(ابلعي): اخرج ابن أبي حاتم عن وهب بن منبه في قوله تعالى: (ابلعي ماءك) قال: بالحبشية (أزدرديه). وأخرج أبو الشيخ من طريق جعفر بن محمد، عن أبيه قال: اشربي بلغة الهند.

(أخلد): قال الواسطي في الارشاد: أخلد الى الارض، ركن بالعبرية.

(الارائك): حكى ابن الجوزي في فنون الافنان، انها السرر بالحبشية.

(آزر): عد في المعرب على قولم من قال: انه ليس بعلم لابي ابراهيم ولا للصم. وقال ابن أبي حاتم: ذكر عن معتمر بن سليمان قال: سمعت أبي يقرأ: (وإذا قال ابراهيم لابيه آزر) عني بالرفع، قال: بلغني أنها أعوج وأنها أشد كلمة قالها ابراهيمَ لابيه وقال بعضهم: هي بلغتهم يا مخطئ.

(أسباط): حكى أبو الليث في تفسيره أنها بلغتهم كالقبائل بلغة العرب.

(استبرق): أخرج ابن أبي حاتم عن الضحاك أنه الديباج الغليظ، بلغة العجم.

(أسفار): قال الواسطي في الارشاد: هي الكتب بالسريانية، وأخرج ابن أبي حاتم عن الضحاك قال: هي الكتب بالنبطية.

(اصري): قال أبو القاسم في لغات القرآن: معناه عهدي بالنبطية.

(أكواب): حكى ابن الجوزي أنها الاكواز بالنبطية. وأخرج ابن جرير عن الضحاك أنها بالنبطية جرار ليست لها عرى.

(ال): قال ابن جني: ذكروا أنه اسم الله تعالى بالنبطية.

(أليم): حكى ابن الجوزي أنه الموجع بالزنجية. وقال شيذلة: بالعبرانية.

(اناه): نضجه بلسان أهل المغرب، ذكره شيذلة، وقال أبو القاسم: بلغة البربر، وقال في قوله تعالى (حميم آن): هو الذي انتهى حره بها، وفي قوله تعالى: (من عين آنية) أي حارة بها.

(أواه): اخرج أبو الشيخ بن حبان من طريق عكرمة، عن ابن عباس قال: الاواه الموقن بلسان الحبشة، وأخرج ابن أبي حاتم مثله عن مجاهد وعكرمة. وأخرج عن عمرو بن شرحبيل، قال: الرحيم بلسان الحبشة، وقال الواسطي: الاواه الدعاء بالعبرية.

(أواب): أخرج ابن أبي حاتم عن عمرو بن شرحبيل قال: الاواب: المسبح بلسان الحبشة وأخرج ابن جرير عنه في قوله تعالى: (أوبي معه)، قال: سبحي بلسان الحبشة.

(الملة الاخرة): قال شيذلة: الجاهلية الاولى أي الاخرة في الملة الاخرة، أي الاولى بالقبطية والقبط يسمون الاخرة الاولي، والاولى الاخرة. وحكاه الزركشي في البرهان.

(بطائنها): قال شيذلة في قوله تعالى: (بطائنها من استبرق) أي ظواهرها بالقبطية. وحكاه الزركشي.

(بعير): أخرج الفريابي عن مجاهد في قوله تعالى: (كيل بعير)، أي كيل حمار، وعن مقاتل: ان البعير كل ما يحمل عليه بالعبرانية.

(بيع): قال الجواليقي في كتاب المعرب: البيعة والكنيسة جعلهما بعض العلماء فارسيين معربين.

(تنور): ذكر الجواليقي والثعالبي أنه فارسي معرب.

(تتبيرا): أخرج ابن أبي حاتم عن سعيد بن جبير في قوله تعالى: (وليتبروا ما علوا تتبيرت) قال: تبره بالنبطية.

(تحت): قال أبو القاسم في لغات القرآن في قوله تعالى: (فناداها من تحتها) أي بطنها بالنبطية. ونقل الكرماني في العجائب مثله عن مؤرج.

(الجبت): اخرج ابن أبي حاتم عن ابن عباس، قال: الجبت اسم الشيطان بالحبشية. واخرج عن ابن حميد عن عكرمة، قال: الجبت بلسان الحبشة الشيطان، وأخرج ابن جرير عن سعيد بن جبير، قال: الجبت: الساحر، بلسان الحبشة.

(جهنم): قيل: أعجمية، وقيل فارسية وعبرانية، أصلها (كهنام).

(حرم): أخرج ابن أبي حاتم عن عكرمة، قال: وحرم: وجب بالحبشية.

(حصب): أخرج ابن أبي حاتم عن ابن عباس، في قوله تعالى: (حصب جهنم) قال: حطب جهنم، بالزنجية.

(حطة): قيل: معناه: قولوا صوابا، بلغتهم.

(حواريون): اخرج ابن أبي حاتم عن الضحاك قال: الحواريون: الغسالون بالنبطية، وأصله (هواري).

(حوب): تقدم في مسائل نافع بن الازرق عن ابن عباس، انه قال: حوبا: انما بلغة الحبشة.

(دارست): معناه قارأت بلغة اليهود.

(دري): معناه المضئ بالحبشية، حكاه شيذلة وأبو القاسم.

(دينار): ذكر الجواليقي وغيره انه فارسي.

(راعنا): اخرج أبو نعيم في دلائل النبوة عن ابن عباس قال: راعنا سب بلسان اليهود.

(ربانيون): قال الجواليقي: قال أبو عبيدة: العرب لا تعرف الربانيين، وانما عرفها الفقهاء وأهل العلم قال: وأحسب الكلمة ليست بعربية وانما هي عبرانية أو سريانية، وجزم القاسم بأنها سريانية.

(ربيون): ذكر أبو حاتم أحمد بن حمدان اللغوي في كتاب الزينة أنها سريانية.

(الرحمن): ذهب المبرد وثعلب الى أنه عبراني، وأصله بالخاء المعجمة.

(الرس): في العجائب للكرماني: انه عجمي ومعناه البئر.

(الرقيم): قيل: انه اللوح بالرومية حكاه شيذلة، وقال أبو القاسم: هو الكتاب بها، وقال الواسطي: هو الدواة بها.

(رمزا): عده ابن الجوزي في فنون الافنان من المعرب، وقال الواسطي: هو تحريك الشفتين بالعبرية.

(رهوا): قال أبو القاسم في قوله تعالى: (واترك البحر رهوا) أي سهلا دمثا، بلغة النبط، وقال الواسطي: أي ساكنا، بالسريانية.

(الروم): قال الجواليقي: هو أعجمي. اسم لهذا الجيل من الناس.

(زنجبيل): ذكر الجواليقي والثعالبي أنه فارسي.

(السجل): اخرج ابن مردويه من طريق ابي الجوزاء عن ابن عباس، قال: السجل بلغة الحبشة: الرجل. وفي المحتسب لابن جني. السجل: الكتاب. قال قوم: هو فارسي معرب.

(سجيل): اخرج الفريابي عن مجاهد، قال: سجيل بالفارسية، أولها حجارة، وآخرها طين.

(سجين): ذكرها أبو حاتم في كتاب الزينة أنه غير عربي.

(سرادق): قال الجواليقي: فارسي معرب، وأصله سردار، وهو الدهليز. وقال غيره. الصواب انه بالفارسية سردار، أي ستر الدار.

(سري): أخرج ابن أبي حاتم عن مجاهد في قوله تعالى: (سريا)، قال: نهرا بالسريانية، وعن سعيد بن جبير بالنبطية: القراء.

(سقر): ذكر الجواليقي أنها أعجمية.

(سجدا): قال الواسطي في قوله تعالى: (وادخلوا الباب سجدا)، أي مقنعي الرؤوس، بالسريانية.

(سكر): اخرج ابن مردويه، من طريق العوفي، عن ابن عباس، قال: السكر بلسان الحبشة: الخل.

(سلسبيل): حكى الجواليقي أنه عجمي.

(سنا): عده الحافظ ابن حجر في نظمه، ولم أقف عليه لغيره.

(سندس): قال الجواليقي: هو رقيق الديباج بالفارسية، وقال الليث: لم يختلف أهل اللغة والمفسرون في أنه معرب. وقال شيذلة: هو بالهندية.

(سيدها): قال الواسطي في قوله تعالى: (وألفيا سيدها لدى الباب)، أي زوجها بلسان القبط: قال أبو عمرو: لا أعرفها في لغة العرب.

(سنين): أخرج ابن أبي حاتم، وابن جرير عن عكرمة قال: سينين: الحسن بلسان الحبشة.

(سيناء): اخرج ابن أبي حاتم، عن الضحاك، قال: سيناء بالنبطية: الحسن.

(شطر): أخرج ابن ابي حاتم، عن رفيع في قوله تعالى: (شطر المسجد)، قال: تلقاء، بلسان الحبش.

(شهر): قال الجواليقي: ذكر بعض أهل اللغة أنه بالسريانية.

(الصراط): حكى النقاش وابن الجوزي أنه الطريق بلغة الروم، ثم رأيته في كتاب الزينة لابي حاتم.

(صرهن): اخرج ابن جرير، عن ابن عباس في قوله تعالى: (فصرهن)، قال: هي نبطية، فشققهن. وأخرج مثله عن الضحاك، وأخرج ابن المنذر عن وهب بن منبه قال: ما من اللغة شئ الا منها في القرآن شئ، قيل: وما فيه من الرومية؟ قال: (فصرهن) يقول: قطعهن.

(صلوات): قال الجواليقي: هي بالعبرانية كنائس اليهود، وأصلها (صلوتا) واخرج ابن ابي حاتم نحوه عن الضحاك.

(طه): اخرج الحاكم في المتسدرك، من طريق عكرمة عن ابن عباس في قوله تعالى: (طه) قال: هو كقولك: يا محمد، بلسان الحبش، واخرج ابن ابي حاتم، من طريق سعيد بن جبير عن ابن عباس قال: (طه) بالنبطية. واخرج عن سعيد بن جبير قال: طه يا رجل، بالنبطية، وأخرج عن عكرمة قال: طه يا رجل بلسان الحبشة.

(الطاغوت): هو لكاهن بالحبشية.

(طوبى): اخرج أبو الشيخ عن سعيد بن جبير، قال: بالهندية.

(طور): اخرج الفريابي، عن مجاهد. قال: الطور: الجبل بالسريانية. وأخرج ابن أبي حاتم عن الضحاك، أنه بالنبطية.

(عبدت): قال أبو القاسم في قوله تعالى: (عبدت بني اسرائيل)، معناه قتلت بلغة النبط.

(عدن): أخرج ابن جرير، عن ابن عباس انه سأل كعبا عن قوله تعالى: (جنات عدن) قال: كروم وأعناب بالسريانية، ومن تفسير جويبر انه بالرومية.

(العرم): اخرج ابن ابي حاتم، عن مجاهد، قال: العرم بالحبشية، وهي المسناة التي يجمع فيها الماء ثم ينبثق.

(غساق): قال الجواليقي والواسطي: هو البارد المنتن بلسان الترك. وأخرج ابن جرير عن عبد الله بن بريدة قال: الغساق: المنتن، وهو بالطخارية.

(فردوس): اخرج ابن ابي حاتم عن مجاهد، وقال: الفردوس بستان بالرومية. وأخرج عن السدي، قال: الكرم بالنبطية. وأصله (فرداسا).

(فوم): قال الواسطي: هو الحنطة بالعبرية.

(قراطيس): قال الجواليقي: يقال ان القرطاس اصله غير عربي.

(قسط): أخرج ابن أبي حاتم، عن مجاهد قال: القسط: العدل بالرومية.

(قسطاس): اخرج الفريابي، عن مجاهد، قال: القسطاس: العدل بالرومية. واخرج ابن أبي حاتم، عن سعيد بن جبير، قال: القسطاس بلغة الروم: الميزان.

(قسورة): اخرج ابن جرير، عن ابن عباس، قال: الاسد، يقال له بالحبشية: قسورة.

(قطنا) قال أبو القاسم: معناه كتابنا، بالنبطية.

(قفل): حكى الجواليقي عن بعضهم أنه فارسي معرب.

(قمل): قال الواسطي: الدبا بلسان العبرية والسريانية. قال أبو عمرو: لا أعرفه في لغة أحد من العرب.

(قنطار): ذكر الثعالبي في فقه اللغة انه بالرومية اثنتا عشرة ألف أوقية: وقال الخليل: زعموا أنه بالسريانية ملء جلد ثور ذهبا أو فضة. وقال بعضهم: انه بلغة بربر ألف مثقال، وقال ابن قتيبة: قيل انه ثمانية آلاف مثقال، بلسان أهل افريقية.

(القيوم): قال الواسطي: هو الذي لا ينام بالسريانية.

(كافور): ذكر الجواليقي وغيره انه فارسي معرب.

(كفر): قال ابن الجوزي: كفر عنا، معناه: امح عنا بالنبطية. واخرج ابن ابي حاتم عن أبي عمران الجوني في قوله تعالى: (كفر عنهم سيئاتهم) قال: بالعبرانية.

(كفلين): اخرج ابن أبي حاتم: عن أبي موسى الاشعري، قال: كفلين: ضعفين بالحبشية.

(كنن): ذكر الجواليقي أنه فارسي معرب.

(كورت): اخرج ابن جرير عن سعيد بن جبير: كورت: غورت، وهي بالفارسية.

(لينة): في الارشاد للواسطي: هي النخلة، وقال الكلبي: لا أعلمها الا بلسان يهود يثرب.

(متكأ): اخرج ابن ابي حاتم، عن سلمة بن تمام الشقري، قال: متكأ بلسان الحبش يسمون الترنج متكأ.

(مجوس): ذكر الجواليقي عن بعض أهل اللغة أنه أعجمي.

(مرجان): حكى الجواليقي عن بعض أهل اللغة انه أعجمي.

(مشكاة): اخرج ابن أبي حاتم عن مجاهد قال: المشكاة: الكوة، بلغة الحبشة.

(مقاليد): اخرج الفريابي عن مجاهد: قال: مقاليد: مفاتيح بالفارسية. وقال ابن دريد والجواليقي: الاقليد والمقليد: المفتاح فارسي معرب.

(مرقوم): قال الواسطي في قوله تعالى: (كتاب مرقوم)، أي مكتوب، بلسان العبرية.

(مزجاة): قال الواسطي: مزجاة: قليلة بلسان العجم، وقيل بلسان القبط.

(ملكوت): اخرج بن أبي حاتم، عن عكرمة في قوله تعالى: (ملكوت)، قال: هو الملك، ولكنه بكلام النبطية (ملكوتا). وأخرجه أبو الشيخ عن ابن عباس. وقال الواسطي في الارشاد: هو الملك بلسان النبط.

(مناص): قال أبو القاسم: معناه فرار بالنبطية.

(منسأة): اخرج ابن جرير عن السدي قال: المنسأة: العصا بلسان الحبشة.

(منفطر): اخرج ابن جرير عن ابن عباس، فيى قوله تعالى: (السماء منفطر به) قال: ممتلئة به، بلسان الحبشة.

(مهل): قيل: هو عكر الزيت بلسان أهل المغرب، حكاه شيذلة وقال أبو القاسم: بلغة البربر.

(ناشئة): أخرج الحاكم في مستدركه عن ابن مسعود، قال: ناشئة الليل: قيام الليل بالحبشية. واخرج البيهقي عن ابن عباس مثله.

(ن): حكى الكرماني في العجائب، عن الضحاك انه فارسي، أصله النون، ومعناه: اصنع ما شئت.

(هدنا): قيل معناه تبنا بالعبرانية، حكاه شيذلة وغيره.

(هود): قال الجواليقي: الهود اليهود، أعجمي.

(هون): اخرج ابن أبي حاتم عن ميمون بن مهران في قوله تعالى: (يمشون على الارض هونا) قال: حكماء بالسريانية، واخرج عن الضحاك مثله، واخرج عن أبي عمران الجوني انه بالعبرانية.

(هيت لك): اخرج ابن أبي حاتم، عن ابن عباس، قال: هيت لك، هلم لك بالقبطية. وقال الحسن: هي بالسريانية كذلك، أخرجه ابن جرير. وقال عكرمة: هي بالحورانية، كذلك اخرجه أبو الشيخ، وقال أبو زيد الانصاري: هي بالعبرانية، وأصله (هيتلج) أي تعاله.

(وراء): قيل: معناه أمام بالنبطية، وحكاه شيذلة وأبو القاسم، وذكر الجواليقي أنها غير عربية.

(وردة): ذكر الجواليقي انها غير عربية.

(وزر): قال أبو القاسم: هو الحبل والملجأ، بالنبطية.

(ياقوت): ذكر الجواليقي والثعالبي وآخرون انه فارسي.

(يحور): اخرج ابن أبي حاتم، عن داود بن هند، في قوله تعالى: (انه ظن ان لن يحور)، قال: بلغة الحبشة.

(يرجع): واخرج مثله عن عكرمة، وتقدم في اسئلة نافع بن الازرق عن ابن عباس.

(يس): اخرج ابن مردويه، عن ابن عباس، في قوله تعالى: (يس) قال: يا انسان بالحبشية، وأخرج ابن أبي حاتم عن سعيد بن جبير، قال: يس: يا رجل بلغة بالحبشية.

(يصدون): قال ابن الجوزي: معناه يضجون بالحبشية.

(يصهر): قيل معناه ينضج، بلسان أهل المغرب، حكاه شيذلة.

(اليم): قال ابن قتيبة: اليم: البحر بالسريانية، وقال ابن الجوزي: بالعبرانية، وقال شيذلة: بالقبطية.

(اليهود): قال الجواليقي: أعجمي معرب، منسوبون الى يهوذا بن يعقوب، فعرب باهمال الدال.

فهذا ما وقفت من الالفاظ المعربة في القرآن بعد الفحص الشديد سنين، ولم تجتمع قبل في كتاب قبل هذا)).[٤٣٨]

هەروەها ئیمامی (سیوتی) هەمان ئەم وشانەی سەرەوەی هێناوە لە کتێبە مەزنەکەیدا (الإتقان).[٤٣٩]

بەهەمان شێوە (شێخ ئیبراهیم ئەبیاری) لە کتێبی (تأریخ القرآن)دا چەند وشەیەکی هێناوە کە لە بنەڕەتدا عەرەبیی نین. ئەوانیش:

- الطور: سريانية، معناها: الجبل. سورة البقرة: ٦٣ وغيرها.

- طفقا: رومية، معناها: قصدا. الأعراف: ٢٢.

---

٤٣٨- سبل الهدى والرشاد: ١٠/ ٢٩٢ ـ ٢٩٦.

٤٣٩- بڕوانە/ الإتقان فى علوم القرآن، للسيوطى: ١/ ٣٧٦ ـ ٣٨٧.

- الرقيم: رومية، معناها: اللوح. الكهف: ٩ .

- هدنا: عبرانية، معناها: تُبْنا. الأعراف: ١٥٦ .

- طه: عبرانية، معناها: طأْ يا رَجُل. سورة طه: ١ .

- سينين: عبرانية، معناها: حسن. التين: ٢ .

- السجل: فارسية، معناها: الكتاب. الأنبياء: ١٠٤ .

- الاستبرق: فارسية، معناها: الغليظ. الدخان: ٥٣.

- السندس: هندية، الرقيق من الستر. الدخان: ٥٣.

- السريُّ: يونانية، معناها: النهر الصغير. مريم: ٢٤ .

- المشكاة: حبشية، معناها: الكوة. النور: ٣٥.

- الدري: حبشية، معناها: المضيء. النور: ٣٥.

- ناشئة الليل: حبشية، معناها: قام من الليل. المزمل: ٦.

- كِفْلين: حبشية، معناها: ضعفين. الحديد: ٢٨ .

- القَسْوَرَة: حبشية، معناها: الأسد. المدثر: ٥١.

- الملة الأخرى: قبطية، معناها: الأولى. سورة ص: ٧.

- وراءهم: قبطية، معناها: أمامهم. الكهف: ٧٩.

- بطائنها: قبطية، معناها: ظواهرها. الرحمن: ٥٤.

- أباريق: فارسية، معناها: أواني. الواقعة: ١٨ .

- إنجيل: يونانية، معناها: بشارة. آل عمران: ٤٨ .

- تابوت: قبطية، معناها: صندوق. البقرة: ٢٤٧.

- جهنم: عبرية، معناها: النار. الأنفال: ٣٦.

- زكاة: عبرية، معناها: حصة من المال. البقرة: ١١٠

- زنجبيل: بهلوية، معناها: نبات. الإنسان: ١٧ .

- سجِّيل: بهلوية، معناها: الطين المتحجر. الفيل: ٤.

- سرادق: فارسية، معناها: الفسطاط. الكهف: ١٨.

- سورة: سريانية، معناها: فصل. التوبة: ١٢٤.

- طاغوث: حبشية، معناها: الأنداد. البقرة: ٢٥٧.

- فردوس: بهلوية، معناها: البستان. الكهف: ١٠٧.

- ماعون: عبرية، معناها: القدْر. الماعون: ١٠٧[٤٤٠].

---

٤٤٠. تأريخ القرآن، للشيخ إبراهيم الأبياري: ١٩٠. وهو أخذه عن الكتابان:

* البرهان في علوم القرآن للزركشي: ١/ ٢٨٨.

* الإتقان في علوم القرآن للسيوطي: ١/ ١٣٩.

## بەشی نۆیەم و کۆتایی
## زمانی شیرینی کوردیی، لە زاری پیرۆزی حەزرەت و یارانەوە

ئەم بەشە بەسەر (دوو) باسدا دابەشبووە، ئەوانیش:

**باسی یەکەم/ پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت ) هەموو زمانێکی زانیوە و لەگەڵ هەر کەس و هۆزێکیشدا بە زمانی ئەوان دوواوە.**

**باسی دووەم/ زمانی شیرینی کوردیی لە زاری پیرۆزی حەزرەت و یارانەوە.**

## باسی یەکەم

## پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەربێت ) هەموو زمانێکی زانیوە و لەگەڵ هەر کەس و هۆزێکیشدا بە زمانی ئەوان دوواوە

لە ئەم بەشەدا، دەربارەی زمانی کوردیی دەدوێین، لەسەر زاری شیرینی پێغەمبەر و هەندێك لە هاوەڵانی بەڕێزەوە، لە کاتی ئاخاوتنیاندا چەند وشەیەکی کوردییان بەکارهێناوە. ئەمەش هیچ سەیر و نامۆ نییە، بەڵکوو حەقیقەتێکی چەسپاوە.

بۆ ئەم مەبەستە چەند بەڵگەیەکمان خستووەتەڕوو و پشتمان پێ بەستووە، کە بە شێوەیەکی گشتیی دڵنیابەخش و دڵخۆشکەرن و جێگەی خۆیان دەگرن. سەرەڕای ئەوەی فەرموودەکان هەندێکیان پلەی هێزیان لە ئاستێکی باشدا نەبێت، بەڵام هەندەکەی تریان فەرموودەی (صەحیح/ دروست)ن، ئەوانەیشی لاواز و بێهێزن، هەروەك لە زانستی فەرموودەناسییدا ڕوونکراوەتەوە، سەرەڕای لاوازییان، بۆ ئەم جۆرە بابەتانە کەڵکی خۆیان دەبێت و دەتوانرێت بخرێنەڕوو. لەبەرئەوە ئێمەش لێرەدا چەن دەقێك لەسەر ناونیشانەکەمان دەخەینە پێشچاو.

سەرەتاش پێم باشە ئەو پرسە ڕوونبکەمەوە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لەسەربێت) وەك ئەوەی پێغەمبەری تەنها نەتەوە و هۆزێك نەبووە، بەهەمان شێوە بۆ یەك زمانی تایبەتیش نەهاتووە، بەڵکوو خودای بەرز و مەزن ناردوویەتی بۆ هەموو نەتەوە و هۆز و زمان و نەریتە جیاوازەکان. وەك دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾. سورة الأعراف، الآية: ١٥٨. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾. سورة الأنبياء، الآية: ١٠٧.

دووباره دەفەرموویّت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾. سورة الفرقان، الآية: ١.

دیسان دەفەرموویّت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾. سورة الروم، الآية: ٢٢.

ئەمانە و گەلێك ئایەتی تری هاوشێوە، ڕوونیدەکەنەوە چ پێغەمبەر و چ بەرنامە پیرۆزەکەی -کە قورئانە-، پەیامێکی سەرتاسەریی و جیهانییە و بۆ هەموو نەتەوەیەکە و بۆ هەموو زمانە جیاوازەکانە. لە ناویشیاندا نەتەوەی کورد و زمانی کوردیی.

کەواتە مادەم پێغەمبەر نێردراوە بۆ هەموو نەتەوەکان، ئاساییە زمانی هەموو نەتەوەکانیشی زانیبێت و بە ئەو زمانە گفتوگۆی کردبێت، کە نەتەوەکانی پێ بانگکردووە بۆ بڕوامێنان و مسوڵمانبوون.

بەشێك لە ئەو بەڵگانەی دەلالەت لەسەر زمانزانی بیانیی (غەیرە عەرەبی) پێغەمبەر دەکەن، ئەمانەی خوارەوەیە:

١. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت)، (دوو) جار سەفەری کردووە بۆ (شام)، جارێك لەگەڵ (ئەبوتالب)ی مامیدا و جارێکی تر بە مەبەستی بازرگانییکردن بۆ خاتوو (خەدیجە) لەگەڵ (مەیسەرە). ئەمە لە کاتێکدا خەڵکی ئەوێ بە زمانی (یۆنانی) قسەیانکردووە، کەچی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) پەکی نەکەوتووە لەسەر جیاوازیی زمانیان و کاریشی لەبەرڕۆیشتووە.

٢. کاتێك دایکمان خاتوو (خەدیجە)، پێغەمبەری برد بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفل)، پێغەمبەر بە زمانی (عیبری) قسەی لەگەڵ کرد! چونکە (وەرەقە) بە زمانی (عیبری) قسەی کردووە.

٣. کاتێکیش وەفدەکانی (حەبەشە، دەوس، هەمدان، غەسان)، یان هەر کەسێکی دیکەی غەیرە عەرەب هاتوون بۆ لای، وەك: (صوهەیبی ڕۆمی، سەلمانی فارسی، جابانی کوردی، هتد..) پێغەمبەر بە زمانی خۆیان قسەی لەگەڵ کردوون و پەیمانی مسوڵمانبوونیانی لێوەرگرتوون.

((یان نامەی بۆ "وائیلی کوڕی حیجری کەنەدی" ناردووە لە "حەزرەمەوت"، هەروەها بۆ "زی میشعاری هەمەدانی"، "تیهفەی نەهدی"، "فەتینی کوڕی حاریسەی عولەیمی"، "ئەشعەسی کوڕی قەیس" و جگە لە ئەوانیش بە زمان و شێوەزاری خۆیان))[٤٤١].

٤. بێباوەڕان جاروبار پێغەمبەریان بە ئەوە تۆمەتباردەکرد، لە کەسێکی غەیرە عەرەبەوە زانست وەردەگرێت، هەروەك قورئانی پیرۆز ئەمەی خستووەتەڕوو: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ﴾. سورة النحل، الآية: ١٠٣. واتە: بە ڕاستیی ئێمە دەزانین، بێباوەڕان دەڵێن: کەسێك (موحەممەد) فێردەکات، کە عەجەمییە و عەرەب نییە، لەگەڵ ئەوەدا قورئان بە زمانێکی ڕەوانی عەرەبیی دابەزیوە.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەمان پێشکەشدەکات کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) زمانی بیانیی (عەجەمی) زانیوە، ئەگەرنا چۆن لەگەڵ بێگانەیەکدا گفتوگۆ دەکات[٤٤٢].

---

٤٤١- بڕوانە/ في الحديث الشريف والبلاغة النبوية: الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي، دار الفكر – دمشق، الطبعة الأولى/ ١٤٣٢ هـ - ٢٠١١م: ٥٤ - ٥٥، ل: ٥٦.

٤٤٢- دەشکرێت بڵێین عەجەمەکان زمانی عەرەبییان زانیوە، ئەمەش شتێکی ئاساییە و واریدە، بەڵام حاڵ و مەقامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لەپێشترە کە بڵێین زیرەکیی و زمانزانییەکە لە لایەن ئەوەوە بووە.

(ئیبن عەباس) لە ئەو بارەیەوە فەرموویەتی: «كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يعلم قَينًا بمكة، وكان اسمه بلعام، وكان أعجمي اللسان، وكان المشركون يرون رسول الله صلى الله عليه وسلم يدخل عليه ويخرج من عنده، قالوا: إنما يعلمه بلعام»[٤٤٣]. (ئیبن کەسیر)یش فەرمویەتی: ((وذاك كان أعجمي اللسان لا يعرف العربية، أو أنه كان يعرف الشيء اليسير بقدر ما يَرُد جواب الخطاب فيما لا بد منه))[٤٤٤]. واتە: ئەو کابرایە هەر زمانی عەرەبیی نەدەزانی، یان ڕێژەیەکی کەمی دەزانی، ئەوەندەی وەڵامی پێویستی پێبداتەوە.

٥. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) بە زمانی هۆز و نەتەوە جیاوازەکان قسەی کردووە، ئەمانەی خوارەوە چەند نمونەیەکن لە ئەو وشە ناعەرەبییانەی بەکاریهێناون:

أ. لەگەڵ ئافرەتێکی (حەبەشی)دا، بە زمانی حەبەشی دواوە، (دایکی خالد) بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێت: «أتي رسول الله صلى الله عليه و سلم بثياب فيها خميصة سوداء قال: من ترون نكسوها هذه الخميصة؟ فأسكت القوم قال: ائتوني بأم خالد. فأتي بي النبي صلى الله عليه و سلم فألبسنيها بيده وقال: أبلي وأخلقي، مرتين. فجعل ينظر إلى علم الخميصة ويشير بيده إلي ويقول: يا أم خالد هذا سنا. والسنا بلسان الحبشة: الحسن»[٤٤٥].

واتە: پۆشاکێکی خەتڕەش هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت)، ئەویش فەرمووی: بە کێی بدەین باشە لەبەریبکات؟ خەڵکەکە بێدەنگ

---

٤٤٣ـ تفسير ابن كثير: ٤/ ٦٠٤. تفسير الطبري: ١٧/ ٢٩٩. تفسير البغوي: ٥/ ٤٤. اللباب في علوم الكتاب: ١٢/ ١٥٨.

٤٤٤ـ تفسير ابن كثير: ٤/ ٦٠٣. في ظلال القرآن، سيد قطب: ٤/ ٤٩٠.

٤٤٥ـ رواه البخاري في صحيحه، برقم: ٥٥٠٧.

بوون، پاشان خۆی فەرمووی: (دایکی خالد)م بۆ بهێنن، هێنایان و پێغەمبەر کردیە بەری و پێیفەرموو: بیدڕێت و لەبەرتدا کۆن ببێت، پاشان بە زمانی حەبەشی فەرمووی: (دایکی خالد) ئەمە جوانە.

ب. (عوروە) لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێکدا لە (بەنوسەلەمە) چووینە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت)، فەرمووی: هەرگیز داوای شت لە خەڵك مەکەن! چونکە هەمیشە دەستی بەرز لە دەستی نەویی باشترە. «عن عروة بن محمد عن أبيه عن جده قال: قدمت على النبي صلى الله عليه وسلم في ناس من بني سعد فسمعته يقول: ما أغناك الله فلا تسأل الناس شيئا فإن اليد العليا هي المنطية، وإن اليد السفلى هي المنطاة وإن مال الله مسؤول ومنطى، قال: فكلمنا رسول الله صلى الله عليه وسلم بلغتنا»[٤٤٦].

وەك لە دەقە عەرەبییەکەدا هاتووە، (عوروە) دەڵێت: پێغەمبەر بە شێوەزاری خۆمان (واتە بەنوسەعد) قسەی لەگەڵ کردین.

ج. هەروەها بە دیالێکتی (بەنو عامیر) دوواوە، لە کاتێکدا هەر لە ئەو کۆڕەدا بە زمانی جیاواز لەگەڵ خەڵکانی تردا قسەی کردووە، وەك لە ئەم ڕیوایەتەی (عەسقەلانی) و (بوەیصیری)دا هاتووە: «العامري حين سأله، فقال له النبي صلى الله عليه وسلم: سل عنك. أي سل عما شئت، وهي لغة بنى عامر، و كان يقول للسائلين قبل ذلك: سل عما بدا لك، فقال يومئذ للعامري: سل عنك، فكلمه بلغة بني عامر، فكلمه بما يعرف»[٤٤٧].

---

٤٤٦ـ البحر الزخار مسند البزار، برقم: ٣٤٠٧. كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، علاء الدين علي بن حسام الدين المتقي الهندي البرهان فوري: ١٧٠٠٧.

٤٤٧ـ المطالب العالية: للحافظ ابن حجر العسقلاني، رقم: ٤٣١٧. الشفا بتعريف حقوق المصطفى، للقاضي عياض: ١٢٠. إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، البوصيري: ٧/ ١٨.

د. «عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ فَضَالَةَ عَنْ أبيهِ، قَالَ: عَلَّمَنِى رَسُولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم، فَكَانَ فِيمَا عَلَّمَنِى: وَحَافِظْ عَلَى الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ. قَالَ، قُلْتُ: إِنَّ هَذِهِ سَاعَاتٌ لِى فِيهَا أشْغَالٌ فَمُرْنِى بِأمْرٍ جَامِعٍ إِذَا أنَا فَعَلْتُهُ أجْزَأَ عَنِّى. فَقَالَ: حَافِظْ عَلَى الْعَصْرَيْنِ. وَمَا كَانَتْ مِنْ لُغَتِنَا. فَقُلْتُ: وَمَا الْعَصْرَانِ؟ فَقَالَ: صَلَاةٌ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلَاةٌ قَبْلَ غُرُوبِهَا»[٤٤٨].

واته: (عەبدولّا) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: لە ئەو شتانەی پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەربێت) فێریکردم، ئەوەبوو پارێزگاریی لە پێنج فەرزە نوێژەکە بکەم. منیش گوتم: قوربان من لە ئەو کاتانەدا سەرقاڵم، شتێکی ترم پێبڵێ خێری ئەوانەم تێدا دەستبکەوێت. فەرمووی: نوێژی (عەصران) بکەن. منیش گوتم: مەبەست لە (عەصران) چییە؟ چونکە ئەو وشەیە لە زمانی ئێمەدا نەبوو. پێغەمبەر فەرمووی: نوێژێك پێش خۆرهەلاّتن و نوێژێکیش پیش خۆرئاوابوون.

لێرەشدا وەك دەردەکەوێت، پێغەمبەر بە زمانی جیاواز قسەی لەگەڵ یارەکانیدا کردووە.

هـ. (ئیبن ئەسیر) لە (پێشەوا (عەلی)ەوە دەگێڕێتەوە، وەفدێك لە (بەنو نەهد)ەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر و گوتیان ئێمە لە بەرەبابێکین..، ئێمەش گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا تۆمان بینی بە شێوازێك قسەت لەگەڵ دەکردن کە زۆربەیت لێ تێنەدەگەیشتین. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێت) فەرمووی: من خودای گەورە بە باشیی پەروەردەی کردووم و پێیگەیاندووم.

«ونراك تكلم وفود العر بما لا نفهم أكثره؟ فقال: أدبني ربي فأحسن تأديبي وربيت فى بني سعد. فكان رسول الله يخاطب العرب على اختلاف شعوبهم وقبائلهم

---

٤٤٨- رواه أبوداود، برقم: ٤٢٨. والحاكم، برقم: ٧١٧.

وتباين بطونهم وأفخاذهم وفصائلهم يخاطب كلا منهم بما يفهمون ويحادثهم بما يعلمونه»[٤٤٩].

و. هەروەها خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێت) زمانی (فارسی)یشی لە ئاخاوتندا بەکارهێناوە، وەك (ئەبوهورەیرە) ڕیوایەتی کردووە: «مَا هَجَّرْتُ إِلَّا وَجَدْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، قَالَ: فَصَلَّى، ثُمَّ قَالَ: اشِكَمَتْ دَرْدْ. قَالَ: قُلْتُ لَا، قَالَ قُمْ فَصَلِّ فَإِنَّ فِي الصَّلَاةِ شِفَاءً»[٤٥٠].

واتە: پێغەمبەر نوێژی دەکرد، پاشان پێیفەرمووم: ئایا ناوسکت ئێشدەکات؟ منیش گوتم: نەخێر. فەرمووی: هەستە نوێژبکە! چونکە نوێژ چارەسەری تێدایە.

دەستەواژەی (اشکمت دَرد) فارسییە، هەروەك پێشەوا (سندی) دەفەرمووێت: ((هُوَ بِالْفَارِسِيَّةِ بِمَعْنَى أَتَشْتَكِي بَطْنك كَمَا فَسَّرَهُ بَعْض الرُّوَاة))[٤٥١]. واتە: وشەیەکی فارسییە و بە واتای: (ئایا سکت دێشێت) دێت.

س. هەروەها لە ئەم فەرموودە شیرینەدا کە پێشەوا (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە، وشەیەکی دیکەی فارسیی بەکارهێناوە: «عن جابر بن عبد الله رضي الله عنهما قال: قلت يا رسول الله ذبحنا بهيمة لنا وطحنت صاعا من شعير فتعال أنت ونفر فصاح النبي صلى الله عليه و سلم فقال: يا أهل الخندق إن جابرا قد صنع سورا فحي هلا بكم»[٤٥٢].

---

٤٤٩ ـ سبل الهدى والرشاد: ٢/ ٩٣ ـ ٩٤.

٤٥٠ـ رواه ابن ماجه، برقم: ٣٤٥٨. وأحمد، برقم: ٩٠٦٦

٤٥١ـ حاشية السندي على سنن ابن ماجه، محمد بن عبد الهادي السندي: ٦ / ٤٠٧.

٤٥٢ ـ صحيح البخاري، برقم: ٢٩٠٥.

وشەی (سور) لە بنەڕەتدا فارسییە و لێرەدا بە واتای دەعوەتی دێت، هەروەك (بەدرەدینی عەینی) فەرموویەتی: ((وهو الطعام الذي يدعى إليه وقيل الطعام مطلقا وهي لفظة فارسية))[453].

ح. بە هەمان شێوە (کەعبی کوڕی عاصمی ئەشعەری) دەڵێت: لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: لە سەفەردا باشتر وایە بە ڕۆژوو نەبیت. دەربڕینەکەشی جیاوازبوو بە ئەم جۆرە: «لَيْسَ مِنْ امْبِرِّ امْصِيَامُ فِي امْسَفَرِ»[454]. وەك دیارە ئەم شێوەزارە نامۆ و ناباو بووە و تایبەت بووە بە هۆزێکی (یەمەنی)یەوە.

هەروەك پێشەوا (ئیبن ئەسیر) دەفەرموێت: ((هذه الميم بدل من لام التعريف في لغة قوم من اليمن))[455].

هەروەها لە فەرمودەی دیکەدا وشەی (یەمەن)ی بەکارهێناوە، وەك فەرموودەی: «عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: مَهْيَمْ أَوْ مَهْ. قَالَ، قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[456]. وشەی «مَهْيَمْ» لێرەدا وەك زانایان فەرمویانە: یەمەنییە و، بە واتای ئەوە چیتە و وەزعت چۆنە؟ ((مهيم: وهي كلمة يمانية يستفهم بها[457]. معناه ما لك وما شأنك؟))[458].

---

٤٥٣. عمدة القاري: ٢٢/ ١٧٥.

٤٥٤. رواه أحمد، برقم: ٢٣٦٧٩. والشافعي في مسنده، برقم: ٧٥٩.

٤٥٥. جامع الأصول في أحاديث الرسول: مجد الدين أبو السعادات المبارك بن محمد الجزري ابن الأثير، تحقيق: عبد القادر الأرنؤوط: ٦/ ٣٩٦.

٤٥٦. رواه البخاري، برقم: ٦٣٨٦ -بَاب الدُّعَاءِ لِلْمُتَزَوِّجِ.

٤٥٧. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح: ١٦/ ٣٣٧.

٤٥٨. معالم السنن، لأبي سليمان الخطابي: ٢/ ٢٦٨. شرح السنة ـ للإمام البغوى: ٩/ ١٣٤.

له سۆنگەی ئەم بەڵگانەی سەرەوە زانایان گوتوویانە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێت) لەگەڵ هەر هۆزێكدا بە زمانی خۆیان دوواندوونی. هەروەك شەهیدی مینبەر و میحراب (دكتۆر موحەممەد سەعید رەمەزان بوتی) دەڵێت: ((أنه عليه الصلاة والسلام كان يخاطب كل وفد من وفود العرب بما لديهم من الكلمات و اللهجات والتعابير الخاصة بهم .. فلقد كان عليه الصلاة والسلام يخاطب هذه الوفود المختلفة بما اختصوا به من اللغات والأوضاع الغريبة التي لا تعرفها قريش في لغتها، ولا تهتدي إلى معانيها ولا يعرفها بعض العرب عن بعض .. وكان عليه الصلاة والسلام يبعث إلى هذه الوفود بكتب غريبة اللغة واللهجة، يخاطبهم فيها بلحونهم، وبألفاظهم المتداولة عندهم والخاصة بهم مما لم يكن ليأتلف مع طبيعة اللغة القرشية، ومما لم يكن للقرشيين ممارسة له أو دراية به))[٤٥٩].

ئەمەش هەروەك (موستەفا صادق رافیعی) دەڵێت: لە تایبەتمەندیی پێغەمبەرە و خودا خۆی فێریكردووە و پێیبەخشیوە، بۆ ئەوەی كاتێك هۆزە جیاوازەكان دێن بۆ لای، یان بە هەر زمان و شێوەزارێك پرسیاری لێدەكەن پێنەگیرێت و نەوەستێت لە وەڵامدانەوە و كاتێكیش دەچێتە ناو هۆزێكەوە وەك یەكێك لە ئەوان وابێت. ((فليس إلا أن يكون ما خص به النبي صلى الله عليه وسلم من ذلك توفيقا وإلهاما من الله أو ما هذا سبيله مما لا ننفذ في أسبابه ولا نقضي فيه بالظن. فقد علمه الله من أشياء كثيرة ما لم يكن يعلم حتى لا يعيا بقوم إن وردوا عليه ولا يحصر إن سألوه، ولا يكونَ في قوم إلا منهم، لتكون الحجة أظهر، والبرهان على رسالته أوضح، وليعلم أن ذلك له خاصة من دون العرب))[٤٦٠].

---

٤٥٩ ـ في الحديث الشريف والبلاغة النبوية: ٥٣ ـ ٥٤.

٤٦٠ ـ تأريخ آداب العرب: مصطفى صادق الرافعي: ٢/ ٢٩٨. نقلا عن/ في الحديث الشريف والبلاغة النبوية: ٥٧.

